# کوردی سووریا

## بوونێکی نکوڵی لێکراو

نووسینی
هێریەت مۆنتگومری

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە
مینە و پێشەوا

مەڵبەندی کوردۆلۆجی

هەرێمی کوردستان
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
مەڵبەندی کوردۆلۆجی

ناوی کتێب: کوردی سووریا _ بوونێکی نکوڵی لێکراو
نووسینی: هیێریەت مۆنتگومری
وەرگێڕانی: ١) محەمەد ئەمین حسین عەلی (مینە)
٢) پێشەوا عەبدولخالق محەمەد
پیتچنین: ریژین عوسمان ئەحمەد
دیزاین: مینە.
بەرگ: رەنج شوکری.
سەرپەرشتیاری چاپ: بریار فرج
چاپخانەی رەنج/ چاپی یەکەم/ سلێمانی
ژمارەی سپاردن: ١٤٣٤/ ساڵی ٢٠٠٩
تیراژ: ١٠٠٠ دانە.
نرخ: ٣٠٠٠ دینار
زنجیرە: ٣٥

مەڵبەندی کوردۆلۆجی
ناونیشان: سلێمانی، گردی ئەندازیاران – گەڕەك/١٠٥، کۆڵان/٢٥، ژ. خانوو/٤، پۆست/٩٥
تەلەفۆن: ٣١٩٣٠٩٣
www.kurdology.com
kteb@kurdology.com

# پێرست

## وتەیەك

وەکو بەشێك لە کارەکانی بەرشەلۆنە، یەکێتی ئەورووپا و سووریا لەسەرەتاوە رێکەوتننامەی رێکخراوەکەیان واژۆکرد، کە ئێستا لە ئەنجومەنی ئەورووپیدا چاوەڕێی دوا بڕیارە. هەر وەکو رێکەوتنەکانی تر لە کارەکانی دامەزراوەی جاڕنامەی بەرشەلۆنە، ئەمیش دیسان تیشکۆ دەخاتە سەر ناوچەکانی هەرەوەزی ئابووری، بەڵام وەك نموونەکان لە جیهانی عەرەبییەوە بۆ رووسیا و چین، تا رادەیەکی زۆر گەواهین بۆ ئەوەی، کە کردنەوەی بازاڕەکان و گەشەسەندنی ئابووری نابێتە هۆی چاکردنی باری دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ. لە کاتێکدا کە بارودۆخی کەمایەتییە کوردییەکە لە تورکیا بە هێواشی بەرەو باشی دەچێت (لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیا نییە لە جێبەجێکردنی چاکسازی ئەوەی پەیوەندە بە ئەگەری چوونە ناو یەکێتی ئەورووپاوە) هەروەها کوردەکانی عێراقیش وەك هێزێکی سیاسی دووەم، لە یەکەم هەڵبژاردنی سەربەخۆی عێراقدا دەرکەوتن، باری ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتیی کەمایەتییە کوردەکەی سووریا تەنانەت لە ٢٠٠٥ بەردەوامە لە سەرکوتکاری و جیاوازی لە کەمترین مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ. گوشار لەسەر دانیشتوانی کورد لە زیادبووندایە، بە تایبەتی لە ئەنجامی خۆپیشاندانەکانی کورد دژی سیاسەتی حکومەت، کە لە باکووری وڵاتدا روویدا، هەروەها لە حەڵەب و دیمەشقیش، لە ئازاری ٢٠٠٤دا ژمارەیەکی زۆر زیندانی لە زیندانەکانی سووریادا لە ئەنجامی ئازار و ئەشکەنجەدا مردن و نزیکە ٢٠٠ کەسێك بەهۆی ئەوەی پەیوەندیان بە خۆپیشاندانەکەوە کردووە، هێشا لە زینداندا ماون، لەگەڵ ئەوەی کە هیچ تۆمەتێکی رەسمی لە دژی زۆربەیان دەرنەکراوە. ئەم کتێبە زانیاری لەبارەی ئەو چەوساندنەوانەی پێشێل کردنی مافەکانی مرۆڤ دژی کوردەکانی سووریا پێشکەش دەکات و جیایاندەکاتەوە و بەپێی رابردووی سیستمی سووریا و پەرەسەندنی لە جەنگی جیهانی یەکەمدا رێکیان دەخات. بەشێك لە هەوڵەکە لە مەڵبەندی ئەورووپی بۆ لێکۆڵینەوەی کوردی و کۆمەڵەی کوردەکانی سووریا لە بەرلین دەستی

پێکردوه، ئەویش بە مەبەستی پێشخستنی دیمۆکراسی و ڕێزگرتنی مافی مرۆڤ، وەك سیمای سەرەکی لە پەیوەندیە سیاسیەکانی ئەورووپی لەگەڵ سووریادا، بڕیارێکی ئاشتیانە لەبارەی مەسەلەی کوردەوە، توخمێکی تەواوی ئەو هەوڵەیە، چونکە ئەو شێوازەی مامەڵەی لەگەڵ کەمایەتییە ڕەگەزیی و ئاینییەکان پێدەکرێت، تەنیا سیمایەکی پەراوێزخراو نییە لە سیاسەتەکەی، بەڵکو هێمایەکی ناوەندییە بۆ یەکسانی کۆمەڵگەی شارستانی. ئاسوودەیی بە مانای بەهێزکردنی پێکهاتەی ئەو دیکتاتۆرییەی کە هەیە، لەوانەیە ببێتە ئامانجێکی شەرعی خێزانێکی نەتەوەکان، کە خۆی وەك کۆمەڵگەیەکی بەنرخ لەناو شتەکانی تردا دەبینێتەوە.

## نەخشەی ناوچە کوردییەکان لە سووریا



# پێشەکی

مەسەلەی کورد، پرسیارێکە لەبارەی مافەکانی کۆمەڵێکی زیاد لە سی(۳۰) ملیۆن کەس، کە لەو بڕوایەدان بەم زووانە ببنە سێیەمین کۆمەڵی گەورە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. کورد گەورەترین نەتەوەی بێ نیشتمانن لە جیهاندا، کە خەڵکەکەی و خاکەکەی ناوچەیەکی جۆگرافیایی هاوسنووری بەشکراو پێکدەهێنن لە نێوان تورکیا و عێراق و ئێران و سووریا، هەروەها بە ژمارەی کەمتریش لە ئازربیجان و ئەرمینیا.

مەسەلەی کورد بەشێوەیەکی فراوان باسی لێوە نەکراوە، یان لەبارەیەوە نەنووسراوە، هەروەها ئەو لێکۆڵینەوانەی کە هەیە زیاتر لەبارەی کوردی تورکیا و عێراقەوە قوڵبۆتەوە. کێشەی کوردی ئەو دوو وڵاتە تا رادەیەك بڵاوە، ئەوەش بەهۆی ژمارەی ئەو کەسانەی پێوەی سەرقاڵن، ئاستی ئەو کردەوە دڕندانەیەی دژیان کراوە، ناچاربوونیان بۆ خەباتی چەکداری و دەستێوەردانی نێودەوڵەتی لە دیاری کردنی داهاتووی سیاسی بۆ عێراق و ئاستی تورکیا لە ناو یەکێتی ئەورووپادا.

بارودۆخەکە لە ئێرانیشدا سەرنجێکی سادە و ساکاری راکێشاوە، بەڵام ئەو سەرنجە تەنانەت بە پلەیەکی کەمتر دەدرێ بە کوردەکانی سووریا، کە ددان پیانراوە، هەروەها بە کردەوە بێدەنگە لە زووربەی لێکۆڵینەوەکانی کورد و سووریاش. ئەم بێدەنگییە بەلایەنی کەمەوە بەشێکی بەهۆی گرانی دەستکەوتنی زانیاری لەسەر بابەتەکە. لە بەراوردا بەو وڵاتانەی تر کە دانیشتوانی کوردیان هەیە، بە گوێرەی

ژمارەیانەوە لە سووریادا کەمە، بۆیە دانیشتوانەکەی کەم بایەخ کردووە بۆ توێژینەوەی مەسەلەکانی کورد. بە هەرحاڵ کورد زیاد لە ١٠٪ دانیشتوانی سووریا پێکدەهێنێ.

لەگەڵ ئەوەی پێکهێنانی ئەو بەشە گەورەیە لە کۆمەڵدا، لەگەڵ زمانی جیاواز، کولتوور و ناسنامەی رەگەزایەتی، کەچی دەوڵەتی سووری وەك هاووڵاتییەك یان کەمایەتییەکی قەومی دانی پیادا نەناون. تا ئەمڕۆش، ناسنامەی کوردی لە دەوڵەتی سووریدا جێگیر نەبووە، بگرە بارودۆخی کوردەکان وەك هەڕەشەیەك لەسەر ئاسایشی خۆی دەبینێ. کەمایەتی کورد لە سووریا دەچەوسێنەوە، سەرکوتکردن و پەراوێزنان بۆ ئاستی شوناسی نەتەوایەتی، وەك زمان و داب و نەرێت و کولتوور نایاساییە و مانای سیاسی دەدرێتێ. لە هەوڵدانەکانیاندا بۆ دەست بەسەراگرتن و سنوور بۆ دانانی ناسنامە کوردی و کۆمەڵگاکان، سیاسەتی رژێم بەرامبەر کورد بریتییە لە هێزی بەرەنگاربوونەوە، کۆمەڵایەتی- ئابووری و سیاسەتی پەراوێزخستن و جۆرەها ئاڵۆزی لە هەڵبژاردن و سیاسەتی پەرتکە و زاڵبە.

ئەم کتێبە هەوڵ دەدا ئەو بۆشایی لێکۆڵینەوەیە پڕبکاتەوە، کە مامەڵە لەگەڵ کوردی سووریا دەکات و بۆ وەسفکردنێکی تەواو چڕوپڕ لە گێژاوی کوردی لە سووریا. سەرچاوەی لە توێژینەوە بنەڕەتییەکەوە وەرگرتووە کە لەلایەن نووسەری ئەم کتێبەوە مەسەلەکان و پەیوەندییە نێودەوڵەتی و هەرێمی و نیشتمانییە کوردییەکان و سووریا و کوردی سووریا ئاوێتە دەکات. زۆربەی توێژینەوەکانی ئەم کتێبە لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٢- ٢٠٠٤ لە دەرەوەی سووریا کراوە، ئەوەش لەبەرئەوەی حکومەت رێگە نادات بە کەس، یان رێکخراوەکان، تا بچنە سووریاوە بۆ کاروباری توێژینەوە، یان بۆ دۆزینەوەی راستییەکان لەبارەی کوردەوە.

بە هەرحاڵ، بەشێکی گرنگ لە کاری لێکۆڵینەوەکە و چاوپێکەوتنێکی زۆر لەگەڵ کوردەکان لە ناوچە کوردییەکان لە سووریا و دەرەوەدا، کە لەلایەن نووسەرەوە لە ٢٠٠٢دا لە سووریا کراوە. بۆیە ئەم کتێبە پڕە لە دیدار و چاوپێکەوتنی فراوان لەگەڵ بەرپرسانی کورد و نا-کورد و تاکەکانی لە هەردوولای سووریا و ئاوارەکانی تاراوگە، کە پێکەوە وێنەی توخمی ناوەند لەبارەی بابەتەکەوە دەکێشن، کتێبی ئینگلیزی و

عەرەبی و کوردی بەکاردەهێنن و وتار و بەڵگەکان کە هێشتا زمانەکەی وەرنەگێڕدراوە یان لە بازاری رۆژئاواییدا بلاونەبۆتەوە. تیشکۆی سەرەکیی ئەم کتێبە مەسەلەی مافی مرۆڤە کە تایبەتە بە کوردی سووریاوە.

بەڵام لە جیاتی پێشاندانی ئێسقانی رووت بەسەر زۆریی پێشێلکاریی مافی مرۆڤ لە سووریادا، کتێبەکە مەسەلەی کورد لە سووریا دەخاتە ئاستێکەوە و هەندێ روونکردنەوەی بۆ برەوپێدانی هەیە. بەڵگە و شیکردنەوەی هەیە بۆ چارەسەری ئەو کێشەیەی کە کوردی دانیشتوانی ولاتی سووریا بە درێژایی مێژووی خۆی پێوەی دەتلێتەوە، لە ئاستەنگی هەرێمی و چوارچێوەی کاری یاسای مافەکانی مرۆڤی جیهانی. ئەو مامەڵە لەگەڵ ئەو پرسە زۆرانەی مرۆڤناسیدا ناکات، کە دەوری ناساندنی رەگەز و ناسنامەی نیشتمانی یان مێژوویی نەتەوەی کوردی داوە، ئەوەش پێش دابەشکردنی کوردستان لە سەرەتای سەدەی بیستا یان تایبەت بە ناسنامەی کوردەوە. بەشی گرنگ و شارەزایی پەیکەری لێکۆلینەوەکە لەم بابەتانەدا دەردەکەوێت. بە پێی ئەوە ئەم کتێبە دابەش دەکرێت بە سێ بەشەوە، کە مامەڵە لەگەڵ:

١. مادەی مێژوویی و بنچینە و بارودۆخ.
٢. وردەکاری سەرکوتکاری دژی کورد لە سووریا و پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لەلایەن دەولەتەوە.
٣. کێشەی کورد لە دەولەتە دراوسێکانی دەولەتی سووریا و پەیوەندییان لە نێوان دەولەتی جیاواز و لایەنی نا- دەولەتی کاریگەرییان لەبارەی مەسەلەی کورد لە سووریادا هەیە. مادەی مێژوویی و زەمینەکەی لە بەشی یەکەمدا زانیاری لەبارەی دابەشکردنی کوردستانەوە لەخۆگرتووە. گەشەکردنی مێژوویی پەیوەندی عەرەبی- کوردی لە سووریا و سروشتی دەولەتی سووریا خۆی.

بەشی دووەم دەڕوانێتە بەعەرەبکردنی ناوچە کوردییەکانی سووریا و ئەو هەولانەی بەزۆر کورد دەلکێنێت بە دەولەتی عەرەبییەوە. هەروەها ئەم بەشە زانیاری لەبارەی هەڵبژاردنی (حەسەکە) لە ١٩٦٢ و ئەنجامەکانی پێشکەش دەکات، چاکسازی

کشتوکاڵی لە ناوچە کوردییەکان، سەرکوتکاری کولتووری دژی کورد، پەراوێزخستنی
ئابووری و بەدەری لە سیاسەت. بەشی کۆتایی (بەشی سێیەم) مەسەلەی کوردی
سووریا دەخاتە میانەی ناوچەییەوە و سوورە لەسەر ئاڵۆزی مەسەلەی کورد.

لە پەیوەندی سنووری نێوان سووریا لەگەڵ تورکیا و عێراق دەکۆڵێتەوە و ئە
ڕێگایانەی کاریگەری هەیە لەسەر واقعی سیاسی لە جوڵانەوەی فراوانی سیاسی کور
لە سووریا، لەبارەی کێشەی کورد لە سووریادا. ئەو نموونانەی لەم کتێبەدا بەکارهاتوو
مەبەستی وێناکردنی شێوەکانی جیاوازییە، کە کورد لە سووریادا دووچاری دەبێت
سروشتی سەرکوتکارییەکانی مافی مرۆڤ، لە جیاتی ئەوە ئامارێکی فراوان بدرێ ب
مێژووی چەوسانەوەی کورد.

هەروەها یەکێ لە ئامانجەکانی ئەم کتێبە پێشکەشکردنی زانیاری و ئامارێک
فراوانە لەبارەی کێشەی کوردەوە لە سووریا، کە لەم کاتەدا بەردەست دەکەوێت، درێژ
بابەتەکانی نێو کتێبەکە و بارودۆخی دەوڵەتی سووریا، ڕێگر بوون لەوەی بە تەواو
قوڵبینەوە لە بابەتەکان و دۆکیمەنتەکان. تەمەنای ئەوە دەکرێ کە ئەم ڕاپۆرت
لێکۆڵینەوەی تری بەدوادا بێت و دەمەتەقێی مەسەلەکان کە هاوبەشە لە هەردو
مەسەلەی کورددا کە یەکەمیان لە دەوڵەتی سووریا و دووەمیان وەك کێشەیەک
نەتەوەیی فراوان ناسراوە.

## باسی یەکەم
## دابەشکردنی کوردستان

کوردستان بەو ناوچە جیۆگرافیاییە دەوترێت کە کورد زۆرینەی پێکدەهێنێت. هەرچەندە ئەمە دەوڵەتێکی سەربەخۆ نییە و لە سەرەتای دابەشبوونیەوە بەلای زۆربەی کوردەوە، خاکێکی داگیرکراوە. هەرێمی کوردستان سنوورێکی جێگیری نییە و لە نێوان رێکخراو و گروپ و تاکەکاندا بە جیاوازییەوە باسی لێوەدەکەن و بە دیدێکی سیاسییانەوە رەچاو دەکرێت. سەرەڕای ئەوەش، کوردستان ناوچەیەکی جیاو دانپێدانراوە و بڕبڕەی پشتی ئەمەش بە زنجیرە چیاکانی زاگرۆس و تۆرۆسەوە بەستراوەتەوە، کە بەرەو باشوور درێژ دەبێتەوە بۆ دەشتەکانی میسۆپۆتامیا و بەرەو باکووریش بۆ ئەو ناوچانەی کە کاتی خۆی ئەنادۆلیای ئەرمینیا بوون[1].

دوابەدوای شەڕی چالدێران، کە لە سەدەی ١٦دا لە نێوان هەردوو ئیمپراتۆریای عوسمانی و ئێراندا روویدا، ناوچەکە لە نێوان ئەو دوو ئیمپراتۆریایەدا دابەشکرا. ئەم بەشە تیشک دەخاتە سەر دابەشبوونی دووەمی کوردستان، کاتێ ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی ئیمپراتۆریای لە پەلوپۆکەوتووی عوسمانی بەسەر هێزە ئیمپریالیستەکانی ئەو کاتەدا و لەدوای جەنگی جیهانیی یەکەم دابەشکرا.

ئەم جارەیان کوردستان لە نێوان ئەوانەدا دابەشکرا، کە پێی بوونە دەوڵەتی مۆدرێن و خاوەن سەروەری، لەوانەش: ئێران، تورکیا، سووریا و عێراق و یەکێتی سۆڤیەتی ئەو کاتە.

---

[1] کرك ١٩٩٥

## گەمە مەزنەکە

لەگەڵ دەسپێکردنی سەدەی بیستەمدا، هێزەکانی ناسیۆنالیزم و ئیمپریالیزم، دەستیان گرت بەسەر زۆربەی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریای عوسمانییاندا. ئەو ناوچانەش کەمابوونەوە لەلایەن (تورکە لاوە) ناسیۆنالیستەکانەوە بەڕێوەدەبران، کە لە ساڵی ١٩٠٨ دا شۆڕشێکی سەرکەوتوویان دژی سوڵتان عەبدولحەمید بەرپاکرد.

لە ساڵی ١٩٠٩دا سوڵتان عەبدولحەمید لە کار لابراو محەمەدی برای جێگەی گرتەوە، کە وەك کەسێك، زۆر سەرسام بوو بە توانایی هێزی سەربازیی ئەڵمانیا. ئەوە بوو، لە ٣٠/تەمموز/١٩١٤دا سوڵتان لەگەڵ ئەڵمانیادا گەیشتن بە ڕێکەوتنێك، سێ مانگ دوای ئەوەش تورکیا چووە جەنگی یەکەمی جیهانییەوە. هەمان جەنگ ئەمریکا و هێزە ئیمپریالیستەکانی ئەوروپا و رووسیاشی پەلکێش کرد بۆ ئەو ململانێیی دەسەڵاتەی لە ناوچەکانی ژێر دەستەڵاتی عوسمانی و بە هۆی هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریاکەیەوە دروست بووبوو. بەلای زۆربەی کوردەوە پەیماننامەی سایکس _ پیکۆ، لە مایسی/١٩١٦دا، ساتێکی دیار و بەرچاوە لە مێژووی کورددا، کە ئەنجامەکانی ڕێگەی لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی خاوەن سەروەریی کوردستان گرتووە و هەر ئەوەش بۆتە بناغەی کێشەکانی ئێستای کورد. ئەم ڕێکەوتنە قۆناغی دابەشکردنی کوردستانی بەشێوەیەك دارشت، کە لە بەرژەوەندی رۆژئاوا بێت، بەرژەوەندیەك کە نکوڵی لە مافی چارەی خۆنووسینی کورد دەکرد، ئەمەش وەك بەڵێن لە گفتوگۆ و ڕێکەوتنەکاندا پێیان درابوو. لە مانگی ئایاری ١٩١٦دا، هەریەك لە (مارك سایکس) و (جۆرج پیکۆ) وەك نوێنەرانی بریتانیا و فەرەنسا کۆبونەوەیەکی نهێنییان ئەنجام دا و تێیدا دابەشکردنی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریای عوسمانیی لاواز بوو، گفتوگۆ و ڕەزامەندی لە بارەوە کرا. بەپێی ڕێکەوتنەکە، بەشی زۆری ناوچەکانی ئەنادۆلیا دەبوو لە ژێر کۆنترۆڵی تورکیا و رووسیا بهێنرێتە دەرەوە، هەروەها ئیتاڵیا و یۆنان بە هەندێك ناوچەی نوێ پاداشت بکرێن، ئەوەش لە پای هاوکاریکردنیان لەگەڵ هێزە هاوپەیمانەکان لە کاتی جەنگدا،

لەوەش زیاتر، ڕێکەوتن لەسەر ئەوەوە کرا، کە لە سنووری کاریگەری فەرەنسادا، دەوڵەتێکی عەرەبی (سووریا) دابمەزرێت و لەلایەن مەلیك فەیسەڵەوە بەڕێوەببرێت، ئەو مەلیکەی کە هەر فەرەنسییەکان خۆیان لە ساڵی ١٩٢٠ لە پێناو بوونی کاریگەری ڕاستەوخۆی فەرەنسا بەسەر ناوچەکەوە، لە کاریان خست.[٢] دوابەدوای شۆڕشی بەلشەڤیکەکان لە ساڵی١٩١٧دا، دابەشکردنی دەسەڵات گۆڕانی بەسەردا هات. بەلشەڤیکەکان دژی بڕیارەکانی سایکس _ پیکۆ وەستانەوە، بەوەی دەیانووت بڕیارەکان شێوازێکی ئیمپریالیستیانەی هەبووە و بەشێکی وردەکاری پەیمانەکەش ئاشکرابوو بوو.

وەك هەوڵێکیش بۆ چارەسەرکردنی ئەو زیانانەی کە لە کشانەوەی ڕووسیا لە پەیماننامەکە کەوتەوە، ناوچەکانی (کۆساك )، قەوقاس، ئەرمینیا و جۆرجیا و ئەو ناوچانەی کوردستان، کە پێشتر لەژێر کۆنترۆڵی ڕووسیادا بوون، خرانە سەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی بریتانیا.[٣] پەیمانەکە، ناوچە کوردییەکانی بەسەر چەند یەکەیەکی کۆنترۆڵدا دابەشکرد و کورد و کوردستانیشی بەپێی بەرژەوەندیەکانی هاوپەیمانان لە هەریەکە لە سووریا و میسۆپۆتامیا دابەشکرد و ڕێکخرا. لە هەوڵێکدا بۆ سەقامگیرکردنی ئاشتی بە بیانووی ئاکار و بەرەو کۆتایی پێهێنان بە جەنگی جیهانیی یەکەم، ئەمریکا بوو بە پاڵەوانی بەخشینی مافی ئۆتۆنۆمی و چارەی خۆنووسین بۆ هەموو نەتەوەکانی جیهان. لە میانەی وتەیەکی (ودرۆو ولسن) سەرۆکی ئەمریکای ئەو کاتە، ١٤ خاڵی بۆ ئاشتی جیهان خستە ڕوو، لە ٨/١/ ١٩١٨دا ولسن باری سەرنج و دیدی خۆی بۆ ئەوجیهانە دەربڕی، کە لە پاشماوەکانی جەنگ پێکهاتبوو. بە پشتبەستن بە پەیامێکی ئاینی و بەئاگا لە دڕندەیی تورکیا بەرامبەر مەسیحییەکان، ڤلسن هەر لە سەرەتادا پێشنیاری ئەوەی کرد، کە تورکیا لەرووی نەخشە بسڕێتەوە،[٤] خاڵی دوانزەیەم، کە لە خوارەوە دەقەکەی نووسراوە، بەئاشکرا دیدو بۆچوونی خۆی بەرامبەر بە گروپە نەتەوەییەکانی نێو ئیمپراتۆریای عوسمانی دەردەبڕێت:

[٢] سەیڤلبەرگ و هاجۆ ٢٠٠٤: ٢.
[٣] ماکلۆوەڵ ٢٠٠٠: ١١٥.
[٤] فۆمکین ١٩٨٩: ٢٥٨.

" بەشی تورکیا لە ئیمپراتۆریای عوسمانی ئێستادا، پێویستە دڵنیا بێت لە مسۆگەرکردنی سەروەری خۆی، بەڵام ئەو نەتەوانەی تر، کە ئێستا لەژێر کۆنترۆڵی حوکمی تورکیدان، دەبێ دڵنیا و دوور لە هەموو گومانێك ژیانیان مسۆگەر بێت و هەلی پێشکەوتنی ئۆتۆنۆمییان بە دڵنیاییەوە بۆ دەستەبەر بکرێت."[٥]

چواردە خاڵەکەی ولسن، کە لەلایەن هێزەکانی هاوپەیمانانەوە ڕەتکرایەوە، بۆیە بووە ڕاگەیاندنێکی یەکلایەنەی ئەمریکا لە جیاتی ئەوەی ببێتە سیاسەتی ڕەسمی هاوپەیمانان[٦].

بەو جۆرە، پێنەدەچوو هێزەکانی تورکیا دەستبەرداری هیچ بەشێکی ئەو ناوچانە نەبن، کە کاریگەری تورکیایان لە سەر بنەمای وتەکانی ولسن کەم کردبووەوە.

لە دوایەمین دابەشکاریی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، دوابەدوای جەنگی جیهانی یەکەم، بەرژەوەندی زلهێزەکان بە پێی بەندەکانی پەیماننامەی سایکس _ پیکۆ دیاری دەکران و هەرئەوەش سەرۆکایەتی گەل و نەتەوەکانی ناوچەکەی دەکرد. زلهێزەکان دەیانویست نەخشەی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بگۆڕن و ئیمپراتۆریای پێشوی عوسمانیش بەسەر سەرکەوتووەکاندا دابەشبکەن.

ئەوەندەی تورکەکان بۆیان کرابێت، پاراستنی ناوچەکان، بوو بە ئامانجی سەرەکییان و نرخی لە دەستدانی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان مەحاڵ و نەویستراو بوو. پیاوانی عوسمانی توانیان ڕێگری لە کورد بکەن و نەهێڵن مەسەلەیەکی هاوبەشیان لەگەڵ ئەرمەنییەکاندا هەبێت، کە هێزەکانی هاوپەیمان سۆزێکی تایبەتییان بۆیان هەبوو. ئەمەش بەو پێیەی ئەوان هاوکاری براوەکانی هاوپەیمانانیان دەکردو داواکاری کۆمەڵگەی کوردیشیان بە شێوەیەکی ستراتیجی فەرامۆش دەکرد.

ڕێکەوتننامەی سایکس _ پیکۆ لە بنەڕەتدا ویلایەتی موسڵی بۆ تورکەکان دانابوو تا کۆنترۆڵی بکەن.[٧] لە ساڵی ١٩١٨دا و کاتێك بەرژەوەندیەکانی بریتانیا لە ناوچەکەدا گۆڕانیان بەسەرداهات و موسڵیش بوو بە جێگای بایەخ پێدان، بەو پێیەی دەیتوانی بە شێوەیەکی بەرچاو داهاتووی بەهای سیاسی و ئابووریی میسۆپۆتامیا

---

[٥] گەواهیی ماکدۆوەڵ ٢٠٠٠: ١١٥.

[٦] فۆمکین ١٩٨٩: ٢٥٨.

[٧] ولایەتی موسڵ ناوچەیەك بوو لە باکووری عێراق لەبارەی سنووری تورکیا.

باشتر بکات، بۆ ئەوەش بریتانیا دەیویست جارێکی تر بەندەکانی رێکەوتنامەکە دیاری بکرێتەوە. گفتوگۆی نێوان فرەنسا و بریتانیا لە بارەی ئەگەر و باری کوردستانێکی ئۆتۆنۆمی بە دوای ئەوەدا هات[8]. لە دەوروبەری هەمان کاتدا عەشیرەتە کوردەکان بەئاگا لە سوربوونی رێکەوتننامەی سایکس _ پیکۆ و ترس لە فەرمانڕەوایی تورك و عەرەب و دابەشکردنی خاکی کوردستان لە نێوان دەسەلاتە ئیمپریالیستەکاندا، دەستیان کرد بە رێکخستنەوەی خۆیان لە رووی سیاسی و ئەنجامدانی گفتوگۆ لەگەڵ هەموو ئەو هێز و دەسەلاتە جیاوازانەی کە پەیوەندیان بە دیاریکردنی داهاتووی ناوچەکەوە هەبوو. چەندین رای جیاواز لە نێو کوردەکاندا دەرکەوت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هەندێك لەوان پشتگیری هێزەکانی رۆژئاوا بوون و هەندێکیان هەواداری تورکیا بوون و هەندێکی تریشیان بەرگریان لە سەربەخۆییەکی تەواو بۆ کوردستان دەکرد.لە نێو ئەوانەشدا هەندێك کورد هەبوون ئەوەیان پەسەند دەکرد، کە خۆیان بە هیچ بۆچوون و روانگەیەکەوە پابەند نەکەن.[9] لە هەمان کاتدا زیادبوونی دەسەلاتی مستەفا کەمال ئەتاتورك لە تورکیا و داواکانی ئەو بۆ تورکیایەکی سەربەخۆ و ئەو ئایدۆلۆجیەی، کە داوای گێڕانەوەی ناوچەکانی دەکرد و گفتوگۆکانیشی لەگەڵ بەلشەڤیکەکان وایکرد، کە خەمێکی نوێ بدات بە بریتانییەکان لە بارەی ناوچەکانی باکووری ویلایەتی موسڵ و پارێزگاری کردنی بەرژەوەندیەکانیان لە میسۆپۆتامیا.[10] بوونی ناوچەیەکی بێلایەن لە نێوان رووبەری کۆنترۆڵی تورکیا و بریتانییەکان، بووە هۆی پێویستی دروسبوونی دەوڵەتی ئەرمینیا و کورد، ئەویش بۆ زیادکردنی بەرژەوەندییە ستراتیجییەکانی بریتانیا. لە مانگی تشرینی دووەمی ١٩١٩دا بریتانیا بە جیا نوێنەری نارد بۆ ئیمزاکردنی بەیاننامەی سۆلیدارێتی کوردی _ ئەرمینی دژی گەڕانەوەیان بۆ ژێر فەرمانڕەوای تورکیا.[11] بە کشانەوەی ئەمریکا لە ناوچەکە، پشتگیریشیان بۆ دەوڵەتێکی سەربەخۆی ئەرمینی بەرەو نەمان چوو، هەروەك کێشەی ئەنادۆڵیاش بە شێوەیەکی سەرەکی بەسەر بریتانیا و فرەنسادا بەجێما.

---

[8] ماکدۆوەڵ ١٩٩٦: ١١٧-١١٨.

[9] ماکدۆوەڵ ١٩٩٦: ١٢٩.

[10] ماکدۆوەڵ ١٩٩٦: ١٣٠.

[11] ماکدۆوەڵ ١٩٩٦: ١٣١.

لە کۆنفرانسێك، کە لە بەهاری ١٩٢٠ لە سانرێمۆ بەسترا، سنوورەکانی کۆنترۆڵی بریتانیا و فەرەنسا کۆتایی پێهات و دواتریش لە پەیماننامەیەکدا کە لە ١٠/ئاب/١٩٢٠، لە سیڤەر ئیمزاکرا. پەیماننامەی سیڤەر، کە بە شێوەیەکی کاریگەریانە پەیماننامەیەکی ئاشتی بوو لە نێوان هێزە هاوپەیمانەکان و تورکیادا. لە ساڵی ١٩٢٠دا واژۆ کرابوو، کە بەشێوەیەکی بەرچاو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سوڵتانەکانی دەوڵەتی عوسمانی کەمکردەوە، کە لاواز بووبوو لە پشتبەستن بە هێزە ئەورووپییەکان بۆ بازرگانی و مەسەلەی دارایی، بەکارهێنان و گەڕانەوە بۆ پەیماننامەکە، کە نوێنەرانی کورد و عوسمانی لایەنی بوون، راشکاوانە ناوچەیەکی بەناوی کوردەکانەوە ناونا، کە ئێستا باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا و بەشێکی باکووری عێراقە. هەرئەوەش بەرەو باکوور بۆ لای سنووری دەوڵەتی سەربەخۆی ئەرمینیای چاوەڕوانکراو بۆ باشووریش بەرەو سنووری جەزیرەی سووریا درێژ دەبۆوە.[12] پەیماننامەکە لە نێو سنووری ناوچەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا پێداویستییەکانی هەموو کەمایەتییە ئاینی و نەژادییەکانی ئامادە کردبوو. بەندەکانی ٦٢-٦٤ بە تایبەتی باسی کورد و کوردستانی دەکرد، شێوەیەك جەختی لەوە دەکردەوە، کە پێویستە هەرێمی کوردستان خاوەنی ئۆتۆنۆمی ناوخۆ بێت و مافی سەربەخۆیی هەبێت، کە بڕیار بوو لە دوای ساڵێك بەسەر ئیمزاکردنی پەیماننامەکەدا و ئەنجامدانی ریفراندۆمێك لە لایەن کۆمەڵەی گەلانەوە ئەو سەربەخۆییە بە کورد بدرێت.

پەیماننامەکە بۆ دەوڵەتی تورکیا جەرگبڕ بوو، کە لە لایەن (تورکە لاوەکان) و (کۆمیتەی یەکێتی و پێشکەوتن) چاوەڕوان دەکرا، هەروەك ئەوە لەسەر حسابی ناوچە تورکییەکان بوو، کە هەرگیز مستەفا کەمال وەك سەرکردەی بزوتنەوەی بەرهەڵستکاری ناسیۆنالیست پەسەندی نەدەکرد. هەروەها لەسەر دەستی زلهێزەکان لە سیڤەردا دووچاری بێدەسەڵاتی بوون، تورکیا رووبەرووی هەردوو هێرشی دەرەکی بووەوە، یەکەم لە یۆنان و پاشان ئاژاوەکانی ناوخۆش بەتایبەتی لە ناوچە کوردی و ئەرمینییەکاندا. جەنگی سەربەخۆیی تورکیا لە ماوەی ساڵانی (١٩٢٠-١٩٢٢) هاوسەنگیی هێزی نێوان دەوڵەتی تورکیا و بریتانیای گۆڕی، هەروەها تورکیای

[12] لەو قۆناغەدا سنووری سووریا بە رەسمی دیاری نەکرابوو.

ئەتاتورکی وەك هەڕەشەیەکی بەهێز ناساند بۆ سەر بەرژەوەندیەکانی بریتانیا لە تورکیا و ئەودیوتریشی.

پەیماننامەی سیڤەر بەرلەوەی مەرەکەبەکەی وشك بێتەوە، شکستی هێنا. جەنگی سەربەخۆیی تورکیا دەستی پێکردو تورکەکان لە باشوورەوە دەستیان گرتەوە بەسەر داگیرکەری یۆنانیدا و هێزەکانیان جارێکی تر لە ناوچەکانی ئەرمینیەکان و کوردەکاندا جێگیر کردەوە و بەرەو پێشەوەش چوون، تا گەیشتنە ویلایەتی موسڵی ژێر کۆنترۆڵی بریتانیا و لەوێ بنکەیەکی سەربازییان لە رەواندز دامەزراند. بە سەرکەوتنی هێزەکانی ئەتاتورکیش بەسەر رژێمە کۆنەکەدا و گەڕانەوەی ناوچەکان و راگەیاندنی کۆماری تورکیا لە ساڵی (١٩٢٣)دا، تورکیا هەڕەشەی بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی فەرەنسا لە سووریا و بەرژەوەندییەکانی بریتانیا لە میسۆپۆتامیا و ویلایەتی موسڵ دروستکرد. فەرەنسا و تورکیا لە دیری رۆژئاوای رووباری فوراتەوە بۆ دابەشکردنی ناوچەکانی عوسمانی خەریکی جەنگێکی رانەگەیەنراو بوون. تورکیا ئەوەی رەتکردەوە کە دەستبەرداری ناوچەکانی هێڵی شەمەندەفەری بەغداد بێت، کە رێی هاتوچۆی ئەو ویلایەتانەی مسۆگەر دەکرد، کە کوردی تێدا دەژیا؛ ئەوانیش بە دوای کۆنترۆڵی تورکیادا دەگەڕان. فەرەنسا رازی بوو ئەو ناوچانەی، کە دواتر باکووری سووریا بوون، بکەونە ژێر دەستی تورکیاوە، بە تایبەتی شارەکانی ماردین، ئورفە، عەینتاب، جەزیرەی ئیبنی عومەر. لە هەمان کاتدا فەرەنسا و تورکەکان هەردووکیان هەوڵیان دەدا خێڵە کوردەکانی ناوچەکە بەکاربهێنن و بۆ دەستکەوتنی ناوچەی زیاتر سود لە کێشەو ململانێی نێوانیان وەربگرن.[١٣] سنوورەکان هەتا ساڵی ١٩٢٩ بە تەواوەتی جێگیر نەکران. بریتانییەکان دژی کەمالیستەکان[١٤] و لە پێناو مسۆگەرکردنی موسڵ و سنوورەکانی باکووری عێراق بیریان لە پشتگیری کردنی راپەڕینەکانی کورد دەکردەوە، ئەمەش بە هاندانی یۆنانیەکان و ناسیونالیستە کوردەکان بوو. لە کۆتاییدا رێکەوتن لەگەڵ کەمالیستەکان بە باشتر زانرا، وەك لە پشتگیریکردنی کوردە یاخییەکان، کە سەرکردایەتییەکی ئاشکرایان نەبوو، هەروەها لەوانەشە ببنە هۆی ئاڵۆزییەکی چاوەڕوان

[١٣] سەفەربەلك و حاجز ٢٠٠٤: ٣.

[١٤] لایەنگیرانی مستەفا کەمال ئەتاتورك و وەدووکەوتانی ئەمرۆی بیروباوەری نەتەوەیی تورکی و عەیمەنتی بوونی پارێزەری نەتەوە و باروودۆخەکەیە.

نەکراو.[15] بریتانیا دووچاری دڵەڕاوکە بوو، بە شێوەیەکی سەرەکی لەبەر هۆکاری پارێزگاریکردنی بەرژەوەندیکانی لە میسۆپۆتامیا و ڕێگەگرتن لە تورکەکان بۆ لکاندنی ناوچەکانی موسڵ. بەو جۆرە بریتانیا خۆی لە ئاستێکدا بینیەوە کە وای کردبوو تورەکردنی تورکەکان لە ناوچەکەدا بڕیاردەری بەرژەوەندیەکانی بێت[16]، بۆیە پێویست بوو دووبارە گفتوگۆی ئاشتی لەگەڵ تورکیا دەستپێبکاتەوە. لەبەر ئەوەش دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان و ئەرمینیا ئیدی لای بریتانیا کردەیی نەبوو.[17] ناسیۆنالیستە کوردەکان پەنایان بردە بەر لایەنی پەیماننامەی بریتانی و داوایانکرد کە ڕێز لە مافی ئۆتۆنۆمی کورد بگیرێت. سەرەڕای ئەوەی بریتانیا وەك نەژادێکی خاوەن ئۆتۆنۆمی ئاماژەی بە کورد دەکرد[18] و لەگەڵ ئەوەی کە نارەزاییان بەرامبەر نوێنەرانی بریتانیا دەردەبڕی لە پای بەڵێنەکانیان بۆ مافی چارەی خۆنووسینی کورد لەم ناوچەیەدا، بەو شێوەیەی کە لە ڕێکەوتننامەی سیڤەردا هاتبوو، نوێنەرانی کورد هیچ ڕۆڵێکی فەرمییان لە گفتوگۆکانی دوایدا نەبوو. بەرژەوەندییە ستراتیجییەکانی بریتانیا لە بوونی کوردستانێکی سەربەخۆ یان ئۆتۆنۆمیدا، هاوڕێك نەبوو لەگەڵ دەستکەوتەکانی تورکیا لە جەنگی سەربۆخۆیی تورکیادا. دوابەدوای ئەوەش خۆپیشاندان و نارەزایی کورد بەرامبەر ڕێکەوتنامەکە هاتە بەردەم بەرژەوەندیە ستراتیجی و جیۆ- پۆلیتیکیەکانی بریتانیاوە. دوابەدوای گفتوگۆکان لەگەڵ تورکیا کە لە تشرینی دووەمی/١٩٢٢ دەستی پێکرد، پەیماننامەی لۆزان وەك ڕێکەوتنێکی نوێ لە ٢٤/تەموز/١٩٢٣دا واژۆکرا، کە لە چوارچێوەی دەوڵەتی مۆدێرنی تورکیادا سەروەری ناوچەکانی کوردستانی بەخشی بە تورکیا، هەرچەندە پەیماننامەی لۆزان داوای پاراستنی ژیان و ئازادی بۆ هەموو دانیشتوانی تورکیا دەکات، بەبێ جیاوازی لەدایکبوون، نەتەوایەتی، زمان، نەژاد و ئاین.[19] پەیمانەکە شکستی هێنا، تەنانەت لەوەی ناوی کورد بهێنێت، کە سێیەکی دانیشتوانی تورکیا و نزیکەی نیوەی کوردیان پێکدەهێنا. ئەو ناوچە کوردیانەشی کە مابوونەوە، دواتر لە نێوان بریتانیا و فەرەنسادا

---

[15] ماکدۆوەڵ ٢٠٠٠: ١٤٠.
[16] ماکدۆوەڵ ٢٠٠٠: ١٤٢.
[17] ماکدۆوەڵ ٢٠٠٠: ١٣٨.
[18] ماکدۆوەڵ ٢٠٠٠: ١٤٢.
[19] پەیماننانەی لۆزان، بەشی دووەم، وتاری ٣٨.

دابەشکران. موسڵ بووە بەشێك لە عێراقی سەر بە بریتانیا و ناوچە کوردیەکانی خوارووی هێڵی شەمەندەفەری بەغداد چوونە ژێر کۆنترۆڵی ئینتیدابی فرەنسا لە سووریادا. ئەنجامی ئەو قۆناغی سیاسەتەی زلهێزەکان، هەروەك (دیڤید فۆمکین) دەڵێت (گەمە مەزنەکە) کوردستانی بە دابەشکراوی بەسەر پێنج دەوڵەتی جیاوازدا بەجێهێشت، کە ئەوانیش : تورکیا، عێراق، ئێران، سووریا و یەکێتی سۆڤیەتی پێشووە.
کورد هەر لەو ساتەوە بە بیانووی شوناسی نەتەوایەتیانەوە، لە هەموو ئەو دەوڵەتانەدا مافەکانیان پێشێل دەکرێت.

## کوردی سووریا ( رۆژئاوای کوردستان )

ئەو بەشەی کوردستان کەوتە ژێر کۆنترۆڵی کایەی دەسەڵاتی فرەنسییەکانەوە، کە باکووری دەوڵەتی هاوچەرخی سووریای تێدایە. کوردی سووریاش بەشێکن لە نەتەوەی کورد و ناوچە کوردیەکانی باکووری سووریاش بەشێکی رووبەری جیۆگرافی کوردستان پێکدەهێنن. کوردەکانی سووریا هەمان نەریتی کولتووری و ئاینی کوردەکانی بەشەکانی تری کوردستان پەیڕەو دەکەن، هەرچەندە ژمارەیان نزیکەی ٢- ٣ ملیۆن دەخەملێنرێن، بە شێوەیەکی بەرچاو بچوکترین بەشە کوردیەکەی سووریا بە بەرهەمترین بەشی سووریایە، بەو پێیەی لە رووی بەرهەمی کشتوکاڵی و کانزایی و سامانی ئاوەوە زۆر دەوڵەمەندە. لەگەڵ ئەوەی کورد لە سووریا ١٠٪ ی ١٨ ملیۆن دانیشتوانەکەی پێکدەهێنێت،[٢٠] بەڵام ئەوان هێشتا وەك کەمایەتیەکی نەژادی یان نەتەوەیی لە سووریادا نەناسراون. کورد بەگشتی لە ناوچەکانی سنووری باکووری سووریا (کورد- داغ، کوبانی، حەسەکە) دەژین و زۆربەیان پارێزگاری لەو شوناسە نەژادی و کولتوورییەیان دەکەن کە جیاوازن لە عەرەبە زۆرینەکەی سووریا. ناوچە کوردیەکان بەشێوەیەکی مەرکەزی لەلایەن دەوڵەتەوە بەڕێوەدەبرێن و کورد هیچ فۆرمێکی خۆبەڕێوەبردن و کارگێڕی لە سووریادا نیە.

---

[٢٠] بە پێی سەرچاوەیەکی کوردی١٧٪ی دانیشتوانی سووریا پێکدەهێنن.

زمانی کوردی لە ناوچە کوردیەکاندا بۆ لە ٩٠٪ ی ژیانی رۆژانە و ئاهەنگ و بۆنە کولتووریە کوردیەکان بەکاردەهێنرێت، کە زۆر جار نایاسایی‌یەو هەمیشە ئازادنین، سەرەڕای هەوڵەکانی دەوڵەت بۆ سەرکوتکردن و بەزۆر تێکەڵکردنی کورد بە شوناسی عەرەبی سووریا. کورد، خاوەنی هەستێکی شوناسی کوردی خۆیەتی لە سووریاو بەجیا و بەهێزیش ماوەتەوە، کەچی هێشتا بە بەراورد بە بەشەکانی تری کوردستان، کوردی سووریا لە رووی جیۆگرافیەوە پەرتەوازە و دابەشبوون، لە زۆر لایەنەوە توانای نیشاندانی هێزێکی سیاسیی، کولتووری کۆمەڵایەتی یەکگرتووی کورد لە سووریادا بەکارێکی سەخت دەبینن.

بەهەمان شێوەش دابەشبوونی کورد لە ناوچەکانی باکووری سووریا رێگرە لەوەی ئەگەری بزوتنەوەیەکی بەرهەڵسکاری کوردی رێکخراو، کە توانای بەکارهێنانی تاکتیکی گەریلا و هەڵگرتنی چەکی بەشێوەیەکی ستراتیجی هەبێت، وەك ئەوانەی لە بەشەکانی تری کوردستاندا ئەنجام دەدرێت. مێژووی نیشتەجێبوونی کورد لەم ناوچانەدا لەنێوان خێزانیەکان و ناوچەکاندا جیاوازە. هەرچەندە جێگیربوونی کورد لە ناوچەی (کورد- داخ)دا باوەڕوایە کە بگەڕێتەوە بۆ سەدان ساڵ لەودبەر، ئەگەر هەزاران ساڵ نەبێت.

ئەو ناوچەیەی بە بناری زنجیرە چیاکانی تۆرۆسدا درێژدەبێتەوە و چەند رووبارێکیشی بەناودا تێپەڕدەبێت، لەسەردەمی سەلجوقیەکاندا و لە کاتێکدا کە بوو بووە سەنگەری بەرگری و بەرە و رێگەی ئانتیۆچ، کورد کردبوویە شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆی.[٢١] ئەوە لە رووی دانیشتوانەوە یەکێك بوو لە چڕترین ناوچە گوندیەکانی سووریا. (عەفرین) زۆرجار وەك ناوی هەرێمەکەش بەکاردەهێنرێت، شارۆچکەی سەرەکی هەرێمەکەیە.

ئەم شارۆچکە بچوکە، کە بەردەوام لە فراوانبووندایە، بە خاکێکی کشتوکاڵی و سەدان گوند دەورەدراوە. کوردەکانی ئەم ناوچەیە بە شێوەیەکی سەرەکی خەریکی کشتوکاڵ و کاری لەو جۆرەن، بەرهەمی سەرەکیشیان زەیتون و توتن و چەندین جۆری

[٢١] وانلی ١٤٨:١٩٩٢.

میوەیە. هەروەها ئەم ناوچەیە گۆشت و بەرهەمە شیرییەکانیش لەگەڵ زەیتون و رۆنی زەیتون بۆ بازاڕی (حەڵەب) بەرهەم دەهێنێت.

ژمارەیەکی کەمی خێزانی عەرەبیش لەم ناوچەیەدا دەژین، کە کاتی نیشتەجێ بوونیان دەگەڕێتەوە بۆ ٤٠ ساڵ لەوەبەر. زۆرینەی دانیشتوانی کوردن و دیالێکتی کرمانجیش بەشێوەیەکی تایبەتی لەم ناوچەیەدا بەکاردێت. کوبانی (عین العرب) بچوکترین ناوچەی کوردە لە سووریادا و دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی عەفرینەوە لە سەر سنووری تورکیا. ناوچەکە بەزۆری تەخت و وشك و کەم بارانە. ئابووریەکەشی بەشێوەیەکی سەرەکی بریتییە لە کشتوکاڵ و بەرهەم هێنانی میوە و سەوزە و ئاژەڵداری. شارۆچکەی کوبانی ناوچەیەکی مێژووییە و دانیشتوانەکەشی بەزۆری کوردن، لەلای رۆژهەڵات و رۆژئاوایەوە هەردوو شارۆچکەی ترابلوس و تەلئەبیات کە دانیشتوانەکانیان کورد و عەرەبن، بەر پرۆسەی بەعەربکردن کەوتون.

قولە سنووریەکانی کوبانی لەگەڵ تورکیا دانراوە، بەڵام بۆ مەبەستی بازرگانی کردن، ئەوانەی ترابلوس و تەلئەبیات بە کراوەیی بەجێهێڵراون. لە ئەنجامیشدا زۆربەی پێشکەوتنە پیشەسازی و ئابوورییەکان لەو دوو شارۆچکەیە روو دەدەن و کوبانیش هەر بەدواکەوتویی ماوەتەوە. باوەڕوایە پەراوێزخستنی کوبانی لە رووی ئابووری و بوونی پرۆسەی بەعەربکردن لە هەردوو شارۆچکەی ترابلس و تەلئەبیات سیاسەتێکن و بەو مەبەستە پەیڕەو کراون لە پێناو دابەشکردن و بێتواناکردنی گروپە کوردیەکان لەگەڵ یەکدا.

سێیەم ناوچە، کە کورد زۆرینەی پێکدەهێنێت (حەسەکە) یە، کە بە (جەزیرە)ش ناسراوە و دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی سووریاوە، ئەمەش لەبەرئەوەی بەشێك لە میسۆپۆتامیا پێکدەهێنێت و لە رووی جیۆگرافییەوە پێگەکەی لەنێوان هەردوو رووباری دیجلە و فوراتدا دیاری دەکرێت. جەزیرە، ئەو ناوچەیە بوو، کە لەلایەن کۆچەریانی کورد و خێڵە رەوەندەکانی عەرەبەوە وەك لەوەڕگایەکی وەرزیی بەکارهاتووە. کشتوکاڵ بە شێوەیەکی چڕوپڕ هەتا دوای جەنگی جیهانی یەکەم لەو ناوچەیە دەستی پێکرد.

پاشان سنووره نێودەوڵەتییەکانیش دیاری کران و لە ئەنجامیشدا کوردە کۆچەریەکان هاندران لەو جێگەیەدا نیشتەجێبن. ڕەوەندە عەرەبەکان هەر بەکۆچەری مانەوە، بەڵام دواتر بەها و کەڵکی کشتوکاڵیان بۆ دەرکەوت و هانیش دران تا لەوێ نیشتەجێ بن. بەشێکی زۆری کورد لە ترسی ستەمکاری هێزەکانی کەمال ئەتاتورک، لەدوای ڕاپەڕینە کوردییەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا لە ساڵانی ١٩٢٠-١٩٣٠، هەروەها لە عێراقیشەوە لە ساڵەکانی سیەکان و چلەکان و پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا، بەرەو سووریا هەڵهاتن. هەموو ئەو کوردانە بەزۆری لە ناوچەی جەزیرە جێگیرکران، هەربۆیە لەنێو حکومەتی سووریا باسی ئەوە دەکرێت، کە کوردەکانی سووریا کۆچەریی دەوڵەتانی ترن. هەرچەندە ئابووریی کۆمەڵایەتی لە دوا بەشی سەدەی نۆزدەیەمدا گۆرانکاری لە ناوچە کوردیەکاندا کرد،[٢٢] شێوازی ژیانی خێڵە کوردیە کۆچەریەکانی پێشووی گۆڕی و لەو ناوچەیەدا جێگیربوون و کاری کشتوکاڵیشیان پێشخست.

کورد ئەزموون و شارەزاییان لە کشتوکاڵ و وەرزێریدا خستەگەڕ و هەر زوو ئەو خاکە وشکەیان ئاوەدانکردەوە و جەزیرەشیان کردە ناوچەیەکی پڕ بەرهەمی سووریای هاوچەرخ. سەرەڕای ئەوانەش، هێزە کۆلۆنیاڵەکان هیچ حسابێکیان بۆ دابەشبوونی نەژادی نەکرد، کاتێك کە لە ساڵانی بیستەکان و سیەکانی سەدەی ڕابردوودا سنووری دەوڵەتەکانیان لەگەڵ تورکیا و عێراقدا کێشا، لە ئەنجامیشدا ئەو سنوورانەی کوردستانی پێ جیاکرابۆوە، بە دەستکرد وەسف دەکران، بەلای کوردەوە ئەو خاکەی لکێنرابوو بە سووریاوە، هەروەك ناوچەیەکی کوردی تەماشادەکرا. ئەو سەنتەرە بازرگانیانەی لە باکووری سووریا خزمەتی ناوچە کوردیەکانیان دەکرد، لەناو تورکیادا مانەوەو سنوورەکانیش گرنگی و بەهایەکی تایبەتییان بۆ کەسان و گروپ و دانیشتوانی ئەو ناوچەیە هەبوو، کە لە نێوان سنووری تورکیاو سووریادا بوون. بەهۆی ئەو دەوڵەتە نوێیانەی لەسەرەتا و ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا دروستکران، بەشێکی زۆری خێزانەکان پەرتەوازە و دابەش بوون، زۆربەی کوردەکانی باکووری سووریا خزم و

---

[٢٢] ماکدۆوەڵ ٢٠٠٠: ٤٦٦.

کەسوکاریان لە سنووری تورکیا و عێراقدا هەبوو.[٢٣] کوردەکانی تر لە ناوخۆی سووریا، لە شارەکانی وەك دیمەشق، حەلەب، حومس، حەما، لازقییە...هتد دەژین.

لە سەدەی دوانزەیەمدا هێزی چەکداری کورد لە شێوەکانی فەرمی و نافەرمی سوپای موسڵمانانندا جەنگاون. بەناوبانگترین کەسیش کە دژی خاچپەرستەکان جەنگاوە، سەلاحەدینی ئەیوبی بووە. ئەم تاقمانە لەناو دیمەشق و دەوروبەریدا ناوچەی بچوکیان دروستکردووە و بەتێپەربوونی کات بۆتە شوێنی هەمیشەییان. لەبەر ئەوەی ئەم هێزانەش بەپێی نەژاد، یان خزمایەتی رێکخراون، بۆیە دامەزراندنی گروپەکان، دابەشکاری نەژادی بەدوای خۆیدا هێناوە. کوردەکان گەڕەك و ناوچەی کوردی جیاوازیان دامەزراندووە و لە لایەن بنەماڵە کوردە بەتواناکانیشەوە لە ئاستی ناوخۆدا بەڕێوەبراون، دوو ناوچەی تایبەتی کورد لە دیمەشق کە گەڕەکە کۆنەکانی پێشوی (حی االکراد) واتە گەڕەکی کوردان و ناوچەکانی (الصالحیە )ن، دەکەونە باکووری رۆژهەڵاتی دیمەشقەوە لە دیوی (جبل قاسیون). کوردەکانی ئەم ناوچەیە کە تێکەڵییەکی کولتووری زیاتریان لەگەڵ عەرەبدا هەیە لەبەراوردا لەگەڵ کوردەکانی تری ناوچە کوردیەکانی باکووردا، بەشێکی گرنگی کۆمەڵگەی سوورییی و دیمەشقی پێکدەهێنن، هەتا سەربەخۆی سووریا لە ساڵی ١٩٤٦دا ناوەندی دەسەڵات و پلەوپایەی ناوخۆ، لە لایەن ژمارەیەك لە بنەماڵە کوردەکانەوە( ئەم گروپە کوردانەی دیمەشق) بەڕێوەدەبرا.

بنەماڵەکانی ئەلیوسف و شەمدین نموونەی دوو لەو بنەماڵانە بوون، کە دەسەڵات و کاریگەرییان بە دامەزراندنی عوسمانی و دەسەڵاتی ناوەندی ئەستەنبوڵەوە گرێدرابوو، هەروەك پشتی بە پەیوەندیە نەژادی و خزمایەتیەکان بەستبوو. هەرچەندە لە ئێستادا دەسەڵاتی ئەم بنەماڵانە بەرەو نەمان دەچێت، بەڵام هێشتا کوردی دیمەشق پێگەی گرنگتریان هەیە لەبەرامبەر خزم و کەسەکانیان لە کوردەکانی باکوور. لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی زۆری کورد بەرە و دیمەشق و شارەکانی تر کۆچیان کرد، کە ئەمەش بووە هۆی زیادکردنی دیمۆگرافیای دانیشتوانی کورد لە شارەکانی وەك دیمەشق و حەلەب و

---

[٢٣] تورکیا کەمایەتیەکی دانیشتوانی عەرەبی زۆر گرنگی لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیادا هەیە و قەزایەکی ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئەلێکزاندەر بووە.

چۆڵکردنی ناوچە کوردیەکانی باکووری سووریا، هۆکار و کاریگەرییەکانی ئەوەش بە درێژیی لە بەشی چوارەمدا باس دەکرێت. زۆرینەی کورد بە کرێکاریەوە خەریکن و لە ناوچەکانی دەوروبەری دیمەشقدا دەژین. یەکێك لەو ناوچانەی کە بەشێوەیەکی نایاسایی لەلایەن ئەم کوردە کۆچەریانەوە دروستکراوە، (زۆر ئاوا) یە، واتە پێویستیەك زۆری لێکردوون تا ئەو خانوانە دروست بکەن.

ئەو دیالێکتە کوردییەی لە سەرانسەری سووریادا قسەی پێدەکرێ، کرمانجییە. بەڵام شێوە ئاخاوتنەکانی ناوچەکانی (کورد- داخ) و (جەزیرە) کەمێك جیاوازن لە یەکتر، ئەمەش بەهۆی ئەوەی زمانەکە لە هەریەکە لە تورکیا و عێراقەوە بەجیا کاری لێدەکرێت. لە سووریا و لە سەردەمی دەسەڵاتی فەرەنسیشدا، جەلادەت بەدرخان لە گۆڤارەکەی خۆیدا بە ناوی (هاوار) رێنووسی لاتینی بۆ نووسینی دیالێکتی کرمانجی بەرەوپێش برد.

ئەم گۆڤارە لە تورکیا بە نهێنی بڵاودەکرایەوە و بەشدارییەکی گەورەی هەبوو لە بەرزکردنەوەی ئاستی خوێنەواریی لە نێو کوردەکانی تورکیادا، کە زمانی کوردی تێیدا قەدەغەبوو.
هەرچەندە فەرەنسییەکان لە سووریا رێگەیان داوە بە بوونی رێکخراوە کولتووریەکان، بەڵام لەدوای تەواوبوونی وادەی دەسەڵاتەکەیان لە وڵاتەکە و سەربەخۆبوونی سووریا، هیچ گەرەنتییەکیان بۆ مافی کوردی کەمینە مسۆگەر نەکردو دوابەدوای کشانەوەی فەرەنسا لە ساڵی ١٩٤٦دا، کورد دوچاری چەندین ستەمکاری و سەرکوتکردن بوون، بەشێوەیەك کە پرۆسەی فێرکردن و فێربوونی زمانی کوردی کارێکی نایاسایی بوو.
تا ئەمرۆش زمانی کوردی بە فەرمی دانی پیادا نەنراوە و بەکارهێنانی کرمانجی بەمەبەستی فێربوون و فێرکردن دژی یاسایە. هەرچەندە رێی تێدەچێت کتێبێك بە زمانی کوردی چاپ بکرێت، بەڵام سانسۆر لە سووریا زۆر توندە و لەدوای دەرچوونی بڕیاری ژمارە (٥٠) لە مانگی ئەیلولی/ ٢٠٠٠ دا توندوتیژ بووە. لە دوای دەرچوونی ئەو

بڕیارەوە، دەزگاکانی پەخش و بڵاوکردنەوە خۆیان لە چاپکردنی کتێبە کوردییەکان بەدوور دەگرن، ئەمەش لەبەر ئەو بەرئەنجامە نێگەتیڤانەیەی لێی دەکەوێتەوە.[٢٤]
بەهۆی ئەو کۆت و بەندەی لەسەر بەکارهێنانی کرمانجی لە سووریادا هەیە، زۆربەی کورد بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی قسەدەکەن، هەرچەندە کرمانجی وەك زمانی سەرەکی لە ناوچە کوردییەکانی باکووردا دانانرێت. لەم ناوچانەدا زانیاری لەسەر زمانی عەرەبی هەیە، لەبەرئەوەی بەشێکی زۆری کورد هەتا تەمەنی شەشساڵی و ئەو کاتەی دەچنە قۆناغی یەکەمی سەرەتایی، خۆیان فێری عەرەبی ناکەن، خوێندنی دەوڵەتیش هەتا پۆلی ٩ ناچارییە،[٢٥] بەڵام بە پێچەوانەوە، باوەڕوایە لە ٤٠٪ی دانیشتوانی کورد، کە کۆچەریی نین، بەشێوەیەکی گشتی لە ساڵی ١٩٢٠دا بەر پرۆسەی بەعەرەبکردن کەوتوون و ئەوەی دەرەوەی نیشتەجێبووانی شار وەك قسەکەرانی عەرەب گەورە بوون و زانیاری زۆر کەمیان لە بارەی زمانی کوردییەوە هەیە.[٢٦]

زۆرینەی کوردی سووریا موسڵمانی سوننەن. بە گرنگیەوە باسی ئەوەش دەکرێت، ژمارەیەکی بەرچاوی تری کورد مەیلیان بۆ هەندێك ئاین و باوەڕی کوردیی کۆنی وەك زەردەشت هەیە. هەروەها کەمایەتیەکی گرنگ و دێرینی یەزیدی لە ناوچەی (کورد- داخ) هەیە، بەڵام لەگەڵ بەردەوام بوونی پرۆسەی بەعەرەبکردن، لە ناوچە کوردییەکاندا جۆرێك لە بە ئیسلام بوونی باوەڕی ئەوانیشی گرتەوە، ژمارەیان بەرەو کەمبوونەوە رۆیشت. بەوەی ژمارەی هەموو یەزیدییەکانی جیهان نزیکەی ١٠٠ هەزارە، واتە ئەوانەی سووریا ژمارەیان ١٠هەزارە[٢٧] و جێگەی بایەخ و گرنگین. دڵسۆزی نەژادی و نەتەوەیی کورد لە سووریادا بە بەهێزی ماوەتەوە، ئەویش بەهۆی پیاهەڵدانی عەرەبیانەی دەوڵەتەوە. پەیوەندییەکانی ئەودیو سنووری سووریا فراوان بوون و گەیشتونەتە ئەو دەوڵەتانەی لەگەڵ سووریادا پەیوەندی دوژمنانەیان هەیە. داوای کورد بۆ مافی چارەی خۆنووسین و سەربەخۆی و ئۆتۆنۆمی، یان مافە کولتوورییەکان لە سووریا ترسی

---

[٢٤] بڕوانە چاودێری مافی مرۆڤ، ٣١/جەنیوەری ٢٠٠٢.
[٢٥] ئەمە تەنها لەم دواییەدا زیادکراوە تا شەش ساڵی.
[٢٦] ماکدۆوەڵ ٢٠٠٠: ٤٦٧.
[٢٧] هەمان سەرچاوە.

جیابوونەوەی خولقاندوە. بزوتنەوە سیاسیەکانی دراوسێ، ئەگەر کوردیان بۆ مەرامی سیاسەتی دەرەوەی خۆیان قۆرخ نەکردبێت، ئەوا بە وردی چاودێری دانیشتوانی سووریا دەکەن. شوناسی نەژادی کوردی سووریا بە هۆی پەیوەندی دەوڵەتی سووریا بە کورد و هێزە دەرەکییەکان و مەسەلەی جیابوونەوەوە شێوەیەکی سیاسی وەرگرتووە.

هەر ئەوەشە کورد وەك هەڕەشەیەکی توند بۆ یەکپارچەیی ناوچەیی و ئاسایشی دەوڵەت دەناسێنێت، سیاسەتی دەرەوەش بەرامبەر ئەوان رەنگدانەوەی ئەو هەڕەشانەیە (لە بەشی چوارەمدا باس دەکرێت ). لەگەڵ زیاد بوونی ناسیۆنالیزمی عەرەب، ئەم دەوڵەتە بەدوای کۆت و بەندی زیاتردا گەڕاوە بۆسەر دەربڕینی کولتووری کورد و رێکخراوە کۆمەڵایەتیەکانی و هەوڵی داوە بەزۆر کورد تێکەڵی شوناسی عەرەبی بکات. لە ئەنجامدا خاکەکەیان زەوتکراوە و هەزاران کورد مافی هاوولاتی بوونیان لێسەندراوەتەوە. کوردەکان بوونەتە ئامانجی چەوسانەوەی نەژادی و زیندانی هەڕەمەکی و ئەشکەنجەی جەستەیی و دەروونی، هەروەها بەهۆی ناسنامەی کوردیانەوە دەربڕینی سیاسی و کولتووریان لێ قەدەغەکراوە.

لەگەڵ جەنگی عێراق و دوابەدوای مۆرکردنی ماوەی دامەزراندن لە ئازاری ٢٠٠٤، کە مافە سیاسی و کولتووریەکان و مافەکانی زمان و دەسەڵاتی ڤیتۆ لە چوارچێوەی عێراقی فیدراڵدا پارێزرا، کوردی سووریا رووبەڕووی هێرشی زیاتری رژێمەکەیان و هەندێك لایەنی تری دانیشتوانی عەرەبی زۆرینەی سووریا بوونەتەوە، کە ئەویش لە ئەنجامی زیادبوونی هەستی دژە کوردییانەوەیە. بزوتنەوە سیاسیەکانی سووریا رووبەڕووی حکومەتی سووریابوونەتەوە و کوردانی ئەوێ بە خەباتی چەکداریەوە خەریك بوون. ئەمڕۆ سیازدە حیزبی سیاسی کوردی نایاسایی لە سووریادا هەن، کە هەوڵ دەدەن نوێنەرایەتی بەرژەوەندیەکانی کورد لای دەوڵەت بکەن.

داوا سیاسیەکانیان بە دەوڵەتی هەرێمی و مافی کولتووری دیاری دەکرێ، نوێنەرایەتی سیاسی و دان نان بە هاوولاتێتیدا لە سووریا. هاوهەستی بە کۆمەڵ دەگمەن بوو، کەوتنی رژێمی بەعس لە عێراق و گۆڕانکاری لە ناوچەکانی کوردی عێراق پشتگیری ئەو هەستە سرەپۆیەی دەکرد بۆ دەربڕینی سیاسی کورد و بڕوای زۆری لە نێوان دانیشتوانی کورددا بۆ رووبەڕوو بوونەوەی دەیان ساڵەی پەراوێزنان و جیاوازی لە دژی

ئەوان. ئەوەش بە شێوەیەکی ئاشکرا لە ئازاری ٢٠٠٤دا دەرکەوت، کاتێ لایەنی گروپە هاوبیرەکان بە سەرتاپای ناوچە کوردیەکانی سووریادا بڵاوبوونەوە و رووبەڕووی دەوڵەتی چەوسێنەر بوونەوە. سووریا دووچاری سەخترین بارودۆخ بوو لە ماوەی بیست ساڵدا و گرنگترین روداویان جوڵانەوەی نیشتمانی کورد بوو لە سووریاو لە مێشکی وێنەکراوی کورد وەکو سەرهەڵدان، واتە راپەڕین. رووداوەکانی ئازاری ٢٠٠٤ شایانی هەندێ قوڵبوونەوەی زیاترە:

لە ١٢/ئازار/٢٠٠٤دا، نزیکەی سەعات یەکی پاش نیوەڕۆ شەڕ لە نێوانی عەرەبی دێرەزور و کوردی قامیشلی بەرپا بوو، کە بۆ تەماشای یاری تۆپێن لە یاریگای قامیشلی کۆبوونەوە. ئەوە راگەیەنرا کە تەماشاکەرانی ئاژاوەچی لە تیپی فتووەی دێرەزوور، هەروەها ئەوانەی لە شارەکەدا سەربە سەددام بوون، لە ناوەندی شارەکەوە هاتن بە شێوەی کۆمەڵ کۆمەڵ و بە چەقۆو دروشمی پشتگیری سەددام و دژی کوردەوە خۆیان کرد بە یاریگاکەدا. ئیتر دوو هەزار کەس دژی کوردە بێ چەکەکان کەوتنە شەڕەوە. سەرۆکی شارەوانی قامیشلی فرمانی دا بە هێزی ئاسایش بچنە یاریگای قامیشلی و تەقە لە قەرەباڵغیەکە بکەن. نزیکەی حەوت هاووڵاتی کورد لەناو یاریگاکەدا کوژران، کە وەك راپۆرتەکان ئاماژەی پێ دەکەن، هەندێکیان منداڵبوون و دەیانی تریش بریندار بوون. ئەو شەوە چەندین خۆپیشاندان لە شارە کوردییەکانی وەك ئامێدی، دێرێك، حەسەکە، سەری کانیێ لە باکووری رۆژهەڵاتی سووریا و دیمەشقی پایتەختی گرتەوە. چەندین بینای حکومەت هێرشیان کرایە سەر و سوتێنران، لە نێویاندا بارەگاکانی حیزبی بەعس لە قامیشلی و پەیکەری سەرۆکی کۆچکردوو (حافز ئەسەد) شکێنرا و راگەیەندرا کە ژمارەیەك هاوڵاتی کورد لەو پێکدانەدا لەگەڵ هێزەکانی حکومەتدا کوژراون. پارێزگاری حەسەکە رێگەی دا، کە تانك و هەلیکۆپتەر بچنە ناو قامیشلیەوە و بڕیاردرا سەرشەقامەکان چۆڵ بکرێت و قەدەغەکردنی هاتوچۆ لە شارەکاندا راگەیەنرا و هێڵەکانی پەیوەندیکردن راگیران. رۆژی دواتر کاتێك تەرمی کوردە کوژراوەکان لەلایەن کۆمەڵێکی زۆرەوە کە ژمارەیان نزیکەی سەدهەزار کەس دەبوون هەڵگیران و بەرێ دەکران، پۆلیس تەقەی بەسەر قەرەباڵغیەکەدا کردو پێنج کەس لە بەشداربووانی رێپێوانەکە کوژران. برینداەکان یەکەم جار گەیەنرانە نەخۆشخانە گشتی و تایبەتیەکانی قامیشلی، بەڵام دواتر لە رێی ئۆتۆمبێلی فریاکەوتن لەلایەن پۆلیسەوە

پارێزگاری دەکران و بۆ نەخۆشخانە نیشتمانیەکان گوێزرانەوە و لەوێ لەژێر چاودێریدا بوون.[28]

خێزانی بریندار و دوکتۆرەکان لەوێ گوێزرانەوە و نەخۆشخانەکانیش لە ئاستێکی خراپدابوون، کە توانای چارەسەرکردنی ئەو بریندارە زۆرەیان نەبوو. ژمارەیەکی زۆری بریندارەکان بە ئەنقەست چارەسەرەکانیان رەتکردەوە، ئەویش لە ترسی ئەوەی دواتر دەستگیرنەکرێن. لە نیوەشەودا ئەوە راگەیەنرا کە شەش هاوولاتی کورد لە (دێرەزور) و سیان لە دیمەشق و کوردێکی شانزە سالان بەناوی (حەسەن نوری) کوژران و زیاتر لە هەشتای دیکەش لە شارۆچکەی کوردنشینی دێریك بریندار بوون. لە ماوەی رۆژانی دواتردا چەندین خۆپیشاندانی جەماوەری و کوشتن و بریندارکردن و دەستگیرکردنی کورد، لە ناوچە کوردییەکانی سووریادا روویاندا و بازاڕ و شوێنی نیشتەجێ بوونی کوردەکان هێرشیان کرایە سەر. لە دیمەشق، لە ئێوارەی ١٢/ ئازاردا، خوێندکارە کوردەکانی زانکۆی دیمەشق، چەندین خۆپیشاندانیان ئەنجام دا، خۆپیشاندانی زیاتریش رۆژانە رێکدەخران، لەکاتێکدا ئەو گرژی و ئالۆزیە بەردەوام بوو، سەدان کورد کەوتنە بەر شالاوی دەستگیرکردن.[29] لە ١٨/ ئازاردا، دەیان کورد بە بیانووی پێشێلکردنی یاساکانی زانکۆ و دابەشکردنی بلاوکردنەوەو بەیاننامە و بەشداربوونیان لەکاری سیاسیدا لە زانکۆ دەرکران.[30]

خۆپیشاندانەکان بۆ نزیکەی هەفتەیەك بەردەوام بوون. بەهۆی راگەیاندنی قەدەغەکردنی هاتوچۆ و چاودێری وردی پۆلیس و بلاوکردنەوەی سەرباز بەناو گوند و شارۆچکە کوردیەکاندا، هێمنی باڵی کێشایەوە بەسەر ناوچەکاندا. کۆتایی خۆپیشاندانەکان دەستگیرکردنی دەیان کوردی لە سەرانسەری سووریادا بە دوای خۆیدا هێنا. لە ساڵی دوای راپەرینەکەشدا دەستگیرکردنی کورد هەر بەردەوام بوو، (لەکاتی نووسینی ئەم کتێبەدا ). حەشارگە و بارودۆخی بێ سەرو شوێن کردنی سەدان کورد هێشتا نەزانراوە. سەرەڕای بوونی جیاوازی لەنێوان سەرچاوە کوردی و عەرەبییەکان لەسەر گێرانەوەی ئەو رووداوانەوە، کەم و کورتی لە بوونی هێزەکانی ئاسایش لە کاتی

---

[28] کۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە سووریا, نیسانی ٢٠٠٤: ٣.

[29] کۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە سووریا, ١٦/ ئازاری/٢٠٠٤: ١-٢

[30] کۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە سووریا, نیسانی ٢٠٠٤: ٧.

یاری تۆپێنەکەدا و بەکارهێنانی هێزەکانی ئاسایش بۆ بلاوە پێکردنی خۆپیشاندەران بە شێوەیەکی ئاشکرا دەبینرێت. کارێکی ئاساییە کە هێزەکانی ئاسایش لەو جۆرە بۆنانەدا بوونیان هەبێت و ئەنجامدانی هەندێك رێوشوێنی ئەمنی رۆتینی بەهەمان شێوە ئاساییە.[31]

بەلام لە یاریگای قامیشلیدا ئەو جۆرە رێو شوێنانە نەگیرانە بەر و لەو جۆرە هێزانەش بوونیان نەبوو، هەربۆیە پێکدادانەکە کە تەقییەوە، بە خێرایش پەرەی سەند. سەرچاوە کوردییەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە ئەندامانی هێزەکانی ئاسایشی سووریا لەلایەن سەرۆکی شارەوانی قامیشلیەوە فەرمانیان پێکراوە، لەکاتی دەست پێکردنی شەڕەکەدا لەگەڵ هاندەرانی تیپی فتووەدا یەکیان گرتوە بۆ هێرشکردنە سەر کوردەکان. هێزەکانی ئاسایش تەقەمەنی راستەوخۆیان بەکارهێناوە لە نێویاندا گوللەی مەترسیدار[32] لەدژی ئەوانەی لەیاریگاکەدا بوون و ئەوانەش کە لە هەڵبژاردنەکانی رۆژانی دواتردا بەشداریان کردووە. ئەو شێوە بەکارهێنانە لە بۆنەی وەهادا نائاساییە و جێگەی سەرسورمان بوو.

بۆ رووداوی هاوشێوەی ئەوە گازی فرمێسك رێژ و سۆندەی ئاو بۆ بلاوە پێکردنی خۆپیشاندەران بەکاردەهێنرێت و تەنها لە رووداوی زۆر توندوتیژیدا نەبێت گوللەی لاستیك بەکارناهێنرێت.[33] هەرچەندە خۆپیشاندانەکان کۆتاییان پێهێنرا، بەلام گرنگی کێشەی کورد بۆ دەوڵەتی سووریا بە شێوەیەکی ئاشکرا خرایە روو. دوابەدوای رووداوەکانی ئازاری ٢٠٠٤ دەوڵەت هەندێك هێمای هێورکەرەوەی بەرامبەر کورد بەکارهێناو پێشنیاری گەڕانەوەی مافی بەهاولاتی بوونی بۆ نزیکەی ٢٠ هەزار هاولاتی کورد کرد و کوردی وەك نەتەوەیەك و وەك بەشێکی گرنگی کۆمەڵگەی سووری و مێژووەکەی لە قەڵەم دا.

بەلام هیچ هەنگاوێکی کردەیی نەنراو دەوڵەتیش بەردەوام بوو لە سەرکوتکردنی چالاکییە کولتووری و سیاسیەکانی کورد.

---

[31] کۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە سووریا، نیسانی ٢٠٠٤: ٢.

[32] کۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە سووریا, نیسانی ٢٠٠٤: ٣.

[33] کۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە سووریا, نیسانی ٢٠٠٤: ٢.

## باسی دووەم

# پەیوەندییەکانی کورد و عەرەب لە سووریا

## ١٩٢٠ - ١٩٧٠

باروودۆخی ئاڵۆز و تایبەتی کوردی سووریا و چۆنیەتی دروستبوونیان تەنها لە ڕێگەی زەمینەی ڕوونکردنەوەی گەشەسەندنی مێژوویی پەیوەندییەکانی کورد و عەرەب لە سووریا و کاریگەری جیاوازی ناوخۆی و هەرێمی و دەرەکی لەسەریان، شیاوی تێگەیشتنە. دوابەدوای ناساندنێکی کورتی کوردی سووریا لە بەشی پێشوودا، ئەم بەشەش بە وردی دەڕوانێتە گەشەسەندنی ناسیۆنالیزمی کورد و عەرەب لە سووریا و باروودۆخە تایبەتەکانی هاوپەیوەند بە دروستبوون و پێشکەوتنی دەوڵەتی سووریا و هەوڵەکان بۆ یەکخستنی کۆمەڵگا لەچوارچێوەی ئەم یەکە سیاسیەدا. ئەمەش ئەو ڕێگەیە پێشاندەدات که بەهۆیەوە کورد وەك گروپێك دەناسرێت و ئازادی ڕادەربڕینیان لەبارەی ناسنامەیانەوە بەستراوە بە ناسنامە و بوونی دەوڵەت و ڕژێمی فەرمانڕەواوە.

مەبەستی ئەم کتێبە دامەزراندنی ئەو «حەقیقەت»ە نیە لە بارەی کۆچکردنی کورد لە تورکیا و عێراقەوە، یان سەلماندنی ئەوەی کە کورد بوونێکی مێژووییان لە سووریای مۆدێرندا هەیە، کە ڕەنگە دانپیانانی نەتەوەیی لە سووریا وەربگرن. ئەمانە هەموو ئەرکی گرنگن، بەڵام ئەوانەی دوای نەمانی ئینتداب، کە بوونی کورد لە سووریا وەك حەقیقەت وەردەگرێت. هەڵدانەوەی گەشەسەندنی مێژوویی گرژییەکانی نێوان کورد و عەرەب و گفتوگۆکردن لە بارەی ئەو هەڕەشەیەی کەوا دادەنرا کورد دروستیکردبێت بۆ سەر دەوڵەتی سووریا. لەو ماوەیەی، کە زۆرترین چالاکی هەبووە، سەرەتای نەمانی ئیمپراتۆریای عوسمانی بوو، کە گەواهیی گەشەسەندنی یەکسانیی ناسیۆنالیزمی کوردی و تورکی و عەرەبی بوو.

بەکارهێنانی ئەمە وەك خاڵی دەسپێکردن، ئەم بەشە دەڕوانێتە گەشەسەندنی پەیوەندییەکانی کورد و عەرەب لە سەرەتای ئینتیدابی فەرەنسی لە ساڵی ١٩٢٠ هەتا ئەوکاتەی حافز ئەسەد لە ساڵی ١٩٧٠ دەسەڵاتی گرتە دەست. مێژووی گەشەسەندنی

گرژییەکان لە پەیوەندیەکانی کورد و عەرەب لە دەوڵەتی مۆدێرنی سووریادا، ڕەگ و ریشەی لە گەشەسەندنی ناسیۆنالیزمی پان- عەرەب و کوردا هەیە، ئەمەش شانبەشانی گەشەسەندنی هەستی ناسیۆنالیزمی تورکی و دامەزراندنی بەرژەوەندی کێبڕکێی ئیمپریالیزم لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا رووی داوە.

ئەو ناسیۆنالیزمە سیاسییەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەبوو، بەگشتی پشتی دەبەست بەو فەلسەفەو بیرۆکە ئەڵمانییەی تایبەت بوون بە دەوڵەتی نەتەوە و سەروەری دەوڵەتەوە. هەرئەوەش لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا وەك هێزێك بۆ ڕێکخستن و ئایدۆلۆجیای شەرعیەت پێدان لە لایەن چەند بیرمەندێکەوە پەیڕەو دەکرا، لە کاتێکدا کە دەسەڵاتی ناوەندی ئیمپراتۆریای عوسمانی لاواز بووبوو. سەرئەنجام بیرۆکەی دەوڵەتی نەتەوە لەلایەن هێزە کۆلۆنیاڵەکانەوە لەدوای هەرەسی ئیمپراتۆریای عوسمانی و دوابەدوای سەرکەوتنی هاوپەیمانان لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا بەسەر ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و وەك مۆدێلێکی ڕێکخراوی سیاسی سەپێندرا. ئەم فۆرمی ناسیۆنالیزمی سیاسیی کوردییە وەك هێزێکی ڕێکخراوەیی لەچاو ناسیۆنالیزمی عەرەبی، یان تورکیدا درەنگتر سەری هەڵدا. ناوچە کوردییەکان بەزۆری و بەشێوەیەکی ناوخۆیی و ڕێکخراو مانەوە و هەندێك سەرکردەی ئاینی و سەرۆك عەشیرەتی کورد پشتگیری خۆیان پێشکەشی دەسەڵاتی ئەتاتورك و جەنگی تورکیای سەربەخۆیی کرد. تەنانەت لەژێر فەرمانڕەوایی دەوڵەتی تورکیا لە دوای ساڵی ١٩٢٣، یاخی بوون و ڕاپەرینەکانی کورد لە تورکیا ڕەنگدانەوەی سروشتی ڕێکخستنی سیاسی و کۆمەڵایەتی کورد بووە لەو کاتەدا دانراون. کەمی سەرکردایەتیەکی ڕێکخراوی ناوەندی کوردی و مەیلی جیاجیایان بۆ هێزە ناکوردییەکان لەدژی ئەم گروپە نەتەوەییە لە دوایەمین دابەشکردنی ناوچەی کوردستاندا کاری کردووە.

دەوڵەتی سووریا تا رادەیەك لەناو ئەو هەڕەشە و دەستێوەردانە دەرەکییە بەردەوامانەدا گەشەی کرد. باری نائاسایشی دەوڵەت و گەڕان بەدوای شەرعیەتی ناوخۆیی و نێودەوڵەتی، دەستی گرتووە بەسەر سیاسەتی ناوخۆو دەرەوەدا. ئاڵۆزی پەیوەندی نێوان خەونی نەتەوەیی کورد و شوناسی نەژادی تایبەتیان و گەشەسەندنی مێژوویی ناسیۆنالیزمی عەرەبی، لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هاتنە ناوەوەی هێزەکانی ڕۆژئاوا بۆ ئەم ناوچەیە، هەموو پێکەوە بەشدارن لە دروستکردنی کێشەیەکی

دیاریکراو لە سووریا، کە کورد وەك ئامانجی سەرکوتکردن دەناسێنێت. پێش ئەوەی سووریا وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ بوونی هەبێت، ناوچەکە پێکهاتبوو لە سووریا (جگە لە ناوچەی جەزیرە کە بەشێك بوو لە میسۆپۆتامیا)، لوبنان، ئیسرائیل، فەلەستین و ئەردەن، بە شام، یان سووریای گەورە ناسرابوو.[٣٤] هەرچەندە هەرگیز یەکەیەکی سیاسی نەبووە، گەلانی ئەم ناوچەیە بە زۆری عەرەب بوون و هاوبەشییان لە خەسڵەتی زمانەوانی - کولتووریدا کردووە. هەتا کاتی نەمان و هەڵوەشاندنەوەی کۆتایی، شام کەوتە ژێر فەرمانڕەوایی عوسمانیەکانەوە، کە بووە هۆی سەرکەوتنی هاوپەیمانان لە جەنگی جیهانیی یەکەم لە ساڵی ١٩١٩دا و دەستپێکردنی جەنگی سەربەخۆیی تورکیا. هەتا ئەوکاتەی سنوورەکانی تورکیا و عێراق بەپێی بەرژەوەندیەکانی زلهێزەکان و ئینتدابی فرەنسی لە سووریا لە ساڵی ١٩٢٠ لەلایەن کۆمەڵەی نەتەوەکانەوە دامەزرا، گەلانی شامی عوسمانی و ناوچە کوردیەکان بەشێوەیەکی ناوخۆیی و لەلایەن سەرۆك عەشیرەت و ئەمیر و سەرکردە ئاینیەکانەوە بەڕێوەدەبرێت و ڕێژەیەك ئۆتۆنۆمی کارگێڕییان لە حکومەتی مەرکەزی ئەستەنبوڵدا هەیە. بەم شێوەیە سووریای مۆدێرن وەك یەکەیەکی سیاسی بوونی نەبوو، هەتا ئەوکاتەی سنوورەکانی بەهۆی ململانێ و ڕێکەوتنامەی جیاجیاوە دیاریکران، کە سنوورەکانی دەوڵەتی نوێی تورکیا و ناوچەی ئینتدابی فرەنسی و بریتانیەکانی بە ڕەسمی ناساند. سنووری ئێستای سووریا لە ساڵانی نێوان ١٩٢٠-١٩٢٩ تەواوکران، کە لە چەند ڕوویەکەوە تا رادەیەك هەرەمەکی بوون. سنووری باکوور بەشێوەیەکی سەرەکی ڕووە و هێڵی شەمەندەفەری بەغدا درێژ دەبێتەوە، لە جیاتی ئەوەی دووای سنوورە سروشتی یان نەتەوەییەکانی نێوان کورد و عەرەب بکەوێت. هەڵوەشانی ئیمپراتۆریای عوسمانی پێشوو بۆ چەند دەوڵەتێك کە لەلایەن هێزی دەرەکیەوە دروستکراون و فەرمانڕەوایی کران، گەلانی لەسەر بنەمای نەژادی و ئاینی و نەتەوەیی لە چوارچێوەی هەمان یەکەی ناوچەیدا دابەشکرد. سەبارەت بە کوردی سووریا، کە لە بەشی یەکەمدا بە ووردی باسکرا، ناوچە کوردیەکانی (کورد- داخ) و (کوبانی) و (جەزیرە) لە ناوچە کوردیەکانی تورکیا و عێراق بەهۆی سنوورە نێودەوڵەتیەکانەوە جیاکرانەوە.

[٣٤] بەگشتی بە دەوڵەتی سووریای هاوچەرخ دەوترا شام و هەروەها ناوێکی عەرەبیشە بۆ دیمەشق.

## دامەزراندنی جەنگی جیهانیی یەکەم

کاتێك ئیمپراتۆریای عوسمانی لاواز بوو، دوو لایەنی بیرکردنەوە لە ناوچەکانی ژێر دەستەڵاتی عوسمانیدا گەشەی سەند، کە دواجار کاری کردە سەر رای عەرەبی لەبارەی کوردەکانی سووریاوە. ئەم دوولایەنی بیرە لە سووریا بەشێوەیەکی بەرچاو بەهۆی جیاکاری شارستانی - لادێیی جیادەکرانەوە و هاوکات بوون لە چوارچێوەی کۆمەڵە کوردییەکاندا. بەو پێیەی دوابەدوای دروستبوونی ئینتدابی فەرەنسی لە ساڵی ١٩٢٠ و پاشانشینی سەربەخۆیی لە ساڵی ١٩٤٦، عەرەبەکان ئامێزیان بۆ ناسیۆنالیزمی عەرەبی کردەوە، پێگەی گشتی کورد لە سووریا بەهۆی خەونی عەرەبەوە داتاشرا.

لەلایەك پارێزگا کوردی و سەرکردەکانیان بەشێوەیەکی بەرچاو پشتیوانیان لە حکومەتی لامەرکەزی دەکرد. هەروەك دەسەڵاتی کارگێڕییان لە چنگی دەسەڵاتی عوسمانی دەرهێناو گواستیانەوە بۆ ئەوانەی کە گروپی نەژادی باڵادەست بوون. نموونەی ئەوەش عەشیرەتی (میلی) بوون لە جەزیرە کە هاوکاری سوپای فەرەنسا بوون بۆ رێ گرتن لە هاتنە پێشەوەی تورکەکان لە کاتی جەنگی سەربەخۆیی تورکیادا، لەکاتێکدا کە فەرەنسییەکان ساردبوون لە بیرۆکەی دروستکردنی هەرێمێکی کوردی لە ناوچەکەدا، کە لە ئورفەوە لەلای رۆژئاواوە درێژ دەبووەوە بۆ (جەزیرەی ئیبن عومەر) لە رۆژهەڵات.[٣٥]

لەلایەکی ترەوە، لە ناوەندی شارستانی دیمەشقدا چەند بنەماڵەیەکی ئاغایانی کورد، کۆنترۆڵی گەڕەکەکانی (الصالحیە) و (حی الاکراد)یان[٣٦] کردووە. بنەماڵەکانی (ال یوسف) و (شمدین) کە پەرۆشی پاراستنی دەسەڵات و بەختەوەریانن، ئەوەیان هەڵبژارد پشتیوانی لە دەسەڵاتی ناوەندی لە ئەستەنبوڵ و بارودۆخی ئەو کاتە بکەن.

---

[٣٥] ماکدۆوەل ١٩٩٨: ٦.

[٣٦] هەمان سەرچاوە

ئەوان بە بێدەنگی دژی سەربەخۆیی سووریا وەستانەوە، خوازیار بوون کە پشتیوانیان بۆ دەسەڵاتی فەرەنسایی فراوان بکەن و دان بنێن بە دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی جولەکەدا لە فەلەستین.[٣٧] شۆڕشی عەرەب لە ساڵی ١٩١٦دا لەلایەن ئاغایانی کوردەوە پێشوازی لێ نەکرا، بەهەمان شێوەش لە دانانی میر فەیسەڵ وەك مەلیك لە ١٩١٨دا. بە شێوەیەکی سروشتی هەموو کوردەکانی دیمەشق ئەم بۆچوونەیان نەبوو، بەشێکیان لە ناوچە شارنشینەکانی سووریا پێشوازیان لە لامەرکەزی عوسمانیەکان کردو پاشانیش لە ساڵی ١٩١٨دا لە سەربەخۆیی سووریا. پێویستە سەرنجی ئەوە بدرێت کە لەم کاتەدا نە ئامانج و نە بۆچوونیش لە بارەی ناسیۆنالیزمی سیاسی عەرەبی یان کوردی و پەیوەندییان بەیەکترەوە بە تەواوی دیاری نەکرابوون.

سیاسەت بووە پێگەیەك و بەتایبەت لە لایەن پیاو ماقوڵانی سوننەی شارنشینەوە بۆ بەرژەوەندی خۆیان دەستی بەسەرداگیرا. ناسیۆنالیزمی عەرەبی و کوردی هەردووکیان زیاتر لە سنووری زانیاریی سیاسەتمدار و بیرمەنداندا بوون، وەك لەوەی سوزی بزوتنەوەیەکی گشتییان هەبێت. بەم شێوەیە و ئەوەی سەرکردە کاریگەرەکان پەیوەندییان بە بازنەی سیاسی و لایەنی بڕیارەوە هەبوو، پێگەی گشتی و سیاسی کە بەشێوەیەکی سەرەکی سەر بە چینی ئاغاکان بوو. هەر لەبەر ئەم هۆیە شتێکی رازیکەر بوو لەم ماوەیەدا و لە چوارچێوەی ئەو بازنەی حوکمی چینی کۆمەڵایەتیەدا کە تا کودەتایی حیزبی بەعس لە ساڵی ١٩٦٣دا دەستی بەسەر سووریادا گرتبوو، ئەو بیرۆکەیە گەشەی سەند و کورد دژی سەربەخۆیی سووریایە و پشتیوانی لە هێزە ئیمپریالیزمە دەرەکیەکان دەکات.

---

[٣٧] عەبدولرەحمان ئەلیوسف، ئەوەی کە سەرۆکی کۆمەڵگای کورد لە دیمەشق، ئەندامی کۆنگرێسی سووریا بوو لە ١٩١٩، ماکدۆوەڵ ١٩٩٨: ٦.

## ئینتدابی فەرەنسا
## (١٩٢٠ - ١٩٤٦)

ئینتدابی فەرەنسا ساڵی ١٩٢٠ لە سووریا دەستی پێکرد، هەرچەندە سووریا لە ساڵی ١٩٤٣دا سەربەخۆیی ڕاگەیاند، بەڵام سەربازەکانی فەرەنسا تا ١٧/ نیسانی/ ١٩٤٦ لە سووریادا مانەوە. لەو ماوەیەدا فەرەنساییەکان پشتیوانیان لە داوای کۆمەڵایەتی و سیاسی دەکرد، کە بە باڵادەستی و خانەدانی سوننە شارنشینەکان و بنەماڵە بازرگانەکان دیاری دەکران. لەهەمان کاتدا ئەوان هیوای ئەوەیان دەخواست، کە فەرمانڕەواییان فراوان بکەن، ئەویش بە سنووردارکردنی دەسەڵاتی ئەم گروپانە و بنبڕکردنی ناسیۆنالیزمی عەرەبی لە سووریا.

ئەمەشیان بەهۆی پەیڕەوکردنی سیاسەتی (پەرتکە و زاڵبە) ئەنجام داوە، کە پشتیوانی گروپە کەمایەتیەکانی وەك مەسیحیەکان و لامەرکەزیکردنی دەگرتەوە.[٢٨] دەسەڵاتی ئینتداب بە توندی پشتیان بەم تاکتیکانە دەبەست، کە بووە هۆی دروستبوونی زیادکردنی گرژی کۆمەڵایەتی لە چوارچێوەی دەوڵەتە ناوچەییە نوێکەدا. داینامیکی ئەم سیاسەتە تا ئێستاش لە پەیوەندی کۆمەڵایەتی ناوخۆی سووریادا ماوەتەوە.

پەیوەندییەکانی کورد لەگەڵ دەسەڵاتی کۆلۆنیاڵی فەرەنسیدا تاڕادەیەك تێکەڵ و بەیەکدا چووبوون. چەند عەشیرەتێك کە بە زۆری مەسیحی بوون و ئاغاکان، کە دەسەڵاتی ناوخۆیان پشتی بە ئیدارەی لامەرکەزی دوای ساڵی ١٩٠٨ی دەسەڵاتی عوسمانی و ئینتدابی سووریا دەبەست و پشتگیریان لە فەرەنسا دەکرد.[٢٩]

---

[٢٨] بۆ نموونە بڕوانە دام ١٩٩٦

[٢٩] بە تایبەتی ئەلیەسیف و خێزانەکانی شەمدینی گەڕەکی کوردەکان لە دیمەشق، ماکلۆوڵ ٢٠٠٠: ٤٦٧-٤٦٨.

هەندێکی تریان لەگەڵ عەشیرەتە عەرەبەکاندا رێکەوتبوون و حوکمی فرەنسایان لە سووریا رەتکردەوە و پشتگیریان لە بزووتنەوەکانی سەربەخۆیی سووریای سالآنی ١٩٣٠ دەکرد.[٤٠]

هەرچەندە هەریەك لە هەوڵی سەربەخۆیی لەدەست حوکمی کۆلۆنی و سیاسەتی فرەنسایی (پەرتکە و زاڵبە) کاری کردە سەر بیرکردنەوەی کورد لە پێگەی خۆیان لە چوارچێوەی سووریای ئینتداب و ئەوەشی کە بەدوایدا هات، هۆشیاری سیاسی کورد بەهۆی مافی سیاسی نوێ و سەروەری و بزوتنەوە ناسیۆنالیستە کوردیەکان و راپەرینەکانی تورکیا و عێراق و ئێران[٤١] و پەراوێز خستنی مافەکانی کوردی سووریا، لەبەرخاتری بەرژەوەندیەکانی فرەنسا و عەرەب، زیادی کرد. لەم ماوەیەدا ژمارەیەك هاوڵاتی کورد کە پەیوەندییان بە (خۆیی بوون)ەوە هەبوو، ئەو بزوتنەوە ناسیۆنالیستیە کوردییەی ساڵی ١٩٢٧ لە سووریا دامەزراند و کارە سیاسیەکانی لەدژی دەوڵەتی تورکیا بەکارهێنا، خۆیی بوون فرەنسای دڵنیاکردبوو، کە نابێتە هۆی هاندانی جوداخوازی نەتەوەیی و نەژادی لە سووریا و لە ئاکامیشدا رێژەیەك لە پشتیوانی دەسەلآتی فرەنسایی بۆخۆی مسۆگەر کرد،[٤٢] بەلآم چالاکیەکانی ئەم گروپە گرژی لە نێوان ناسیۆنالیستە عەرەبەکان لە سووریا و لە چوارچێوەی تورکیادا دروستکرد.[٤٣]

بەشداربوونی کوردەکانی سووریا لەگەڵ خۆیی بوون، کە خەباتیان بۆ ئۆتۆنۆمی کورد لەناو تورکیادا دەکرد، ناسیۆنالیزمی کوردییان لە سووریا بە بزوتنەوەی ناسیۆنالیستی کوردی لە تورکیا بەستەوە. لە ساڵی ١٩٢٨دا فرەنسا و بریتانیا کۆت و بەندی توندیان لەبارەی ئەوانەوە دروستکرد، کە بەشدار بوون لە خۆیی بووندا، هەروەك لە پێناو هێورکردنەوەی خەمەکانی عەرەبی سوننەی زۆرینە، کۆت و بەندیان دەخستە سەر چالاکیە کولتووریەکان لە سووریا. ئۆفیسی خۆیی بوون لە حەڵەب داخراو زۆربەی سەرکردەکان و ئەندامەکانی دەستگیرکران.

---

[٤٠] ئەحمەد ٢٠٠١: ٥٤. ئیبراهیم حەنونو، رابەری راپەرینەکەی ناوچەی ئیدلیب و کورداخ، کورد بوو.

[٤١] بۆ نموونە شۆڕشەکانی شێخ سەعید ١٩٢٥، دەرسیم ١٩٣٧و شێخ مەحموود بەرزنجی ١٩١٩-١٩٣٠

[٤٢] ئەحمەد ٢٠٠١: ٣٧-٤٧.

[٤٣] ماکدۆوەڵ ٢٠٠٠: ٤٦٨.

لەنێو ئەوانەدا عوسمان سەبری کە ئەندامی دامەزرێنەری (وەك دادەنرا) یەکەم حیزبی سیاسی کوردی سووریا بوو، بۆ (مەدەقەشقەر) دوور خرایەوە، سەرکردە و ئەندامەکانی تریشیان لە ناوخۆدا دورخرانەوە یان خرانە زیندانەوە.[٤٤] لە کاتێکدا ئەم بزوتنەوەیە لە سووریادا سنووردارکرا، بەڵام کاری زۆری کرد بۆ بەرزکردنەوەی هۆشیاری پرسی نەتەوەیی کورد و مافی چارەی خۆنووسین و سەرکوتکردنیان لەنێوان رۆشنبیرانی کورد لە سووریادا. ئەو ئەزموونەی لە رێگەی ئەم بزوتنەوەیەوە بەدەستهات، دواتر لە دامەزراندنی بزوتنەوەی سیاسی و کولتووری کوردی سووریای رەسەن بەکار هاتەوە.

ناسیۆنالیزمی کوردی، هەرچەندە بەشێوەیەکی ئاشکرا لەلایەن فەرەنساوە هان نەدراوە، کەچی بە شەیتانێکی بچوکتر لە ناسیۆنالیزمی عەرەبی سووریا دادەنرا، کە ئەمەی دواییان وەك هەڕەشەیەك بۆ سەر حوکمی فەرەنسا لە سووریا دەبینرا. ناسیۆنالیستە عەرەبەکانی سووریا داوای سەربەخۆییان لە فەرەنسا دەکرد، لەکاتێکدا حکومەتە یەك لەدوایەکەکانی فەرەنسا خوازیاری هێشتنەوەی ئەو کاریگەرییەی فەرەنسا بوون لە ناوچەکەدا.[٤٥]

هێشتنەوەی حوکمی فەرەنسا لە سووریا بە شێوەیەکی بەرچاو پشتی بە هێزە تایبەتەکانی سەر بە لیڤان دەبەست، کە زۆربەی لە گروپە کەمایەتییەکانی سووریا پێکهاتبوو، لەوانەش: کورد و عەلەوی و دروز و مەسیحی.[٤٦] بەکارهێنانی ئەم گروپانە لە بەرگریکردنی هێزی کۆلۆنیالی و داگیرکردنی ئەوان لە سووریا بەشداربوو لە زڕاندنی ناوبانگیان لەلای عەرەبی سوننەی زۆرینە و زیادکردنی گرژییە نەژادی و کۆمەڵایەتییەکان لە یەکە سیاسیە نوێکەی سووریادا.[٤٧]

دەبووایە تەنازول بۆ عەرەبی سوننەی زۆرینە لە سووریا بکرایە و لە ساڵی ١٩٣٢دا (محەمەد عەلی بەگ ئەلعابد) وەك یەکەم سەرۆکی سووریا هەڵبژێردرا و یەکەم حکومەتیش لەژێر سەرکردایەتی بلۆکی نەتەوەیی سووریا ساڵی ١٩٣٦ دەسەڵاتی گرتە دەست. ئەم پرۆسەیە سیستمێکی سیاسی پەرلەمانی دامەزراند، کە لەلایەن حکومەتی ناسیۆنالیستی عەرەبی سوننەوە دەستی بەسەردا گیرابوو. لە

---

[٤٤] ئەحمەد ٢٠٠١: ٣٧.
[٤٥] سەڤەلسبەرگ و حاجز ٢٠٠٤: ٥.
[٤٦] دام ١٩٩٦: ٤.
[٤٧] هەمان سەرچاوە، ماکلئزوڵ ١٩٩٨: ١٦.

ئاکامیشدا باڵادەستان و ناوداران و سوننەی دیمەشق و شارنشینەکان بەسەر حکومەت و ئابووریدا گرژی و جیاکاری کۆمەڵایەتی ناوخۆی لەنێوان هێڵە ناوچەیی و کۆمەڵی و ئابوورییەکاندا لێکەوتەوە. هەرچەندە فرەنسییەکان رێوشوێنی بۆ سنووردارکردنی دەسەڵاتی حکومەت و پەرلەمان گرتبووەبەر، ئەویش بە دڵنیابوون لەوەی کە دەتوانن لە هەرکاتێکدابێت پەرلەمان هەڵبووەشێنەوە و حکومەت هەمووی لاببەن و لە جێگەیان کاربەدەستی فرەنسایی دابنێن[48]. لەگەڵ ئەوەشدا فرەنسا بەردەوام بوو لە پشتیوانی کردنی ئۆتۆنۆمی کارگێڕی لەهەندێك ناوچەی وەك (جەبەل دروز) و ناوچەی عەلەوی دەوروبەری (لازقیە) و (جەزیرە).[49] کۆمەڵە کەمایەتیەکانی ئەم ناوچانە، وەك ئامرازێك بۆ دروستکردنی کاریگەری و لاوازکردنی دەسەڵاتی حکومەت و ناسیۆنالیزمی عەرەبی بەربلاو و لەهەمان کاتدا بۆ فراوانکردنی حوکمی فرەنسا بەکاردەهاتن.[50]

بەم شێوەیە گروپە کەمایەتیەکان لە چەند ناوچەیەکی دیاریکراوی سووریادا توانیان کاریگەری لەسەر دەسەڵاتی ئینتداب دروستبکەن. لە ماوەی ساڵانی سییەکانی سەدەی رابردوودا بزوتنەوەیەکی ئۆتۆنۆمی مەسیحی- کوردی ناوخۆ لە جەزیرە گەشەی کرد. ئەوان بە بەردەوامی سکاڵایان لە دەسەڵاتی ئینتداب و حکومەت دەکرد و داوای لامەرکەزی، کارگێڕی و ئابوورییان لەژێر پاراستنی فرەنسا بۆ جەزیرە دەکرد، هەروەك داوای ئەوەیان دەکرد کارگێڕی ناوچەکە لەلایەن مەسیحی و کوردەکانی ناوخۆوە بەڕێوە ببرێت.[51] لە کاتێکدا کە ئەم بزوتنەوەیە لە وەڵامی هەوڵەکانی حکومەتی ناسیۆنالیستی بۆ مسۆگەرکردنی کۆنترۆڵ بەسەر تەواوی ناوچەکانی سووریادا پەرەی سەند، گرژی و ئاڵۆزی زیادی کرد، لەلایەك لە نێوان ئۆتۆنۆمیستە مەسیحی و کوردە ناوخۆییەکان و لەلایەکی تریش ناسیۆنالیستە ناوخۆییەکانی کە لەلایەن حکومەتی عەرەبیی رەگەزپەرستی ناوەندییەوە پشتیوانی دەکران.[52]

---

[48] سەڤەلسبەرگ و حاجۆ ٢٠٠٤: ٤.
[49] دام ١٩٩٦: ٤
[50] ئەحمەد ٢٠٠١: ٣٥-٣٦
[51] سەڤەلسبەرگ و حاجۆ ٢٠٠٤: ٥-٦
[52] سەڤەلسبەرگ و حاجۆ ٢٠٠٤: ٦

حکومەتی ناسیۆنالیستی عەرەب دەستی کرد بە هاندانی عەرەبەکانی سووریا لە ناوچەکانی (حەڵەب، حوما و حومس) بۆ ئەوەی بگوازنەوە بۆ جەزیرە، ئەویش وەك هەوڵێك بۆ بەهێزکردنی کاراکتەری عەرەب لە ناوچەکەدا. لەهەمان کاتدا لێپرسراوانی ئەوێ کە پشتگیریان لە ئۆتۆنۆمی بۆ جەزیرە دەکرد، واتە کورد و مەسیحییەکان لە کارەکانیان لابران و عەرەبی سوننەی دڵسۆز بۆ حکومەتی ناوەندیی جێگەیان گرتنەوە. لە ئابی/ ١٩٣٧دا گەڕەکی مەسیحیەکانی شارۆچکەی (عاموودە) لەلایەن پشتیوانانی هەڵمەتی پان- ئیسلامیەوە هێرشی کرایە سەرو مەسیحیەکان بەکۆمەڵ کوژران.[٥٣] فەرەنساییەکان گڕژی و ئاڵۆزییەکەیان بەهۆی بۆمبارانکردنی ئاسمانییەوە دامرکاندەوە و دووبارە کۆنترۆڵی راستەوخۆیان لە جەزیرە کردەوە. ئەمەش بەشێوەیەکی کاتی ئۆتۆنۆمی ناوچەکەی لە حکومەتی ناوەندیی زیادکردو فەرەنساییەکانیش رێگەیان بە دامەزراندنی ژمارەیەك یانە و رێکخراوی کولتووری و کۆمەڵایەتی کوردی دا.[٥٤]

دەسەڵاتی ئینتداب دەستیان بەهاندانی مەسیحیەکان کرد بۆ مسۆگەر کردنی مانەوەیان لە سووریا، ئەویش لە رێگەی هاوکاریکردن لەگەڵ حکومەتی عەرەبی سوننە،[٥٥] بەڵام مافی کەمایەتی لەلایەن خودی ئینتدابی فەرەنساوە مسۆگەر نەکرابوو. کاتێك جەنگی جیهانیی دووەم دەستی پێکرد و تورکیا بە شێوەیەکی بەرچاو بووە لایەنێکی گرنگی هێزەکانی هاوپەیمانان، ناڕەزایی و بەرهەڵستی تورکیا لە بەرامبەر ئۆتۆنۆمی جەزیرەدا زیانی بە بەرژەوەندیەکانی کورد لە ناوچەکەدا گەیاند.

هەریەك لە بریتانیا و فەرەنسا بەڵێنی سەربەخۆیی سووریا و لوبنانیان دابوو، بەسەرکەوتنی بلۆکی نەتەوەیی لە هەڵبژاردنە پەرلەمانیەکانی سووریای ساڵی ١٩٤٣دا ناسیۆنالیستەکانی سووریا داوای بەپەلە بردنە سەری ئەو بەڵێنەیان کرد، کاتێك فەرەنسا شکستی هێنا لەوەی بکشێتەوە، راپەڕینێکی عەرەبی لە ساڵی ١٩٤٥دا دەستی پێکردو فەرەنساش دواجار لە سەرەتای ١٩٤٦دا هەمرو هێزەکانی کێشایەوە.

---

[٥٣] سەڤەلسبەرگ و حاجۆ ٢٠٠٤: ٦-٧

[٥٤] ئەحمەد ٢٠٠١: ٥٤. بەپێی ئەحمەد، دەسەڵاتی تورکی ناڕەزایی دەربڕی بۆ دامەزراندنی ئەو یانە کوردیە لە نزیك سنووری تورکیاوە و فەرەنسا لە ١٩٣٩دا داوای داخستنی کرد. ئەحمەد ٢٠٠١: ٥٤-٥٥

[٥٥] سەڤەلسبەرگ و حاجۆ ٢٠٠٤: ٧

## سەربەخۆیی (١٩٤٦)

سووریا لەگەڵ سەربەخۆییەکەیدا، دووچاری قەیرانێکی سیاسی هات، کە ئەنجامەکەی لە کەمیی شەرعیەت پێدانیەوە بوو لەلایەن دانیشتوانەکەیەوە، ناجێگیری سیاسی ناوخۆ، لاوازی لە پەیوەندیی هەرێمی و دەستێوەردانی دەرەکی لە کاروباری ناوخۆدا بوو. هەروەك پێشتریش باسکرا، سووریا وەك یەکەیەکی سیاسی، مێژوویەکی نەبووە و لە ئاکامیشدا ناسنامەیەك یان مێژوویەك نیە، کە لە رێگەیەوە دۆخە سیاسیە نوێکەی بناسرێت و شەرعیەت بداتە دەوڵەت و فەرمانڕەواکانی. دەوڵەتەکە بۆ خۆی وەك دەستکردێکی ئیمپریالیزم دەبینرا، شوناسی دەوڵەتی باڵای نەتەوەیی عەرەب ئایدیای نەتەوەیی سووریای تێپەڕاندبوو.

لە دەوڵەتێکی ئاینی هەمە جۆردا کە تێیدا زۆرینە بە عەرەبی قسەی دەکرد و ناسیۆنالیزمی عەرەبی عیلمانی ئەو شوناسە بوو، کە توانای زۆری بە فەرمانڕەوایانی نوێی سووریا بەخشیبوو، بۆ بەیەکەوە بەستنی گروپ و کۆمەڵە جیاکان وەك یەکەیەکی یەککگرتوو.

ئەمان بۆ کەمایەتیە ئاینییەکانی سووریا وەك (عەلەوی و دروزی و ئیسماعیلی و مەسیحیەکان) کاری خۆیان کرد، بەڵام کورد وەك کەمایەتیەکی نەتەوەیی سەلمێنرا، کە بە جیاوازییەوە تەماشا دەکرێت و ناتوانن وەك ئەندامی تەواو هەڵبکەن.

دەستبەجێ لە ماوەی دوای سەربەخۆیی هەروەك سووریای سەردەمی ئینتداب لەلایەن پیاوماقوڵە شارنشینەکانەوە دەستی بەسەرداگیرابوو. سەرکردایەتی تەقلیدی سوننە و بازرگانە شارستانیەکان بەرژەوەندییەکی تایبەتییان لە پاراستنی ئەو سیستمەدا هەبوو، کە لە سەردەمی ئینتدابی فەرەنسادا گەشەی سەندبوو، ئەمانیش پێگە و دەسەڵاتی ناوخۆیانی پێوە بەندبوو. دوابەدوای سەربەخۆیی سووریا، فەرمانڕەوایی خۆیان بەهۆی هێشتنەوەی پەیوەندیەکانیان لەگەڵ فەرەنسا باشترکرد.

ئەم سیستمە لە ڕێگەی پەرلەمانێکەوە پارێزگاری لێکرا، کە لەلایەن بلۆکی نەتەوەیی و پاشانشینی حیزبی نەتەوەییەوە دەستی بەسەردا گیرابوو. بەشێوەیەکی بەرچاو شەرعیەتی پێشڕەوە سیاسییە تەقلیدییەکان بەهۆی شکستهێنان لە قالبدانی یان پێچەوانە کردنەوەی کاریگەری نێگەتڤی ئیمپریالیزمەوە توشی داخوران بووبوو، هەروەك ناسیۆنالیزمی عەرەبی و هەستی دژە ئیمپریالیزم لەناو چینی جوتیاراندا بلاو بووەوە.[٥٦] بەشێوەیەکی گەشەکردوو ئەوان وەك دۆستی رۆژئاوا دەبینران و پەیڕەوکردنی مۆدێلی لیبراڵ _ کاپیتالیست لەسەر شێوازی سیستمی کۆمەلایەتی نیمچە دەرەبەگایەتی کە دۆخی پاشماوەی سالانی کۆلۆنیالیزم ناجێگیریەکی ئابووری و بەرزبوونەوەی نرخ و بێکاری بەرهەم هێنا.[٥٧] زۆربەی کاریگەرە نێگەتیڤەکانی ئەمە چوونە سەرشانی جوتیاران و سودی بە پیشەسازی کردنیشی بۆ ڕێژەیەکی کەمی دانیشتوان بوو.[٥٨]

بەرهەلستی لە دژی ئەم سیستمە لە کەمینەی بەسیاسی کراوی عەلەوی و نوێخوازەکانی (دروز) و جوتیارە سەربەخۆکان و بزوتنەوەی جوتیاران، کە (ئەکرەم حۆرانی) سەرکردایەتی دەکرد دەرکەوت.[٥٩]

هەریەك لە کاپیتالیست و ریفۆرمیستە رادیکالەکان لە دژی هێشتنەوەی ئەو بارودۆخە دوژمنکارییەدا وەستانەوە، کە لە دژی بەرژەوەندییەکانیان بوو.[٦٠]

دۆخی سیاسی دەستی بە دابەشبوون و هەلوەشان کرد، بەشێوەیەك کە لەسەر بنەمای هەرێمی و بەپێی بەرژەوەندی خۆیان بازرگانە پێشڕەوەکان زۆرداریيان تێدا کردبوو.[٦١] کۆمۆنیزم و ناسیۆنالیزمی عەرەبی بوونە هێزی بەربلاوی لایەنگیری سیاسی لەناو کەمایەتی و گروپە کۆمەلایەتییەکاندا. ئەمانەش لەلایەن چەند حیزبێکی وەك حیزبی کۆمۆنیستی سووریا و حیزبی بەعس و حیزبی یەکێتی سۆشیالیست. بەجیا نوێنەرایەتی دەکرا. چەمك و سیستمی دیموکراسی و سەرمایەداری کە لەلایەن فەرمانڕەوا پێشڕەوەکانەوە بەرگری لێ دەکرا، لەلایەن کۆمەلەکانیانەوە لەگەل

---

[٥٦] Hinnebusch ١٩٩٠: ٧١-٧٢

[٥٧] هەمان سەرچاوە.

[٥٨] هەمان سەرچاوە.

[٥٩] Lawson ١٩٩٤: ٥٠٣

[٦٠] Heydemann ١٩٩٩: ٣٠

[٦١] Lawson ١٩٩٤: ٥٠٤

کۆلۆنیالیزم و ئیمپریالیزم تێکچوو، هەروەك بە گومانەوە تەماشادەکران، ئەویش بەهۆی ئەزموونی خەڵك، کە بە ئایدۆلۆجیای لینینی و مارکسیی بەناوبانگ چەپڕەو کرابوون. ئەم چەپڕەوی کردنەی سیاسەتی عەرەبی لە ناوەڕاست و کۆتایی ساڵانی پەنجاکاندا گەیشتە لوتکە.

ئەمەش بە پەیمانی بەغداد دیاری دەکرا، ڕێکەوتنی چەك لەگەڵ (چیك)دا و کێبڕکێی توندی ناو دەوڵەتی بۆ باڵادەستی هەرێمی لەنێوان دەوڵەتە عەرەبیە رادیتالیەکان و پاشا پارێزگارەکان و دروستکردنی دەوڵەتی ئیسرائیل لە فەلەستین لە ساڵی ١٩٤٨دا، پاشانیش جەنگ لە پێناوی فەلەستیندا بڕیاردەربوو لەسەر ئەوەی کە زۆربەی بانگەشەو سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتی سووریا بەهۆی ناسیۆنالیزمی عەرەبی و دژە ئیمپریالیزم و پرسی فەلەستینەوە دیاری بکرێت. جەنگەکە هەموو ئەو شەرعییەتەی لە دەست دا، کە رژێمی پێشوو لە سووریا هەیبوو، دوای ساڵی ١٩٤٨یش کودەتای سەربازی ناوبەناو سووریای بەرەوپێش و بەرەودواوە لە نێوان گەڕانەوە بۆ سیستمی پەرلەمانی و ڕاگرتنی و حوکمی بڕیار و پەیڕەوکردنی حوکمی سەربازیی ڕاستەوخۆ دەبرد.[٦٢]

ئیتر لەوە بەدواوە ئەفسەرانی یەکەی هێزە سەربازییەکان وردە وردە لە رووی سیاسیەوە چالاك بوون و ئیدی هێزی سەربازیی نەك سیستمی سیاسی پەرلەمانی، بەڵکو بووە دامەزراوەی سەرەکی گۆڕینی رژێم.[٦٣] بانگەشەی عەرەبی سووریا و دروستکردنی سنوورەکانی وایکردووە، کە دەستێوەردانی دەرەکی لە سیاسەتی ناوخۆیدا هەبێت.[٦٤]

بەهۆی ناجێگیری ئاستی ناوخۆوە و لاوازی لەناوچەکەدا، سووریا بۆتە شانۆی کێبڕکێی هەرێمی بۆ دەوڵەتە بەهێزەکانی تری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئامانج و خەونەکانی هەردوو دەوڵەتانی ئەردەن و عێراقی هاشمی رزگاریخواز.[٦٥] دەوڵەتە

---

[٦٢] بیستوێەك کودەتا لە ماوەی بیستوسێ ساڵدا بەرپا بووە.

[٦٣] بۆ نموونە،لە ١٩٤٩لەژێر فرمانی عەقید حوسنی زەعیم و لە نۆڤەمبەری ١٩٥١ لەژێر فرمانی ئەدیب ئەلشیشەکلیدا بوو.
Lawson ١٩٩٤: ٥٠٥

[٦٤] Hinnebusch ١٩٩٠: ٨٣

[٦٥] مەلیك فەیسەڵ، ئەوەی پاڵەوانانە فرمانڕەوایی سووریای دەرك بەر لەوەی بخرێتە ژێر دەسەڵاتی ئینتدابی فەرەنساوە لە ١٩٢٠دا لە بنەماڵەی هاشمیە و لە دواتردا لەلایەن بریتانیاوە بە مەلیکی عێراق دانرا، ١٩٢١-١٩٥٨. سیستمی بنەماڵەیی لە ئەردەن ئەمڕۆ هاشیمیە.

عەرەبیەکان یارمەتی دارایی یان چەکدارییان پێشکەشی هەندێك لایەنی سووریا کردووە و پشتیوانییان لە کودەتای سەربازی بۆ مسۆگەرکردنی بەرژەوەندییەکانیان لەناوچەکەدا کردووە.[٦٦]

دوابەدوای سەربەخۆیی سووریا و کشانەوەی فەرەنسا، کورد بەردەوام لە پێکهاتنی بەشێکی گرنگ لە چوارچێوەی هێزەکانی سوپادا بووە. دوو کودەتا کە لە ساڵی ١٩٤٩دا ئەنجامدران، لەلایەن ئەو سەرکردانەوە بوون کە پێشینەی کوردیان هەبوو. یەکەم کودەتا، کە لە ٣٠/ئازاری/ ١٩٤٩دا ئەنجامدرا، لەلایەن جەنەراڵ (حوسن زەعیم )ەوە رێکخرا و بۆ دابینکردنی ئاسایشی رژێم بەزۆری پشتی بە گروپە کەمایەتیەکانی ناو سوپا دەبەست. باوەڕوایە کە کاریگەری و پلانی نهێنی ئاژانسی ناوەندی هەواڵگیری ئەمریکا (CIA) لە سوپا هانی کودەتاکەی (زەعیم )ی داوە. کاتێك (زەعیم) دەستی بە گفتوگۆی ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل کرد و بە ناچاری داواکانی ئەمریکای پەسەند کرد، بەهۆی کودەتاکەیەوە لە مانگی هەشتی هەمان ساڵدا روخێنراو لە سێدارە درا. (ئەدیب ئەلشیشەکلی) کە دووەم کودەتای لە مانگی ١٩٤٩/١٢دا و جارێکی تریش لە مانگی ١٩٥١/١١دا ئەنجام دا، بەشێکی بۆ رەچەڵەکی کورد دەگێڕێتەوە، هەرچەندە ئەو خۆی بەو شێوەیە وەسف ناکات. ئەو یاسای سەربازی بەسەر سووریادا سەپاند و دەستوورێکی نوێی لە مانگی ئەیلولی ١٩٥٣دا راگەیاند. سیاسەتەکەی لەسەر دروستکردنی دەوڵەتێکی پێکهاتەی عەرەب-موسڵمان چڕبووەوە، کورد و ئاشوری و ئەرمەنی و کەمایەتیەکانی تریش چەند بڕیارێك بەرێوەی دەبردن، بەجۆرێك کە رێگری دەکرد لە بەکارهێنانی زمانی کوردی و زمانەکانی تر، زۆر هاوشێوەی ئەوەی کە لەژێر فەرمانڕەوایی رژێمی بەعسدان. بۆ نوونە بڕیار دەرچووبوو کە داوای ئەوەی دەکرد هۆتێل و قاوەخانە و سینەما ....هتد تەنیا ناوی عەرەبیان بۆ بەکاربهێنرێت، هەروەك تەنیا زمانی عەرەبی لە کۆبوونەوە و فیستیڤاڵ یان بۆنەکاندا بەکاربهێنرێت و موسڵمانەکان بە ژمارەی یەکسان لەگەڵ ناموسڵمانەکان بەشداری کۆمیتەی رێکخراوەکانی کەمایەتیەکان دەکەن.[٦٧]

---

[٦] Hinnebusch ٢٠٠٢: ١٤٥.

[٦] ئەحمەد ٢٠٠١: ٥٤. ماکدۆوەڵ ١٩٩٨: ١٦

دەربڕینی کولتوور و مێژووی کورد لە شار و لادێکاندا قەدەغەبوو، هەروەك کۆمەڵە و گروپە کوردییەکان بوونە شتێکی نایاسایی.[68] سەرەڕای هەوڵەکانی (شیشەکلی) بۆ جێگیرکردنی سووریا و لە چوارچێوەی نەتەوەی سوورییایی و حەقیقەتی هەمەجۆری مەزهەبی و نەژادیی سووریا، هەموو ئەمانە هانیان دا کە بەئاشکراو لە ساڵی ١٩٥٣دا رایگەیاند « سووریا ناوی فەرمی ئێستای ئەو وڵاتەیە، کە چوارچێوەی ئەو سنوورە دەستکردانە دەگرێتەوە کە لەلایەن ئیمپریالیزمەوە کێشراون ».[69]

گۆڕەپانی ناوخۆی سووریا بەردەوام بوو لەوەی کە وەك شانۆی کراوەی دەستێوەردانی دەرەکی بێت، میسر و عێراق و ئەردەن و ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت هەموویان لە کێبرکێدا بوون بۆ دەستگرتن بەسەر ئەم هەلە سیاسی و ناوچەییەدا. لەو ماوەیەدا حیزبی بەعس دژە سیستم و رادیکاڵ بووە. چارەسەری ئایدۆلۆجی بۆ دژیەکییەکانی سووریا،[70] لەگەڵ ئەوەی بەرگری لە سۆشیالیزمی شێوازی سۆڤیەت دەکرد، بنەمای ناوەندی حیزبەکە بریتی بوو لە یەکێتی نەتەوەیی عەرەب.

لە ساڵی ١٩٥٤دا (شیشەکلی) بەهۆی کودەتاکەیەوە لە حوکم لابرا، حوکمی پەرلەمان گێڕدرایەوە بۆ شێوە دەستوورییەکەی ساڵی ١٩٥٠، کە ئەو لە ساڵی ١٩٥٣ گۆڕیبووی. هەرچەندە حوکمی پەرلەمان گەڕابووەوە و حیزبە سیاسییەکان و میدیا پاش ئەوە دەیانتوانی ئازادانە کاربکەن، بەڵام حکومەت و خەڵك بە بەردەوامی دەبوون بە عەرەبخواز و دژە رۆژئاوا و دۆستی سۆڤیەت.

---

[68] ئەحمەد ٢٠٠١: ٥٤

[69] Kaplan ١٩٩٣.

[70] هەمان سەرچاوە.

## گەشەی ناسیۆنالیزمی عەرەبی و
## کۆماری یەکگرتووی عەرەبیی

لە ناوەڕاستی ساڵانی پەنجاکانی سەدەی رابردودا، عەرەبیزم، وەك بانگەشەیەکی سیاسی و هەستێکی میللی لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا بڵاوبووەوە.
کودەتای (ئەفسەرانی ئازادیخواز)ی جەمال عەبدولناسر لە ساڵی ١٩٥٢ لە میسر، رێکەوتنامەی چەك و تەقەمەنی لەگەڵ چیك لە ساڵی ١٩٥٥، ئەو رقەی بەهۆی هاوپەیمانی بریتانیا و فرەنسا و ئیسرائیل لە جەنگی سوێس ساڵی ١٩٥٦، شۆڕشی عێراقی ساڵی ١٩٥٨، ئەوانە هەموویان پێکەوە گڕی ناسیۆنالیزمی عەرەبییان زیاتر خۆشکردو و بووە بانگەشەیەکیش کە پەیوەندیە هەرێمییەکان و شەرعیەتی ناوخۆی بۆ زۆربەی دەوڵەتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دیاری دەکرد.

ژینگەی سیاسی لە سووریا لە قەیراندا بوو، هەروەك سووریاش ترسی لە دیزاینی هاشمی و ئەمریکا و پلانی نهێنیان لەدژی ناوچە و سیاسەتیان هەبوو. بەرەی نیشتمانیی فەرمانڕەوا بە هەماهەنگی لەگەڵ هەندێك لایەنی بەعسیدا زۆریان بەرەو پەیوەندیەکی ناچاری لەگەڵ میسری جەمال عبدالناسردا برد و کۆماری یەکگرتووی عەرەبییان لە ٢٢/شوباتی/١٩٥٨دا پێکهێنا. لەژێر دەسەڵاتی کۆماری یەکگرتووی عەرەبیدا، هەموو حیزبە سیاسیەکان لە سووریا قەدەغەکران و وڵاتەکە لەلایەن جەمال عەبدولناسرەوە چووە ژێر دەستی قۆرخکاری و باڵادەستی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی خۆیەوە. ئەم یەکێتییە لەگەڵ میسردا شەپۆلێك هەستی ناسیۆنالیستی عەرەبی لە سووریادا لەگەڵ خۆیدا هێنا.

لە کەشێکی ئاوادا و بەهۆی شەپۆلی ناسیۆنالیزمی عەرەبی کە سەرتاپای ناوچەکەی گرتبووەوە، کورد ناسنامەی نەتەوەیی و کولتووری خۆی لە بەردەم هەڕەشە و نەماندا بینیەوە. لەو ماوەیەدا حکومەت هەڵمەتێکی بە ئامانجی دەستگیرکردن و بەدناوکردن دژی کورد و بزوتنەوە سیاسیە ساواکەیان ئەنجامدا. وێنەی کوردی، کە لەو

ماوەیەدا کێشابوو، بەدرێژای ساڵانی حەفتاکان سیاسەتی حکومەتی بەرامبەر کورد گەیاندو بەهەمان شێوەش بۆ رای گشتی ناسیۆنالیزمی عەرەبی تا ئەمڕۆ هێزێکی بەتوانایە لە سووریا، هەروەها وەك دەوڵەتێکی رەسمی و بانگەشەیەکی شەرعیەت پێدەر کە لە ژێرەوە کورد وەك هەڕەشەیەکی بەهێز دەبنێت، بۆیە بە هەمان شێواز بەردەوامە.

هەستانەوەی نەتەوەیی کورد لە سووریا کە بەسەرکوتکاری دەوڵەت دژی کورد جۆشدراوە و بە راپەڕین و بزوتنەوە سیاسیەکانی ناوچەکانی کوردستانی تورکیا و عێراق و ئێران لە نیوەی یەکەمی ساڵانی دوای ١٩٠٠، بووە هۆی ئەوەی پارتی دیموکراتی کوردستان - سووریا بە رەسمی لە مانگی تەموزی ساڵی ١٩٥٧دا دابمەزرێت.

ئەم حیزبە سیاسیە کوردییە دەیویست نوێنەرایەتی بکات و لە رووی کولتووری و پەروەردەییەوە کورد بەرەوپێشەوە ببات، هەروەها لە بەرامبەر ئەو هەستی دژە کوردەدا کە لەناو دەوڵەت و خەڵکدا گەشەی دەکرد، بووەستێتەوە. گەشەسەندنی ناسیۆنالیزمی کوردی و هەوڵەکانی کورد بۆ پاراستنی ناسنامەیان، وایکرد وەك بەرهەڵستکاری ئامانجەکانی یەکێتی عەرەب ئەو گەشە کولتوورییەی ناسیۆنالیزمی عەرەب و حکومەتە عەرەبیەکان کاریان بۆ دەکرد ببنرێت. ئەمەش لە بەرامبەردا ترسی عەرەبی لە نیازی سیاسی کورد لە سووریادا زیادکرد، بەتایبەتی لەبەر ئەوەی وشەی کوردستان لەناوی حیزبەکەدا هاتووە.

پاشان کوردی سووریا و ئەو بزوتنەوە سیاسیەی پێکیان هێنابوو بوونە ئامانجی سەرکوتکاری هەریەك لە دەوڵەت و هەندێك لایەنی تری دانیشتوانی عەرەب. هەڵمەتی پڕوپاگندەی دژ بە کورد، ناسیۆنالیزمی کوردییان بە زایۆنیزم و ئیمپریالیزمی رۆژئاواوە دەبەستەوە، هەروەك کوردیان وەك خیانەتکار و جوداخواز وێنا دەکرد. ئەفسەرە کوردەکان لە سوپا دوورخرانەوە و ئەندامانی رێکخراوە سیاسیە کوردەکان دەستگیر دەکران و دەدرانە دادگا.

دەربڕینی ناسنامەی کولتووری کوردی، وەك قسەکردن بە زمانی کوردی و گوێگرتن لە مۆسیقا و گۆرانی کوردی قەدەغەبوون و تۆمارکردنی گۆرانی و بڵاوکراوە کوردییەکان، لەلایەن دەسەڵاتی سووریاوە دەستیان بەسەردا گیرابوو، لەگەڵ ئەوەشدا

خاوەنەکانیان و دابەشکارانیش دەستگیردەکران.[٧١] لەگەڵ بەرزبوونەوەی ئاستی ناسیۆنالیزمی عەرەبیدا، کورد بوونە ئامانج و هێرشی رەگەزپەرستانە لەلایەن هەریەك لە خودی رژێم و خەڵکی عەرەبەوە دەکرایە سەریان.[٧٢]

وەك سەرنج درابوو، یەکێتی سووریا لەگەڵ میسری جەمال عەبدولناسردا لەساڵی ١٩٥٨، نزیکبوونەوەیەکی ناچاری بوو، وایکرد سووریا بۆ ماوەیەك بکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی دەرەکییەوە، کە بەشێوەیەکی کاریگەر حوکمی میسری بوو. ناسرییە فەرمانڕەواکان هەمان ئەو ریفۆرمی زەوی و پرۆگرامی دابەشکردنەی کە لە میسر کاری پێدەکرا، بەسەر سووریاشدا سەپاندیان. هەموو حیزبە سیاسیەکان قەدەغەکران و زۆربەی حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکانیش بە زۆر رەوانەی ژێرزەمینەکان کراون. لە ماوەی (کۆماری یەکگرتووی عەرەبی)دا هەڵمەتێك لەدژی کۆمۆنیست[٧٣] و کوردەکان بەرپاکرا. لە ساڵی ١٩٦٠دا، لەو هەڵمەتەی، کە بە (هەڵمەتە گەورەکە) ناسرابوو، لەدژی کورد ئەنجامدرا،[٧٤] عەقید سەراج رابەریی سەرکوتکردنی جوڵانەوەی سیاسی کوردی دەکرد، کە لەژێر رابەرایەتی پارتی دیموکراتی کوردستانی سووریادا (حیزبی)بوو، سەدان ئەندام و هاوکارانی حیزبەکە و ٣٦ ئەندامی سەرکردایەتی دەستگیرکران. سەرکردایەتی حیزبەکە لە زیندانی (مەزە)ی دیمەشق زیندانی کران و پاشان بە تۆمەتی هەوڵدان بۆ پارچەپارچەکردنی خاکی سووریا و ئەندامبوون لە رێکخراوێکی سیاسی نایاسایدا دادگایی کران. ئەوە ماوەیەکی زۆر نەبوو پێش ئەوەی حیزبەکە وشەی کوردستانی لە ساڵی ١٩٦٣دا لە ناوەکەی خۆی لابرد و گۆڕی بە (حیزبی دیموکراتی کوردی- سووریا) (ئەلحیزبی) ئەوەش وەك هێمایەك بۆ ئەوەی حیزبەکە بەرگری لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی ناکات، کە ناوچە کوردییەکانی

---

[٧١] ماکدۆوەڵ ١٩٩٨: ١٦-١٧

[٧٢] ئەحمەد ٢٠٠١: ٦٨

[٧٣] هەروەها حیزبی کۆمینیستی سووری بریارێکی گەورەی دەرکرد کە ببێ بە حیزبێکی سیاسی کوردی، لەوەشەوە بەناو کورددا بڵاوبووەوە و باسی یەکسانی و ئازادی جەماوەری چەوساوەی دەکرد...هتد. سەرۆکی پێشوویان خالد بەگداش بوو( کۆچی دوایی کردووە) کە کورد بوو. لە ١٩٥٠ بەدواوە ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان بەهۆی جیاوازی بیروباوەڕی نیشتمانپەروەری و شوعییەوە وازیان لە حیزبی کۆمینستی سووری هێنا. لایەنە کوردیە سەرەتاییەکان لەژێر کاریگەری زۆریدا بوون و زۆریان بەردەوام بوون.

[٧٤] ئەحمەد ١٩٨٨: ٤٣

سووریا بگرێتەوە. ئیدی لەو کاتەوە هیچ حیزبێکی کوردی لە سووریا ناوی (کوردستان)ی لە ناونیشانی حیزبەکەدا بەکارنەهێناوە.

سەرەڕای هەڵمەتەکانی پڕوپاگەندە لە دژی کورد و هەڵمەتەکانی دەستگیرکردنی هەڵسوراوانی سیاسی کورد لە کاتی فەرمانڕەوایی جەمال عەبدولناسردا، دەسەڵات بە تۆمەتی بەرپرسیارێتی لە مردنی ۲۸۰ منداڵی قوتابخانەیەکی کوردی لە سینەمایەکی شارۆچکەی عامودەی حەسەکە لە ۱۹٦۰/۱۱/۳۰ تاوانبارکرا. منداڵانی ئەو قوتابخانەیە بۆ بینینی فلمێك لە بارەی ڕاپەڕینی جەزائیر بانگهێشتی سینەما کرابوون. باوەڕ وابوو کە ئەو ئاگرەی لە سینەماکەدا کەوتبووەوە و مردنی نزیکەی هەموو منداڵەکانی لێکەوتەوە، بەئەنقەست ئەنجام درابوو.[۷٥] هەروەك ئەوە ڕاگەیەنرابوو کە ستافی بەڕێوەبردنی سینەماکە لە کاتی کەوتنەوەی ئاگرەکەدا بینای سینەماکەیان بەجێهێشتووە و دەرگای سینەماکەشیان لە دەرەوە کلۆم کردبوو. هەر کەسێك لە هێرش بۆ سەر ئەو سینەمایە بەرپرسیاربێت، وادەردەکەوێت کە ڕووداوەکە بە هەستی دژەـکورد جۆش دراوە.

ڕووداوی ناوچەکانی کوردستانی دراوسێش کاریگەری لەسەر هەڵوێستی سووریای عەرەب و دەوڵەتیش بەرامبەر بە کوردی سووریا هەبووە. لە ساڵی ۱۹٦۱دا حیزبی دیموکراتی کوردستان بە سەرۆکایەتی مستەفا بارزانی[۷٦] ڕاپەڕینێکی لە کوردستانی عێراق بەرپاکرد و داوای ئۆتۆنۆمی بۆ کورد دەکرد.

سەرەڕای ترسی جوداخوازی کە ئەم ڕاپەڕینە لەناو سووریادا بەرپای کرد، باوەڕیش وابوو، کە ئەو بزوتنەوەیە پشتیوانی لە ئیسرائیلەوە وەرگرتبێت. ئەمەش ترسی لە خیانەتکاری کورد و بەکارهێنانی کورد لە سووریا وەك ئامرازێك بۆ دەستێوەردانی دەرەکی و کۆکردنەوەی زانیاری لەبارەی کاروباری ناوخۆیی سووریا زیاتر کرد، لە ئاکامیشدا ئەو ڕەنگدانەوەیەی زیادکرد کە کورد پێویستە وەك هەڕەشەیەك بۆسەر سەروەری ئاسایش و یەکپارچەی سووریا دابنرێت.

---

[۷٥] بە هەمان شێوە ئاگر لە بەندیخانەی حەسەکە، لە ۲٤/ ۱۹۹۳/۲دا ۷۳ لاوی کوردی کوشت، لەو بڕوایەدان کە بە دەسیسەی دەوڵەت بەرپابووە. بەڵام دەوڵەت بۆ داپۆشینی ئەوە پێنج لاوی کوردی دەستگیر کرد و لەداری دان بە تاوانی ئەوەی کە بەرپرسن لە کردنەوەی ئەو ئاگرە.

[۷٦] مەلا مستەفای بارزانی سەرۆکی خێڵە کوردیە یەکگرتووەکان و سەرۆکی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان، دوای ئەوەی کۆچی دوایی کرد، مەسعود بارزانی کوڕی شوێنی گرتۆتەوە.

کۆماری یەکگرتووی عەرەبیی لە ٢٨/ئەیلول/١٩٦١دا لەلایەن (چەپەکانەوە) بە رابەریی عەقید (عەبدولکەریم نەهەلاوی) کە ئەردەن و سعودیەی عەرەبی و کۆمیسیۆنی بازرگانیی نارەزایی سووریا پشتیوانیان دەکرد، کۆتایی پێهات.[٧٧]

بۆ یەکەم جار سووریا وەك کۆمارێکی عەرەبی راگەیەنرا. ئەوەش بەشێوەیەکی سروشتی بەلای کوردەوە لە باربەری هیواکانی دانپێدانانی نەتەوەیی و یەکسانی بوو لە سووریادا. کورد دووچاری هەڵمەتی پڕوپاگندەی نوێ بوونەوە، کە بانگەشەی (پاراستنی رەگەزی عەرەبییان لە ناوچەی جەزیرە) و (جەنگ لەدژی هەرەشەی کورد) دەکرد.[٧٨] لە ساڵی ١٩٦٢دا حکومەت سەرژمێرییەکی لە پارێزگای حەسەکە ئەنجامدا کە تیایدا نزیکەی ١٥٠,٠٠٠ هاوڵاتی کوردی لە مافی هاوڵاتی بوونی سووریا بێبەری کردو پلانی زنجیرەیەك چاکسازی لە زەویوزاردا کرد، زەویوزاری کوردەکانی بۆ عەرەبەکان زەوت کرد.[٧٩]

ئەم سیاسەتانە بناغەی پرۆگرامی بەعەرەبکردنیان پێکهێنا، کە ئامانجی جیاکردنەوەی کوردی سووریابوو لە هەوڵەکانی تورکیا و عێراق و گۆڕینی کارەکتەری دیمۆگرافی ناوچە کوردییەکان بوو تا عەرەب زۆرینە پێکبهێنێت.

---

[٧٧] سیل ١٩٨٨: ٦٧

[٧٨] هیلال ١٩٦٣: ٤٠.

[٧٩] ئەوانە تا ١٩٧٣ جێبەجێ نەکران، لەژێر فرمانڕەوایی حافز ئەسەددا. بڕوانە بەشی چوارەم.

## کودەتای حیزبی بەعس (١٩٦٣)

دوابەدوای کۆتایهێنانی کۆماری یەکگرتووی عەرەبی لە سووریا لە ساڵی ١٩٦١دا، سەردەمێکی ململانێی ئاڵۆز لە نێوان حکومەتی ئەو کاتە کە(لە پیاوماقوڵە شارنشینەکان پێکهاتبوو) و کۆمیتەی سەربازی، لەناو کۆمیتەی سەربازیشدا لە نێوان بەعسیەکان و ناسرییەکاندا دروستببوو، کە دواجار حیزبی بەعس لە ساڵی ١٩٦٣دا دەسەڵاتی گرتە دەست. حیزبی بەعسی سووری لە ساڵی ١٩٤٧دا دامەزراوە، حیزبێکی شۆڕشگێرانەیە و لەسەر بنەماکانی ئایدۆلۆجیای چەپ دروستبووە، کە کاری بۆ چاکسازی سۆشیالیستی سیستمی سیاسی سووریا و کۆتایی هێنان بە قۆرخکردن و دەستێوەردانی دەسەڵاتی ئیمپریالیستی دەرەکی کردووە، هەروەها حیزبەکە پشتی بە بنەما ناسیۆنالیستیەکان بەستووە و پاڵەوانێتی یەکگرتووی دەوڵەتە عەرەبییەکانی کردووە.

بە درێژای ساڵانی چل و پەنجاکان یەکەی ئەفسەری سوپا بە توندی تێکەڵی سیاسەت کراوە و وردە وردەش لەلایەن چینی جوتیاری گوندنشینەوە دەستی بەسەردا گیراوە، کە بۆ ئەوان خزمەت و خوێندنی سەربازی هەلێك بووە بۆ راکردن لە دۆخی هەژاری و پەراوێزخستن و تێکەڵ بوون لەگەڵ کۆمەڵگە.[٨٠]

ئەمەش بە تایبەتی لاوانی عەلەوی[٨١] راستە کە بەلێشاو پەیوەندییان بە هێزەکانی سوپاوە دەکرد. حیزبی بەعسی عەرەبی سووریا کاری بۆ ئەوە دەکرد کە نوێنەرایەتی ئەو چینە کۆمەڵایەتییانە بکات و بە شێوەیەکی بەرچاو لەلایەن عەلەویەکانەوە دەستی بەسەردا گیرابوو.[٨٢] کودەتاکە، کە بەعسی لە ساڵی ١٩٦٣دا هێنایە سەرحوکم، لەلایەن یەکە ئەفسەرییەکانەوە هان و جۆش درابوون.

---

[٨٠] جۆرج ٢٠٠٣: ٦.

[٨١] عەلەوی رێبازێکی ئاینییە و حافز ئەسەد و بەشاری کوڕی سەر بەو رێبازەن و عەلەوییەکان لە چیاکان و دەشتایەکانی ناوچەی رۆژئاوای سووریا نیشتەجێن. ئەو شارانەی ئەوانی تێدا نیشتەجێن لازقییە و تەرتوسە.

[٨٢] بە فەرمی ئەوە بەناوی شۆڕشەوە ناسراوە، کە بڕیاربوو هێشتا بەردەوام بێت، ئامانجەکانی وەك ئەوەی نەتەوەی عەرەب بناسرێتەوە و بخرێتە دەستووری ١٩٧٣ەوە وەك یەکێتی و سەربەستی و یەکسانییەوە. بڕوانە پێشەکی دەستووری کۆماری عەرەبی سووری.

جێگریشی دڵنیاکردەوە، ئەو پێهاتانەی دامەزرێندران ئاکامی قوڵیان بۆ کوردی سووریا هەبوو. بەشی داهاتووی ئەم کتێبە باسی ئەوە دەکات چۆن پێکهاتەکانی دەوڵەت مامەڵە لەگەڵ دۆخی مافە گشتییەکانی مرۆڤ دەکەن، کە دەوڵەت و پێگەی کورد لە دەوڵەتدا دەناسێنێت.

لە هەمان کاتدا محەمەد تەڵەب هیلال ئەفسەر و(سەرۆکی ئاسایشی ناوخۆی پارێزگای حسەکە) لە کاتی حوکمی حیزبی بەعس لە ساڵی ١٩٦٣دا، راپۆرتێکی نهێنی لە بارەی مەسەلەی کورد لە جزیرە ئامادەکرد.

راپۆرتەکە، ناونیشانەکەی (لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی لایەنە نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانی پارێزگای جەزیرە)وە بوو، هێرشێکی نەژادی ئاشکرابوو بۆ سەر کورد، چونکە بە وردی باسی لەو هەڕەشانە کردبوو کە بە بڕوای ئەوان کورد بۆ سەر سووریا دروستیان کردبوو.

سەرەڕای ئەو راستییەی کە محەمەد تەڵەب هیلال، کوردی وەك «خەڵکانێکی شاخاوی و توندوتیژ» و دوور لە شارستانی و مێژوو و زمان و رەچەڵەکی نەژادی وەسفکردووە،[٨٧] کورد وەك گروپێکی نەژادی تەواو جیاواز، کە جوداخواز و توندوتیژە بەرامبەر بە عەرەب[٨٨] دەبینرێت و وەك هەڕەشە بۆ سەر یەکێتی دادەنرا، هەر ئەو کوردەی وەك کۆمەڵە خەڵکێك وەسفکردووە، کە بە هۆی ئایدیای نەژادی کوردی و نیشتمانی کوردیەوە یەکیانگرتووە و وەك چەکێك لە دژی عەرەب بەکاردەهێنرێن.

هیلال لەو بڕوایەدا بوو کاتێ ئەوان بە رووالەت وا پیشان دەدەن کە دڵسۆزن بۆ دەوڵەت، بەکارهێنانی زمانە کوردیەکەیان لەخۆیدا پلان و دەسیسەیە بۆ بێ دەسەڵات کردنی عەرەب و بنیاتنانی نیشتمانێکی کوردی،[٨٩] کە بەراوردی دەکرد بە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیلی. لە راستیدا لای هیلال جیاوازی نییە لە نێوان (جولەکەستان) و کوردستاندا،[٩٠] کوردی جەزیرەی سووریا و ئەوانەی عێراق، بە هەڕەشەیەکی سەرەکییە دادەنرێت، کە لەم ناوچەیەدا بەرەورووی سووریا دەبێتەوە.[٩١]

---

[٨٧] هیلال ١٩٩٣: ٤-٥

[٨٨] هیلال ١٩٩٣: ٢٤

[٨٩] هیلال، ١٩٦٣: ٢٦-٢٨

[٩٠] هیلال، ١٩٦٣: ٤٠

[٩١] هیلال، ١٩٦٣: ٢٤

کودەتای بەعس لە ٨/ ئازاری/ ١٩٦٣دا بووە هۆی گۆڕینی کاراکتەری سیاسی و کۆمەڵایەتی دەوڵەت و بنکەکانی دەسەڵات. دەستەبژێرێکی بچوکیان لە سەرباز و خەڵکانی گوندنشین و شارۆچکەکانەوە هێنا و جێگەی ئەوانەیان پێگرتەوە، کە لەساڵی (١٩٤٦)ەوە دەستیان بەسەر سووریادا گرتبوو.[٨٣]

دەسەڵات گرتنە دەست لەلایەن حیزبی بەعس لە ساڵی ١٩٦٣دا، بووە هۆی بەرهەڵستی کردن لەلایەن سوننە شارنشینەکان و خەڵکانی چینی ناوەندەوە،[٨٤] هەروەك سەردەمی بەر لە هاتنی حافز ئەسەد بە دوو ململانێی هێزی ناوخۆ دەستی بەسەردا گیرابوو. یەکەمیان بیرمەندانی دیمەشق، لەوانەش داڕێژەرانی ئایدۆلۆجیای بەعس و دامەزرێنەری حیزبەکە (سەلاح بیتار) و (میشێل عەفلەق) کە لە چەند ساڵی یەکەمی فەرمانڕەوای حیزبی بەعسدا سەرکردایەتی حیزبەکەیان کرد، بەهۆی کودەتایەك لە ساڵی ١٩٦٦دا دوور خرانەوە.

کودەتاکە لەلایەن گروپێکی چەپی سەربازی و مەدەنی بەعسیەوە سەرکردایەتی کرا، ئەوانەی رێکیاخست لە دەوری (سەلاح جەدید) بوون، لە نێویاندا حافیز ئەسەد و محەمەد عومران بوون کە رابردوویەکی چینی ناوەندی جوتیاربیان هەبوو.[٨٥] دووەمیان ململانێیەکی دەسەڵات لەنیوان حافز ئەسەد و سەلاح جەدید کە هەریەکەیان بەجیا نوێنەرایەتی کۆمیتەی سەربازی و فەرماندەی هەرێمی حیزبی بەعسیان دەکرد. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە حافیز ئەسەد لە رێگەی کودەتایەکی سەربازییەوە لە ١٩٧٠/١١/١٦ دا دەسەڵات بگرێتە دەست و بەشێکی زۆری دەسەڵاتی حیزبەکەی لە کەرتی مەدەنی پاك بکاتەوە.[٨٦]

کودەتای حافز ئەسەد ساڵی ١٩٧٠، کە بە رەسمی بە (بزوتنەوەی راستکردنەوە) ناسراوە، سەرلەنوێ پێکهاتەی سیستمی سیاسی سووریای گۆڕی، دەوڵەت کۆنترۆڵی بیناکردنەوەی کرد و کۆنەکانیشی گواستەوە. ئەم پرۆسەیە بناغە و بنەچە و پێکهاتەی سیستمی زۆردارەکی گۆڕی و دەوڵەتی بەهێز کرد و ئاسایش و

---

[٨٣] پێرتس ١٩٩٥: ٣٦-٣٧. سیزەر ٢٠٠١: ٧.
[٨٤] سیزەر ٢٠٠١: ٧.
[٨٥] پێرتس ١٩٩٥: ٣٧ .
[٨٦] دام ١٩٩٦: ٦٨.

لێکۆڵینەوەکە لە دوانزە خاڵدا کورت کرایەوە بۆ مامەڵەکردنی کوردەکانی ناوچەی جەزیرە.

ستراتیجی پلانەکە بەم شێوەیەی لای خوارەوە بوو:

- گوێزانەوە: هەڵکەندنی کوردەکان لە شوێنی خۆیان و بڵاوەپێکردنیان بەناو سووریادا. هەروەها دەبێت چاودێری هەڵسوکەوتیشیان بکرێت.

- سەرکوتکردنی پەروەردە و فێرکردن: چۆنیەتی ئەم خاڵە ئەوەیە، کە نابێ لە ناوچە کوردیەکاندا قوتابخانە و پەیمانگاکان بکرێنەوە، تەنانەت ئەگەر دامەزراوەی عەرەبیش بێت.

- راستکردنەوەی تۆماری شارستانی[92] و دەرکردنی کوردەکان بەبێ رەگەزنامە لە سووریا: هیلال ئەوە دەنوسێت کە ئەگەر کوردەکان بەڵگەی رەگەزنامەی سووریایی نەبێت، دەبێت بیانگەڕێننەوە بۆ ئەو وڵاتەی لێوەی هاتووە. لێکۆڵینەوەکە دەڵێت: کە زۆربەی کوردەکانی جەزیرە رەگەزنامەی تورکییان هەیە، یان زیاد لە رەگەزنامەیەکیان هەیە، لەبەر ئەوە دەبێ دەست بەجێ ئەو کوردانە دەربکرێن. هەروەها پێویستە بۆ دڵنیابوون لە راستی و دروستی رەگەزنامەی کوردی سووری لێوردبوونەوە بکرێت و بەتایبەتی ئەو کەسانەی مەترسیدارن دەبێت دەربکرێن.

- بۆ رێگرتن لەبەردەم کارکردنی کوردەکاندا: هیلال پێشنیاری ئەوە دەکات، کە هەلی کارکردن لە کوردەکان قۆرخ بکات، تاکو ئەوان لەم بارودۆخە نالەبارەدا بێ توانای کارکردنیان نابێت و مەترسیداریشە. ئەوە ریفۆرمی کشتوکاڵیش لە جەزیرە دەگرێتەوە و رێگری لە کورد دەکات بۆ بەکرێدان و کڕینی خانوبەرە یان ئیشوکارێك، کە ئەوەش لە ئەنجامدا کوردەکان بەرگەی ناگرن و ناچاردەبن بەجێی بهێڵن.

---

[92] هیلال تێبینی ئەوە دەکات کە سیجلاتی باری شارستانی لە ١٩٦٣ ەوە لەژێر کاری راستکردنەوەدایە، کاتێ لێکۆڵینەوەکەی نووسیوە. بەوەش ئەو هێما بۆ سەرژمێری حسەکە دەکات لە ١٩٦٢دا.

- هێرشی پڕوپاگانده دژی کورد: بۆ ئەوەی دانیشتوانی کورد ناجێگیر و مەترسیدار و لە بارودۆخێکی نائارامدا بێت، پێویستە هێرشێکی پڕوپاگانده دژی کوردەکان بە شێوەیەکی فراوان لەناو گەلی عەرەبدا بلاوبکرێتەوە.

- گۆڕینی زانایانی ئایینی کورد بە عەرەب: ناونیشانی ئایینی دەبێ لە زانایانی کورد بسێنرێتەوە و پێویستە بگوێزرێنەوە بۆ ناوەندی سووریا. هەروەها دەبێ زانایانی ئایینی عەرەب بنێرێت بۆ ناوچە کوردیەکان.

- سیاسەتی پەرتکە و زالبە(فرق تسود): واتە هاندانی کورد دژی کورد. یان بەگژاکردنی کورد، هیلال ئەم کارە بە گرنگیەکی ئاسان دادەنێ. دەبێ بارودۆخیان بەشێوەیەکی ئەوتۆ نالەباربێت تا کورد بیانەوێ خۆیان بە عەرەب دابنێن.

- نیشتەجێکردنی عەرەب لە ناوچە کوردیەکاندا: پێویستە عەرەب بەرەو ناوچە کوردیەکانی سووریا لەسەر سنووری تورکیا و عێراق بجولێت بۆ بنیاتنانی هێڵی داکۆکی بۆ داهاتوو. ئەو (واتە هیلال) پێشنیاری ئەوە دەکات کە ئەو عەرەبانە لە خێڵی شەمەر بن چاکترە، چونکە هەژارترین خێڵن لەسەر رووی زەوی، هەروەها لە سەدا سەد عەرەبن، ئیدی تا کوردەکان بەجێیدەهێڵن لەلایەن ئەمانەوە چاودێری دەکرێن.

- دامەزراندنی پشتێنەی سەربازیی عەرەب بەدرێژایی سنوور لەگەڵ تورکیادا: پێویستە ناوچەی سنووری باکووری جەزیرە بکرێتە ناوچەیەکی سەربازی بە چەشنی هێڵی بەرەنگاربوونەوە. لەم ناوچە سەربازیەدا دەبێ سیاسەتی بەعەرەبکردن پیادەکرێ و کوردەکان دەربکرێن.

- کشتوکاڵ بۆ عەرەبە نیشتەنیەکان دابمەزرێت: دەبێ کێڵگە بۆ عەرەبەکان دابمەزرێت و وەرزێرەکان مەشقیان پێبکرێ و چەکداربکرێن، هیلال پێشنیاری ئەوە دەکات کە نیشتەجێیەکانی جولەکە لەسەر سنووری ئیسرائیل نموونەی ئەم کێڵگە کشتوکاڵیانەن.

- هەرکەسێ لە ناوچەی جەزیرەدا زمانی عەرەبی نەزانێت، مافی دەنگدانی نییە و رێگریی دەکرێت، کە لە هەر ئۆفیسێکدا کار بکات.

- نکوڵی کردنی هاونیشتمانێتی هەر کەسێکی نا-عەرەب کە بییەوێت لە ناوچەکەدا بژی: نابێ رەگەزنامەی سووری بدرێ بە هەر کەسێ، بە هەر نەتەوەیەکی تر جگە لە عەرەب، کە دەیەوێت لە ناوچەکەدا بژی.

بەرئەنجامی ئەم پلانە کە لە دوانزە خاڵدا هیلال ئاماژەی پێکردووە، تەنیا بەس نییە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کوردەکان،[٩٣] بەڵام بۆ ئەوەی نوێنەرانی حکومەت بەئاگابێن و وەك تاقیکردنەوەیەك جێبەجێی بکەن و بۆ ئەوەی ببێتە رەگێکی داکوتراو بۆ مامەڵە لەگەڵ کوردەکان، لەگەڵ ئەوەی هەموو خاڵێکی بە فەرمی[٩٤] نەبووە سیاسەتی دەوڵەت، بەڵام سەرتاپا ئەم خاڵانە بەکارهات لە کۆسپ نانەبەر و رووبەڕوو بوونەوەی کورد لە سووریای ئەمڕۆدا و سەرکوتکردنیان بە شێوەیەك کە زۆر هاوشێوەی پێشنیار و بۆچوونەکانی هیلالە.

[٩٣] هیلال، ١٩٦٣: ٤٦-٤٨

[٩٤] حکومەت ئەوەی راگەیاند کە ئەوەی هیلال نووسیویە لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆیە و هەرگیز لەلایەن حکومەتەوە هان نەدراوە و کاری پێنەکراوە، بەڵام حیزبی دیمۆکراتی کوردی سووریا رایگەیاند کە ئەو لێکۆڵینەوەیە خرایە نێو دەستوور و بەرنامەی حکومەتەوە.

# باسی سێیەم
# سووریای ئەسەد
# سیستمی دەوڵەتی سووریا و کورد

ئەم بەشە باسی سیستمی سیاسی و ئابووری و یاسایی سووریا دەکات. بە کورتە باسێکی کارەکتەری سەرۆکایەتی حافز ئەسەد و بەشار ئەسەد و ئەو گوشارانەش دەست پێ دەکات کە ئەمڕۆ رووبەرووی دەوڵەت دەبنەوە. بە دوای ئەمەشدا وەسفی دامەزراوە سیاسیەکانی سووریا و پێکهاتە نارەسمییەکان و ئابووری و گەشەکردن و دامەزراوە یاساییەکان دەکات و ئاماژە بەو یاسایانەش دەکات، کە سووریا پێناس دەکات و بارودۆخی مافی مرۆڤ دادەرێژێت. سەرئەنجام ئەم بەشە لە رێی تەوەرێکەوە سیاسەتی کەمایەتیەکان لە سووریادا دەخاتەروو. تەماشاکردنی ئەم لایەنانەی کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتی سووریادا دادەرێژرێت و بناغەی بەشی دووەمی باسەکە، کە تایبەت دەبێت بەشێوەی سەرکوتکاری لە دژی کورد، دیاری دەکات. ئامانجی ئەم بەشە نیشاندانی ئەو راستییەیە کە سەرەڕای ئەوەی سووریا دەوڵەتێکی زۆرەملییە و هەموو خەڵکەکەشی بوونەتە کەرەستەی ئەو، بەڵام کورد لە چوارچێوەی کۆمەڵگەی سووریدا پێگەیەکی جیاوازی هەیە، کە بەهۆی شوناسی نەتەوەیی و نەژادییانەوە بوونەتە بابەتی سەرکوتکاری و چەوسانەوە.

حافز ئەسەد لە ساڵی ١٩٧٠ تا رۆژی مردنی لە ساڵی ٢٠٠٠دا حوکمی سووریای کرد. حوکمەکەی بە حوکمێکی دیکتاتۆری ناسرابوو.[٩٥] تەنانەت دوای مردنیشی وێنە و ناوەکەی بە زۆربەی دامەزراوە دەوڵەتییەکانی سووریا و شەقام و مەزار و دوکان و جامی ئۆتۆمبێلەکان بە چاپکراوی دەبینرێت. ئەو کەسایەتیەی بۆ حافیز ئەسەد کێشراوە، بە سەرکردەیەکی نەمرو باوکی سووریا و پاڵەوانی عەرەب

---

[٩٥] بڕوانە Heydemann ،١٩٩٩ Hinnebusch ،١٩٩٠، Perthes و١٩٩٥

دەناسێنێت، کە دڵسۆزی خۆی کردووەتە فەرمان بۆ گەلەکەی. خودی ئەسەد خۆی زیاتر لە حکومەت و پەرلەمان و حیزبی بەعس یان کۆمەڵەی مەدەنی پەیوەندی بە داهاتووی سووریاوە هەبوو. سووریای ئەمڕۆ ئەوەیە کە حافیز ئەسەد دروستی کردووە.

ئەسەد ئەفسەرێکی سەربازی عەلەوی بووە لە ناوچەی لازقیەی سووریاو لە کاتی حوکمی بەعسدا، ساڵی ١٩٦٤ بووەتە فەرماندەی هێزی ئاسمانی و لە ساڵی ١٩٦٦دا وەزیری بەرگری بووە. کاتێك ئەسەد لە ساڵی ١٩٧٠دا دەسەڵاتی گرتە دەست، وادەبینرا کە جێگەی رژێمێکی رادیکاڵ و بێزراو بگرێتەوە.[٩٦] بەڵام بەدرێژای سی ساڵی سەرۆکایەتیکردنی، ئەسەد بەشێوەیەکی توند حوکمی سووریای کردووە.

لە پێناوی بەهێزکردنی دەسەڵاتی و دڵنیابوون لەوەی کە هیچ پێکۆڵێك (تەحەددا) بۆسەر حوکمەکەی گەشە ناسەنێت، ئەسەد سروشتی حیزبی بەعس و دەوڵەت و دامەزراوەکانی دارشتەوە. هەروەك وازی لە زۆربەی بانگەشە رادیکاڵ و سۆشیالیستەکانی حیزبی بەعس هێناو پشتیوانییەکی فراوانی جەماوەری لە رێگەی چاکسازی ئابووری و سیاسییەوە دامەزراند.[٩٧] ئەو پێکهاتەی سیاسی سووریای جێگیر کردو دەوڵەتی وەك کارەکتەرێکی ئۆتۆنۆمی و دەستێوەردەر دامەزراند، نەك وەك بەو شێوەیەی لە لایەن هێزە کۆمەڵایەتییەکانەوە دەستی بەسەردا بگیرێت.[٩٨]

دامەزراوەکانی دەوڵەت فراوان و بەهێزکران و کارامەتر بوون. ئەو کۆنترۆڵەی بەسەر سیاسەتی ناوخۆی سووریادا هەیبوو، رێگەی پێدا سووریا وەك لایەنێکی هەرێمی چالاك و توند دابمەزرێت، نەك بەو شێوەیەی رابردوو کە بوو بووە کەرەستەی بەرژەوەندی و پلانی بەهێزترەکان.[٩٩]

حافز ئەسەد بڕیاردەرێکی بەئاگاو کردەیی بوو، کە رێگری لە مەترسیەکان لە ئاستی ناوخۆ و دەرەوەدا کرد. بەشێکی زۆری دەسەڵاتەکەی پشت ئەستور بوو بەو دڵسۆزییەی خەڵکان و ئەندامانی بنەماڵەی عەلەوی بەرامبەر ئەو هەیانبوو، کە هەموویان لە رژێم و سوپادا پێگەی ستراتیجیان هەبوو.

---

[٩٦] سیلە ١٩٨٨: ١٦٩
[٩٧] هەمان سەرچاوە
[٩٨] پێرزس ١٩٩٥: ٣
[٩٩] پێرزس ١٩٩٥: ٤

ئەسەد رێی لە هەموو ئەو تۆمەتانە گرت، کە پەیوەندییان بە مەسەلەی مەزهەبگەرییەوە هەبوو، ئەویش بەهۆی دروستکردنی هەماهەنگی لەنێوان سوننەی زۆرینە و کەمایەتیەکانی تر لەناو حیزبی بەعس و دامەزراوە حکومی و دەوڵەتیەکانی تردا. هەرچەندە حافیز ئەسەد ئەندازە جیاوازەکانی کۆمەڵگەی سووری لە دەسەڵاتی خۆیدا کۆکردووەتەوە، بەڵام خۆی بەئایدیا و هەستی عەرەبی جۆشدرابوو، کە بەلایانەوە سووریا و وڵاتە عەرەبیەکانی تر بەدەستی هێزەکانی ئیسرائیل ساڵی ١٩٦٧ بە شێوەیەکی ناپەسەند سوکایەتییان پێکراوە.

کاری سەرەکی سیاسەتی دەرەوەی ئەسەد بریتی بوو لە خەباتکردن دژی ئیسرائیل و بەهێزکردنی پێگەی عەرەب، تەنانەت ئەگەر بەشێوەیەکی کاتیش کاریگەری نێگەتیڤی لەسەر ئامانجی ناوخۆیی گۆڕانی سۆشیالیستی هەبووبێت. شەرعیەتی گرتنەدەستی دەسەڵات پشتی بە بنەماکانی یەکێتی نیشتمانی و ناسیۆنالیزمی عەرەب و دژە زایۆنیزم بەستووە، کە وایکردووە سیاسەتی دەرەوەی سووریا بە شێوەیەکی زۆر لە ئاستی ناوخۆیدا بێت. بەکارهێنانی بانگەشەو هاشەوهوشەی عەرەبی جیاکاری نەتەوەیی لە نێوان کورد و عەرەبی سووریادا قوڵکردەوە و کوردیشی رووبەڕووی توندوتیژی زیاتر کردەوە.

لە سەرەتادا کورد وەك هەڕەشەیەك بۆسەر یەکێتی نیشتمانی دەبینرا و پاشان و کاتێك کورد شوناسی نەتەوەیی خۆی دەربڕی و داوای یەکسانی نەتەوەیی کرد، بەردەوام وەك هەڕەشە بینراون. حافز ئەسەد لە ٢٠٠٠/١/١٠دا مرد، لە چەند رۆژی دوای مردنیدا دەستووری سووریا هەموارکراو ئەو تەمەنەی بۆ کاندیدی سەرۆکایەتی وەك مەرج دانرابوو، لە ٤٠ ساڵیەوە بۆ ٣٤ ساڵ کەم کرایەوە.

ئەمەش وایکرد بەشار ئەسەدی کوڕی کە تەمەنی ٣٤ ساڵ بوو، بۆ سەرۆکایەتی دەستنیشان بکرێت. لە مانگی حوزەیرانی/ ٢٠٠٠دا بەشار ئەسەد بەهۆی ریفراندۆمێکەوە، کە هیچ بەرهەڵستیەك نەکرا، بەتێرمێکی حەوت ساڵی وەك سەرۆك هەڵبژێردرا. بەشار ٩٧,٢٧٪ دەنگەکانی بەدەستهێنا.[١٠٠] هەرچەندە لەگەڵ دەسەڵات گرتنە دەستی بەشار ئەسەددا پێکهاتەکانی دەوڵەت و دامەزراوە و سیفاتەکانی

---

[١٠٠] ئەمەش بەپێی سەرژمێری فەرمیی سووریا.

دەوڵەت گۆڕانیان بەسەردا نەهات، بەڵام سەرۆکایەتی ئەو لە ئاستی ناوخۆ و دەرەوەی سووریادا گوشاری زۆری بۆ ریفۆرم کردن لەسەر بوو. کاتێك بەشار ئەسەد بەدوای باوکیدا سەرۆکایەتی سووریای گرتەدەست، زۆربەی دانیشتوانی سووریا و چاودێرانی رۆژئاوا ئومێدەوار و چاوەڕوانی گۆڕان و ریفۆرمی دیموکراتی بوون. رابردووی ئەم پزیشکی چاوە گەنجە تەکنۆکراتە، کە خوێندنی باڵای لە بریتانیا تەواوکردووە، وا چاوەڕوان دەکرا، کە لە باوکی و سەرۆکەکانی پێشووتری سووریا بەگرنگیەوە جیاواز بێت.

بەشار چەند خولێکی راهێنانی لە بواری سەربازیدا بینیوە، کە بەزۆری لەو ماوەیەدا بوو باسل ئەسەدی برا گەورەی بە رووداوی ئۆتۆمبێل گیانی لەدەستدا و ئەمیش بووە میراتگری ئاشکرایی باوکی. ئەو ئازادکردنەی کە بەزۆری چاودێران چاوەڕێی بوون، بەخاوی رێی دەکرد، یان لە بازنەی ئابووریدا لە قاڵبدرابوو، ئازادیی سیاسی بە سەرکوتکراوی مایەوە. هێشتا ئاشکرانییە ئەو بواری دەسەڵاتی سیاسییەی کە لە دەست ئەم سەرۆکەدایە، چەند و چۆن پاسەوانە کۆنەکان لەناو دەزگای جێبەجێکردندا رێگری لە ریفۆرم دەکەن. رای جیاوازی لە بوارەکانی دەسەڵات و حوکمی بەشار ئەسەد لە سووریا دەربڕراوە.

لە سەرەتای دەستبەکاربوونیەوە، ئەو تیۆرانەی جەختیان لەسەر ئەو ئایدیایە دەکردەوە گەشەیان سەند، کە بەشار لەلایەن پاسەوانە کۆنەکانی رژێمەکەی باوکیەوە ناچارکراوە، کە تەنیا خەمی ئیمتیازاتەکانی خۆیان بووە و ئێستاش لە دەسەڵاتی سووریادا بەشی شاهانەیان هەیە. خاڵە ناکۆکەکانی سیاسەتی سووریا و ریفۆرمی ناوخۆ وەك ئاکامی ململانێی دەسەڵات لەنێوان پاسەوانە کۆنەکان و ریفۆرمیستە نوێکان بینراوە. لە ئەمریکا پێگەی لێپرسراوانی ئیدارەی بوش بە تێپەڕبوونی کات توندبوون. لە سەرەتادا بەشار ئەسەدیان وەك کەسێکی کەم ئەزموون دەبینی و دواتریش ئەو بۆچوونەیان هەبوو، کە بەشار زیاتر پابەندە بە ئایدۆلۆجیای پان _ عەرەبەوە وەك لەوەی کە لەسەرەتادا دەردەکەوت، هەروەك بەرامبەر ریفۆرمی سیاسی و ئابووری کەسێکی توندوتیژ بوو.[101] هەردوو تیۆرەکە لە رادەبەدەر ئاسان کرابوون و

[101] کۆمەڵەی کێشەی جیهانی ٢٠٠٤: ٥

شارەزایانی بوارەکە ئاماژەیان بەوە دەکرد، کە ئەو جیاکارییەی لەنێوان پاسەوانە کۆن و نوێکاندایە، بەشێوەیەکی ئاشکرای جیاکاری نییە لە نێوان پارێزگاران و ریفۆرم خوازەکاندا.

بەشێکی زۆری بەرژەوەندیەکانی ئەم دوو گروپە هاوکات و بەیەکدا چوون.[١٠٢] لەکاتێکدا بەشار خوێندنی بالآی لە رۆژئاوا تەواوکردووە، بەلآم پێگەی ئەو لە دەسەلآتدا بەندە بەو رژێمەی کە ئەمی بەرهەم هێناوە و پەروەردەی سیاسیشی بە تەواوی بەعسیانەیە.[١٠٣] لە هەمان کاتدا بەشار ئەسەد لەوە ئاگادارە، کە جێگیریی دەولەت و مانەوەی رژێم پەیوەستە بە ریفۆرمی سیستمی ئابووری کەم ئەندام و ناتەواوەوە.[١٠٤]

پرسیاری ئەوەی کە ئایا دواجار ریفۆرم لە سیستمی سیاسیدا دەکرێت یان نا، پێویستە چاوەڕێی وەلآمەکەی بکرێت. لەگەل ئەوەشدا ئەگەری ئەوە هەیە کە ریفۆرمی سیاسی بەردەوام لەناو سیستمەکەدا تووشی بەرهەلستکاری بێت. وتاری دەستپێکی بەشار ئەسەد ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، کە ئەو بەنیازە لەگەل هێزەکانی ئۆپۆزسیۆندا لە ناو حکومەتدا پرۆسەی ئاشتی ئەنجام بدات[١٠٥] و ئازادییەکی کۆبوونەوەی بێ وێنەی بەخشییە هەلسوڕێنەرانی سووریا و جەماوەرەکانیان.[١٠٦] تاقیکردنەوەی وتەکانی بەشار و توانای بۆ سەرکردایەتی کردنی پێکهاتە سیاسی و ئابووریەکانی سووریا زووبەزوو دەرکەوت، کاتێك ئۆپۆزسیۆنی سووریا سودیان لە بۆشایی بازنەی سیاسی بۆ گفتوگۆ و وتووێژ و دەربڕینی بۆچوون و رەخنە لە رژێمی فەرمانڕەوا وەرگرت. بزوتنەوەی کۆمەلی مەدەنی « بەهاری دیمەشق » کە لە هاوینی سالی ٢٠٠٠دا دروست بوو، ریفۆرمی سیاسی دیموکراتی پەرەپێدا.[١٠٧]

---

[١٠٢] کۆمەلەی کێشەی جیهانی ٢٠٠٤: ٦

[١٠٣] هەمان سەرچاوە

[١٠٤] هەمان سەرچاوە

[١٠٥] وتاری بۆنەی فەرمانڕەوایی بەشار ئەسەد، کە لە ماڵپەری وەزارەتی راگەیاندنی سووریادا هەیە.www.moi-syria.com

[١٠٦] چاوپێکەوتن لەگەل ژمارەیەك لە کۆمەلەی جولآنەوەی شارستانی سووریا، لە ئۆگۆستی ٢٠٠٢ و جون ٢٠٠٤، فەرەنسا (ناوەکان لەلایەن نووسەرەوە پارێزراون)، چاودێری مافی مرۆڤ ٢٠٠٢

[١٠٧] بۆ زانیاری تەواو لەبارەی (بەهاری دیمەشق) بڕوانە جۆرج ٢٠٠٣

ئەم کۆڕە مەدەنیانە کە لە ماڵانی خەڵکدا دەبەستران،[١٠٨] لە ساڵی ٢٠٠١دا قەدەغەکرا. ئەمانە لەلایەن چەند کەسێکەوە میوانداری دەکران کە لە نێوانیاندا سەرکردەی حیزبەکان و ئەندامانی پەرلەمان[١٠٩] و رۆژنامەنووسان و پارێزەران و ئەکادیمیەکان و بازرگانان و هونەرمەندان و فەیلەسوفان هەبوون، ئەمانە هەموو بەناوی مافی مرۆڤ و ریفۆرمی ئابووری و سیاسی، پێویستی گەشەسەندنی کۆمەڵی مەدەنی سووری خاوەن ئۆتۆنۆمی قسەیان دەکرد. دوو گروپی سەربەخۆی تایبەت بە کاروباری مافی مرۆڤ لە سووریا دووبارە کرانەوە و سکاڵاکان دەدرانە حکومەت[١١٠] و کۆمەڵەیەکی کوردی بەناوی کۆمەڵەی کولتووری جەلادەت بەدرخان لە قامیشلی دامەزراو تا مانگی ئایاری/٢٠٠١ زیندانە سیاسیەکان ئازاد دەکران. زۆرینەی ئەوانەی بەمەوە سەرقاڵ بوون، کە لەنێویاندا ئەندامانی حیزبە سیاسیە کوردەکان و رووناکبیرانی کورد هەبوون، ئومێدەوار بوون کە سەرۆکی نوێ سیستمێکی سیاسی بنیات بنێت و هانی پێشکەوتن و دیموکراسی بدات.

زنجیرەیەك لە دەزگیرکردنی پێشەنگەکانی بزوتنەوەکە لە مانگی ئابی/٢٠٠١دا بەتەواوی کۆتایی بە «بەهاری دیمەشق» هێنا. ١٠کەس هەڵسوەرێنەری بواری مافی مرۆڤ دەستگیرکران، کۆمەڵەی بەدرخان داخراو هەر زووش لە مانگی ئازاری/ ٢٠٠١دا ئەندامان و هاوکارانی دەستبەسەرکران.[١١١] لە مانگی ئابی/ ٢٠٠١ەوە چەندین هەڵسورێنەری تری بواری دیموکراسی، کە لەنێوانیاندا کوردیش هەبوون، دەستگیرکران.[١١٢] وتەکانی بەشار ئەسەد لەکاتی کردنەوەی پەرلەمان

---

[١٠٨] وەکو ئەوەی کە لە ماڵی ریاز سەیفدا لە ئابی ٢٠٠٠دا دامەزرا و بانگی هاوەڵانی کۆمەڵگای شارستانی کرد، کە لە مانگی تشرینی دووەمی ٢٠٠٠، ئیدی ئاوالابوو بۆ هەر کەسێك کە گرنگی پێدەدا. کۆڕەکان گۆڕان بە کۆڕی گفتوگۆی نیشتمانی. (سەیف حیزبی سیاسی تایبەتی خۆی لە کانونی دووەمی ٢٠٠٠دا بە ناوی جوڵانەوەی ئاشتی کۆمەڵایەتی دامەزراند.) خەرات ٢٠٠١

[١٠٩] دوو ئەندامی سەربەخۆی پەرلەمان گیران، (ریاز سەیف) بە تاوانی سوکایەتی بە دەستوور، هەروەها (مەئمون ئەلحومسی) بە تاوانی هێرشکردنە سەر دەستوور و دژایەتی دەوڵەت. هەروەها کەسانی بێگانەی ئاگادار کردووە لەوەی کە ئەندامانی ئەو کۆڕانە ئێستا لە زینداندان، چاودێری مافی مرۆڤ ٧/ئەیلول/٢٠٠١، ٢٠٠٢

[١١٠] سکاڵانامەکە بریتی بوو لە بەیانی ٩٩ و بەیانی ١٠٠٠، هەروەها بەرەو کۆبوونەوەیەکی نیشتمانی لە سووریا. بڕوانە جۆرج ٢٠٠٣: ١٧٨-١٩٣

[١١١] کادر ٢٠٠٣ : ٢٦، چاوپێکەوتن لەگەڵ کوردانی ئاوارە لە ئەوروپا ( ناوەکانی لەلایەن نوسەرەوە پارێزراوە.)

[١١٢] بۆ نموونە بڕوانە چاودێری مافی مرۆڤ ٢٠٠٢ و ٢٠٠٣، لە ٢٣/دیسەمبەر/٢٠٠٢ ئیبراهیم حەمیدی رۆژنامەنووس ئەوەی لەبارەی کوردی سووریا دەنووسێ، دووچاری تاوانباری بوو لەبارەی بڵاوکردنەوەی زانیاری هەڵە لە کانونی دووەمی ٢٠٠٣دا،

دوابەدوای هەڵبژاردنەکانی (٢، ٣)ی ئازاری/ ٢٠٠١، راشکاوانە سنوورەکانی ئەو ریفۆرمەی دیاریکرد، کە لە وتەی دەسپێکی خۆیدا ئاماژەی پێکردبوو.

ئەوەی روون کردەوە کە ئۆپۆزسیۆن بەشێوەیەکی سەرەکی "هەلپەرست "و"خۆپەرستەکان" بە هەڵە لە دیموکراسی گەیشتبوون و وەك ئازادی دور لە بنەچەی ئاکار و کۆنترۆڵ لێکیان داوەتەوە و ئەم جۆرە کەسانە بەرژەوەندیە نیشتیمانییەکان تێکدەدەن.[١١٣]

بەشار هەمان ئەو کارانەی کە ئێستا دەزگاکانی ئاسایش ئەنجامی دەدەن، دووپاتی کردەوە: لەم جۆرە ئۆپۆزسیۆنە قبوڵ ناکرێت. هێرشکردنە سەر ئۆپۆزسیۆنەکەش ئەو ساڵانەی دادەنێت کە بەدوایدا دێن. دەسەڵات ئەوە دڵنیا دەکاتەوە کە ریفۆرم تەنیا ئەو کاتانە روودەدات، کە بە ویستی خۆیان و بە پێی نەخشەی خۆیان بێت.

بە دەست پێکردنی جەنگی عێراق لە ساڵی ٢٠٠٣دا، حکومەت چەند ئاماژەیەکی باشی نیشانی کوردانی سووریا دا. یەکێك لەو ئاماژانە سەردانی رەسمی سەرۆك بەشار ئەسەد بوو بۆ پارێزگای حەسەکە لە مانگی ئەیلولی/ ٢٠٠٢ دا. ئەوە راگەیەندرا کە سەرۆك دڵنیای کردونەتەوە کە چارەسەرێك بۆ کێشەی کورد لە باکوری رۆژهەڵات بە زوویی دەدۆزێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەردانەکە بە شێوەیەکی رەسمی بەو نیازە بووە، کە پشتگیری بۆ هەوڵی حکومەت لە پێشخستنی ناوچەی جەزیرە دەستەبەر بکات و راپۆرتە رەسمییەکانیش کە لەبارەی سەردانەکەوە نووسرابوون هیچ ئاماژەیەکیان بە دانیشتوانی ناوچەکە نەکردووە.

وتاری هاوشێوەی ئەوەش لەکاتی سەردانەکەوە و لە چەند بۆنەیەکی تردا دراوە بەڵام هیچ گۆڕانێکی راستەقینەی لە سیاسەتدا نەکردووە، لەکاتی ئەو گرژییەی لە ئازاری (٢٠٠٤)ەوە لە ناوچە کوردییەکاندا دروستبووە دەسەڵاتی سووری چەند تەنازولێکی زارەکی بۆ کورد کردووە، بەڵام لە هەمان کاتدا کۆت و بەندی لەسەر

---

هەروەها دوو کەسایەتی سیاسی سەر بە حیزبیە یەکێتیە کورد لە سووریا، لە ١٥/دیسەمبەر/٢٠٠٢ دەستگیرکران، دوای خۆپیشاندانیان لەبەردەم پەرلەماندا.

[١١٣] اخبار الشرق، ١١/مارس/٢٠٠٣

دەربڕینی شوناسی کوردیان و چالاکی سیاسیان زیاد کردووە و دەستگیرکردنی کورد رووی لە هەڵکشان کردووە.

لە مانگی مایسی/٢٠٠٤دا بەشار ئەسەد بەئاشکرا باسی نەتەوەی کوردی لە سووریا و بەشداریان لە مێژووی دەوڵەتدا[١١٤] کردووە، لە کاتێکیشدا هەڵمەتەکانی دەستگیرکردنی کورد بەردەوام بووە. تەنیا یەك مانگ دوای ئەوە قەدەغەکردنی حیزبە سیاسیە کوردییەکان جارێکی تر سەپێندرا.[١١٥]

دوای تێپەربوونی نزیکەی پێنج ساڵ، سەرۆکایەتی بەشار ئەسەد تا ئێستا بانگەشە توندەکانی پەیوەندی نێوان ئەمریکا و سووریای زیادکردووە، ئەوانەی پەیوەندییان بە پشتیوانی کردنی تیرۆریزم و یاخیگەری لە عێراق و چەکی کۆکوژەوە هەیە، لەدوای رووخانی رژێمی بەعسی سەدام حسێن لە مانگی نیسانی/٢٠٠٣دا و نەمانی ئەو رقە زۆرەی ئیدارەی ئەمریکا هەیبووە، سووریا بەردەوام وەك دەوڵەتێکی قێزەون تەماشاکراوە. هەستی گەورەی دوورە پەرێزی سووریا رەنگدانەوەی هەڕەشە ناوخۆییەکانی زیادکردووە. پەیوەندییەکانی ئەمریکا و سووریا لە نێوان سەرقاڵ بوونی دروستکەر و ئیدانەکردنی گشتی سووریا و سەپاندنی گوشاری ئابووری و دیپلۆماسی بەسەر سووریادا بۆ پەسەندکردنی ئەجێندای ئەمریکا گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ئەو گوشارانەی بەسەر سووریادا سەپێنراوە لە ئاکتی سەروەری لوبنان و بەرپرسیاری سووریا (SALSA) بەفەرمی کرا.

ئەسلی ئاکتی بەرپرسیاری سووریا لەلایەن پشتیوانانی سەروەری لوبنان لە ناو ئەنجومەنی نوێنەراندا هانی ئەوەیان دەدا، کە ئەمریکا دووبارە بیر لە هێمنکردنەوەی سووریا بکاتەوە، ئامادەکرا. پاشان پرۆژە یاساکە چاوی پێداخشێنرایەوە و وەك (SALSA) کە کورتکراوەی (بەرپرسیارێتی سووریا و کردەیی سەروەری لوبنان)ە لە مانگی نیسانی/ ٢٠٠٣ دا خرایە بەردەم ئەنجومەن.

لە پرۆژەکەدا ئابڵوقە خستنە سەر سووریا خراوەتە روو، ئەویش پشتبەستن بەو تۆمەتانەی کە سووریا جبەخانەی نهێنی چەکی بایەلۆجی و کیمیاویی هەیە و بەئەنقەست هاوکاری یاخیگەری لە دژی بوونی هاوپەیمانان لە عێراق دەکات و لەسەر

---

[١١٤] چاوپێکەوتنی بشار الاسد لەلایەن کەناڵی ئاسمانی ئەلجەزیرەوە، ١/مایس/٢٠٠٤

[١١٥] راپۆرتێ لەبارەی (Serhildanaqamislo.com) ٢٠٠٤/٦/٢,٣

داگیرکردنی لوبنانیش بەردەوامە. لە سەرەتادا ئەو دەسەڵاتە لە لایەن کۆشکی سپییەوە لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٣دا رەتکرایەوە. لەو کاتە ناسکەدا کە ئەمریکا بە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە سەرقاڵ بوو، وابیردەکرایەوە کە سەپاندنی ئابلۆقە بەسەر سووریادا تواناکانی ئەمریکا بۆ قسەکردن لەبارەی چەند مەسەلەیەکی گرنگ لەو وڵاتە و ناوچەکەدا سنووردار دەکات. دوابەدوای جەنگی عێراق و کاتێك هیواکان بۆ گفتوگۆی ئاشتی عەرەب _ ئیسرائیل کاڵ بوونەوە، بانگەواز و هاواری ئیدارەی ئەمریکا بە شێوەیەکی بەرچاو گۆڕانی بەسەرداهات.

سەبارەت بە مەسەلەی تیرۆریزم، هاوکاریکردنی سووریا گرنگییەکی کەمی هەبوو، بۆیە بەرپرسان بە ئاشکرا پشتیوانی سووریایان بۆ تیرۆریزم مەحکوم کرد و هەڕەشەی ئەوەیان کرد کە سووریا لە پرۆسەی ئاشتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەربکەن.[116] بەرپرسە باڵاکان دەستیان کرد بەوەی داگیرکردنی لوبنان لەلایەن سووریاوە لە بانگەشە و هاشەوهوشەی سەرقاڵبوونی دروستکەر لەگەڵ سووریا دوور بخەنەوە.[117]

پرۆژە یاساکە لە مانگی دیسەمبەری/ ٢٠٠٤دا دەرچوو، سەرۆك بوش هەموو هەناردەیەکی بۆ سووریا جگە لە خواردن و دەرمان قەدەغەکرد، هەموو گەشتێکی بازرگانیش بۆ ئەمریکا یان لە ئەمریکاوە کە لەلایەن ئەو فرۆکانەی سووریا خاوەندارییان دەکات قەدەغەکرا.[118]

ئابلۆقەکانی سەر سووریا وابەستە لەگەڵ ئەو گوشارانەی یەکێتی ئەورووپا لەبارەی سووریاوە هەیبوو، سووریایان خستە ژێر گوشاری ئابووری و دەرەکی زیاترەوە. لەکاتێکدا (SALSA) باسی لەو مەسەلانە نەکردووە کە پەیوەندیان بە مافی مرۆڤ لە سووریادا هەیە یان داوا لە حکومەت بکات کە کار لەسەر ئەو مەسەلانە بکات، رێکەوتنی سووریا لەگەڵ یەکێتی ئەورووپا ئەو دەستەواژانە باس دەکرێت کە پەیوەندییان بە مافی مرۆڤ و پەیرەوکردنی یاسای نێودەوڵەتییەوە هەیە.

---

[116] کۆلن پاوڵ، لە ئەلنەهارەوە وەرگیراوە، ٢٠٠٣/٦/٢١

[117] بوونی سەرباز و موخابەراتی سووریی لە لوبنان و کاریگەریی دیمەشق لەبارەی سیاسەتی رەسمی لوبنانی وای لە ئەمریکا کرد بەر لە رێکەوتنی تایف بڕیاری کۆتایی هێنان بە شەڕی ئەهلی لە ساڵی ١٩٩٠دا بهێنێت.

[118] گامبڵ ی ٢٠٠٤

سەرەڕای ئەوە، سەرپێچیکردنی مافی مرۆڤ لەدوای دەستپێکردنی گفتوگۆکان لە ١٩٩٨ەوە کاریگەری لەسەر ڕێکەوتنەکە نییە و بەرپرسانی سووریاش نکوڵی لەوە دەکەن کە ئابلۆقەکان هیچ کاریگەرییەکیان لەسەر وڵاتەکە هەبێت.[١١٩] لەژێر فەرمانڕەوایی حافیز ئەسەددا سووریا لە لایەن ڕژێمێکی تاك حیزبی زۆرەملییەوە بەڕێوە براوە.

لەکاتی بەشار ئەسەدیشدا ئەوە وەك خۆی ماوەتەوە. ئەمڕۆ سووریا لەژێر سایەی سەرۆکی پێشویدا « سەرکردەی نەمر » فەرمانڕەوایی دەکرێت و بەهێزی بەشار ئەسەدیش حوکمی دەسەڵات لە سووریادا بووەتە بابەتی وتووێژ لە ناوخۆ و دەرەوەی سووریادا. هێشتا کۆی ساڵانەی سەرەتای هاتنی بەشار ئەسەد جەخت لەسەر دۆگمای حیزبی بەعس لە دەوڵەت و کۆمەڵگەدا دەکاتەوە، بەوەی پەروەردەی سیاسی بەشار ئەسەد بە تەواوی بەعسیانەیە، هەروەك گرنگیدان بە ویست و میراتی حافز ئەسەد و بوونی پێکهاتەی دەوڵەتێکی زۆرەملی و پاراستنی بارودۆخی ئێستا بە قوڵی بەڕێوەدەچێ.

## سیستمی سیاسی

پێکهاتەکانی ڕژێمی دیکتاتۆری لە سووریا، وابەستەو تێکەڵەی دەسەڵاتی مەزهەبی و خێڵەکی عەلەوی لەگەڵ هاوپەیمانییەکی فراوان و ڕێکەوتەی کۆمەڵایەتی، کە بەسنوورە ئاینی و کۆمەڵایەتییەکاندا ڕۆچووە.

حوکمی زۆردارەکی تاکە کەسی لەلایەن چەند پێکهاتە و دامەزراوەیەکی دەوڵەتییەوە بەڕێوەدەبرێ، کە کۆنترۆڵی کۆمەڵگەی سووری کردووە و ڕێگەی بە دەوڵەت داوە سیاسەتی هاوپەیمانی فراوان پەیڕەوبکات، لە هەمان کاتدا پشتبەستە بە بازنەیەکی مەزهەبی بەرتەسك بۆ دڵنیابوون لە ئاسایشی ڕژێم و سەرۆك. دەوڵەت وەك سیستمێکی کۆمپانیایی ناسراوە، کە ڕێگری لە پێکهێنانی هاوپەیمانی لە ناو گروپە کۆمەڵایەتییەکاندا دەکات.

[١١٩] هەمان سەرچاوەی پێشو.

له رووی تیۆرییەوە دەسەڵاتەکانی جێبەکردن و دەستوور و یاسایی دەوڵەت جودان، بەڵام لە پراکتیکدا دەسەڵاتی هەموو ئەوانە لە چنگی سەرۆک کۆماردایە، کە لەسەر لوتکەی قوچەکی دەسەڵات دانیشتووە. ئەو، سەرۆکی دەوڵەت و فەرماندەی هەرێمی و نیشتمانی حیزبی بەعسە، هەروەها سەرۆکی دەسەڵاتی جێبەجێکردنی حکومەتە. راستەوخۆ بەرپرسە لە دانانی جێگیری سەرۆک و سەرۆک وەزیران و وەزیر و جێگرەکانیان و ئەفسەرانی سەربازی و حاکم و پۆستە باڵاکان.[120]

دوابەدوای مردنی حافیز ئەسەد، گواستنەوەی سەرۆکایەتی بۆ بەشار ئەسەد تارادەیەک سووریای وەک کۆمارێکی میراتگر ناساند،[121] کە تێیدا گواستنەوەی دەسەڵات بە هەڵبژاردن دیاری ناکرێت، بەڵکو هێڵێکی بنەماڵەیی بڕیاری لەبارەوە دەدات. هەرچەندە بەندی یەکەمی دەستوور، سووریا وەک دەوڵەتێکی دیموکراتی جەماوەریی سۆسیالیستی سەروەر وەسف دەکات، حکومەت تەنیا وەڵامی سەرۆک دەداتەوە نەک خەڵک، سەرۆک بەپێی ویستی خۆی مافی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی هەیە. بازنەی سیاسی لەبەردەم کێبڕکێی سیاسی و بەشداری گەلدا بە داخراوی ماوەتەوە و رێی لە گەشەی دیموکراسی و لێپرسراوی گرتووە.

سەرۆک لە لایەن هاوڵاتیانی سووری و لە ریفراندۆمێکدا بۆ تێرمێکی حەوت ساڵی هەڵبژێردرا، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا ئەوانەی کاندید دەکرێن بۆ سەرۆکایەتی لەلایەن فەرماندەی هەرێمی حیزبی بەعسەوە دیاری دەکرێن، کە سەرۆک خۆی سکرتێری گشتیەتی، هەر بۆیە شتێکی سەیر نییە، کە سەرۆک هەرگیز لە هەڵبژاردنەکاندا رووبەڕووی رکابەری نابێتەوە، ئەمەش لەو کاتەوە کاری پێدەکرێت، کە حافیز ئەسەد لە ١٩٧٠دا بزوتنەوەی راستکردنەوەی دامەزراند.

---

[120] جۆرج ٢٠٠٣: ١١

[121] کۆمەڵەی کێشە نێودەوڵەتیەکان ٢٠٠٤: ٤

## حیزبی بەعسی سۆشیالیستی عەرەبیی سووریا

حیزبی بەعسی سۆشیالیستی عەرەبیی سووریا،[١٢٢] حیزبی سیاسی فەرمانڕەوایە لە سووریا. حیزبەکە بەشێوەیەکی رەسمی لە ١٩٤٧/٤/٧دا دامەزراوە، لە هەمان رۆژدا یەکەم کۆنگرەی حیزبەکە بەستراوە. حیزبێکی جەماوەرییە، لەگەڵ بناغەیەکی سۆشیالیستی، کە سەر بە لایەنە پەراوێزخراوەکانی کۆمەڵگە و گروپە کەسایەتیەکانە بۆ ئایدۆلۆجیای سۆسیالیستی، عیلمانی ناسیۆنالیزمی عەرەبی خۆی راکێشاوە.

بەر لە دەسەڵات گرتنەدەست لەساڵی ١٩٦٣ دا، حیزبی بەعس لە دەرەوەی سیستمی سیاسی و ئابووریدا دامەزراوە، ئەو پەیوەندییانەی رژێمی فەرمانڕەوایی لەسەر دامەزرا بوو، ئەندامانی خۆی پەیدا دەکرد. هەتا ئەمرۆش حیزبی بەعس هەستی پارێزگاریکردنی گروپە کەمایەتیەکانی لە باڵادەستی سوننەی زۆرینە، پێشکەش دەکات. لە سەرەتای حکومڕانییەوە رژێمی حیزبی بەعس بەدەست کەموکورتی شەرعیەتی سیاسیەوە ناڵاندویەتی و لەسەر بنەمای خواستی تاکە کەسی و ناوچەگەری و مەزهەبی و ئایدۆلۆجی، باڵی جیاکاری و ناوخۆیی تێکەوتووە.[١٢٣]

دروشمی بنچینەیی حیزبی بەعس بریتییە لە (یەکێتی و ئازادی و سۆشیالیزم) ئەم دروشمە پاشان بەسەر دەوڵەتی سووریادا سەپێنرا، دواتریش لە ساڵی ١٩٧٣دا لە دەستووردا هات. یەکێتی عەرەب وەك ئامانجی سەرەکی حیزبەکە دەرکەوت، کە خۆی تەرخان کردبوو لە پێناو بەدیهێنانیدا بۆ ئەوەی هەموو هەنگاوێکی پێویست لەو رێگایەدا بنێت. سەرەنجام سەربەخۆیی و سەروەری دەوڵەتە عەرەبیەکانیش وەك هەنگاوێکی گواستنەوە بەرەو دامەزراندنی یەکێتی عەرەب دەبێت، کە لە سایەیدا ئیدارەکان نامەرکەزی دەکرێن و یەکە جیۆگرافیە بچوکەکانیش لەلایەن فەرماندەی هەرێمی حیزبی بەعسەوە بەڕێوەدەبرێن. دوای گرتنە دەستی دەسەڵات لە ساڵی ١٩٧٠دا حیزبەکەی رێکخستەوە و سەرکردەی تاکەکەسی جێگەی بنەمای سەرکردایەتی دەستەجەمعی گرتەوە. حیزبەکە لە ئایدۆلۆجیاکەی داماڵراو بڕیارە

---

[١٢٢] لە عەرەبیدا بە واتای ژیانەوە دێت.

[١٢٣] کۆمەڵەی کێشە نێودەوڵەتیەکان ٢٠٠٤:

سیاسیەکان لەلایەن سەرۆکی بەرپرسە باڵاکانەوە دەوران و بەناو سەرکردایەتی حیزب و ئەندامەکاندا دابەش و بڵاودەکرانەوە.[١٢٤]

عەرەبیزم لە چەقی بانگەشەو هاشەوهوشەی دەوڵەتدا مایەوە و بە کەمکردنەوەی لە ئایدۆلۆجیادا، کەسایەتی حافز ئەسەد جەماوەری زیاتری بۆ پەیدا کراو کەسایەتیەکانی بۆ دروستکرا کە گوتاری حیزب و ئەندامێتی بەخودی سەرۆك، نەك بە ئایدۆلۆجیای حیزب دەبەستەوە.

حیزبی بەعس بەپێی دەستوور، حیزبی باڵای سووریایە و سەرۆکایەتی (بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتوخواز)یش دەکات، کە هەموو حیزبە سیاسیە یاساییەکانی تری سووریا لەخۆ دەگرێت. لە دەستووریشدا هاتووە کە :

« حیزبی بەعسی سۆشیالیستی عەرەبی لە کۆمەڵگە و کۆماردا حیزبی سەرکردە دەبێت و سەرۆکایەتی بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتوخواز دەکات، کە کاردەکات بۆ یەکگرتنەوەی تواناییەکانی خەڵك لە پێناو خزمەتکردنی بەرژەوەندییەکانی نەتەوەی عەرەبدا».[١٢٥] هەرچەندە لەپاڵ حیزبی بەعسدا، حیزبە سیاسیە یاساییەکانی تر لە (بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتوخواز)دا هەن، بەڵام ئینتدابێکی سیاسی سنورداریان هەیە کە وای کردووە حیزبی بەعس لە رکابەری سیاسی بەدوور بێت. کابینەی حکومەتی سووریا بە وەزیرەکانی حیزبی بەعس دەستی بەسەردا گیراوە. تەنانەت بە کەمکردنەوەی ژمارەی وەزیرەکانی حیزبی بەعس لە کابینەی حکومەتدا کە لە مانگی ئەیلولی/٢٠٠٣دا راگەیەندرا، کەمکردنەوەی تەریبی لە ژمارەی وەزیرەکاندا مانای ئەوە بوو، کە رێژەی وەزیرە بەعسیەکان لەچاو ئەوانی تردا لە راستیدا زیادی کردبوو.[١٢٦] دەسەڵاتی سنورداری حیزبەکانی ناو (بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتوخواز) و سەربەخۆکان مانای ئەوە بوو، کە وەزارەتە گرنگەکان زۆربەی دەسەڵاتەکانی بڕیار دروستکردن لەلایەن ئەندامانی حیزبی بەعسەوە گیرابوونە دەست. حیزبەکە بەشێوەیەکی کاریگەر وەك ئامێرێکی کۆنترۆلکردن و تۆڕی واسیتەکردن وابووە.[١٢٧]

---

[١٢٤] پیێرزس ١٩٩٥:١٥٧

[١٢٥] دەستووری کۆماری عەرەبی سووری، وتاری ٨

[١٢٦] رابۆرتی سووریا، ئۆکتۆبەری ٢٠٠٣:٢

[١٢٧] پیێرزس ١٩٩٥:١٥٨

لەو کاتەوە کە حیزبی بەعس لە ساڵی ١٩٦٣دا دەسەڵاتی گرتە دەست، ئەندامێتی بە شێوەیەکی خێرا زیادی کردووە. لە ساڵی ١٩٦٣دا بە نزیکەی ٢٠٠ ئەندام خەملێنرابوون، ساڵی ١٩٦٦ باوەڕوابوو کە ژمارەی ئەندامانی گەیشتە هەشت هەزارکەس، ساڵی ١٩٧١ لەوە زیاتر بوو، گەیشتە شەست و پێنج هەزار ئەندام و ساڵی ١٩٩٢ش بەیەك ملیۆن کەس خەملێنراون.[١٢٨] مەحاڵە بڕیار لەبارەی ئەوەوە بدرێت کە ئەو ژمارە زۆرەی ئەندامان ڕەنگدانەوەی جەماوەریی حیزبەکە بێت، یان پەیوەندی بەو ڕاستیەوە هەبێت، کە ئەندامێتی بەرژەوەندی سیاسی و دارایی پێشکەش بەوانەی دڵسۆزن دەکات. ئەندام بوون لە حیزبی بەعسدا بۆ هەموو گروپە نەژادی و ئاینییەکان بە کوردیشەوە کراوەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە مەرجێك کە شوناسی کوردی خۆیان لە بیربکەن و بە عەرەبیزم و ئامانجی یەکێتی عەرەب ڕازی بن.

بەلای کوردەوە نرخی نوێنەرایەتی سیاسی لەبەر ئەو هۆکارە وەك سازشکردنی شوناسی نەژادی و نەتەوەیی خۆیان وایە و ڕازیبوونە بە پەراوێزخستنی کۆمەڵگەکەیان. فەرماندەی هەرێمی حیزبی بەعس سەرکردایەتی سیاسی حیزبەکەیە. بەڵام لە پراکتیکدا فەرماندەی هەرێمی زۆربەی دەسەڵاتەکانی خۆی بۆ سەرۆك و حکومەت ونکردووە.[١٢٩] ئەوە فەرماندەی هەرێمی حیزبی بەعسە، کە کاندیدی سەرۆکایەتی پەرلەمان دیاری دەکات.[١٣٠] ئەم فەرماندەیە لە ئەندامە هەڵبژاردە باڵاکانی سیاسی سووریا پێکدێت و بانکی پۆستە باڵاکانی حکومەت تەرخان دەکات.[١٣١] فەرماندەی نیشتمانی حیزبی بەعس سەرکردایەتی پان _ عەرەبی حیزبەکەیە. هەرچەندە لە رووی تیۆرییەوە پێگەیەکی باڵاتری لە فەرماندەی هەرێمی سووریا هەیە، ئەم فەرماندەیە دەسەڵاتی لەبەردەم فەرماندەی هەرێمیدا بچوك کراوەتەوە و بووەتە شتێك کە دەسەڵاتێکی کەمێك زیاتری تەنیا بەناو هەبێ.[١٣٢]

---

[١٢٨] پیرزس ١٩٩٥:١٥٤

[١٢٩] پیرزس ١٩٩٥:١٥٦

[١٣٠] پیرزس ١٩٩٥:١٥٤

[١٣١] پیرزس ١٩٩٥:١٥٦

[١٣٢] هەمان سەرچاوەی پێشو.

## پەرلەمانی سووریا

ئەنجومەنی گەلی سووریا کە بەواتای پەرلەمان دێت، زیاتر وەك ئەنجومەنێکی راوێژکاری کاردەکات، نەك وەك دامەزراوەیەکی سیاسی بڕیار دروستکەر.[133] ئەندامانی ئەنجومەنی گەل بەهۆی دەنگدانێکی گشتی و نهێنی و راستەوخۆ و یەکسانەوە بۆ تێرمێکی چوار ساڵی هەڵدەبژێردرێت و پەرلەمان لەلایەن سەرۆك وەزیرانەوە نوێنەرایەتی دەکرێت. دەسەڵاتەکانی ئەم دامەزراوەیە بریتییە لە دیاری کردنی سەرۆك و پەسەندکردنی یاساکان و گفتوگۆ لەبارەی سیاسەت و پەسەندکردنی بودجەی گشتی و پەسەندکردنی رێکەوتن و لێبوردنە نێودەوڵەتییەکان و قبوڵکردن یان رەتکردنەوەی دەست لە کارکێشانەوەی ئەندامان و سەندنەوەی متمانە لە ئەندامانی کابینە.

لەگەڵ بوونی ئینتیدابێکی ئاوا بەرتەسك بۆ حیزبە سیاسیە یاساییەکان و پەرلەمان، بەرپرسێتی سنوردار کەوتۆتە سەرشانی پەرلەمان و دەسەڵاتی رەهای جێبەجێکردنیش لەژێر کاریگەری ئەوەدا، حیزبی بەعس لایەنی سەرەکی بڕیار دروستکردنە لە سووریا. هەروەها پەرلەمان بووەتە ئامرازێك بۆ دروستبوون و چاندنی تۆڕ و پەیوەندی واسیتەکردن.[134]

بۆ یەکەم جار حافز ئەسەد لە ساڵی ۱۹۷۱دا پەرلەمانی دامەزراند و هەڵبژاردنی پەرلەمانیش بۆ یەکەم جار لە ساڵی ۱۹۷۳دا ئەنجام درا و پاشانیش نزیکەی هەر چوار ساڵێك بەردەوام بوو. لە ساڵی ۱۹۹۰دا پەرلەمان لە ۱۹۵ ئەندامەوە بۆ ۲۵۰ ئەندام فراوان بوو، کە نزیکەی سێ ـ یەکی کورسییەکان بۆ کاندیدە سەربەخۆکان بوو. کورسیەکانی تر بۆ ئەو حیزبانەی کە لەناو (بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتوخواز)دان تەرخان کراوە. فراوان بوونی پەرلەمان ئاسانکاری کردووە لە پێکەوە گرێدانی بەرژەوەندی بازرگانی تایبەتی نوێنەران لە چوارچێوەی پرۆسەی سیاسیدا.

---

[133] پێرزس ۱۹۹۵:۱۶۶

[134] پێرزس ۱۹۹۵:۱۶۸

## بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتوخواز
(PNF)

(بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتوخواز) هەر حەوت حیزبە سیاسیە یاساییەکەی سووریا لەخۆدەگرێت، هەمان ئەو حیزبانەن، کە پەرلەمانیش پێکدەهێنن. لەگەڵ گرتنە دەستی دەسەڵاتدا، حیزبی بەعس، دژەکانی خۆی بەهۆی هێنانیان بۆ ناو بازنەی سیاسی رەسمی، وەك ئەندام و قبوڵ کردن و ناکاریگەری کردن بەو مەرجەی کە پرۆگرامی حیزبی بەعس قبوڵ بکەن و بڕیارەکانی کۆنگرەی حیزبی بەعس ببێتە رێبەری بنچینەی سیاسەتی (بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتوخواز). حیزبی بەعس سەرکردایەتی بەرەکە دەکات و لە هەموو دامەزراوەکانیدا مافی زۆرینەی پێبەخشراوە.[١٣٥] ئامانجەکانی بەرەکە بریتین لە:

١. خستنەگەڕی هەموو تواناییەکانی خەڵك لەپێناو ئامانجەکانی یەکێتی عەرەبدا (بەندی ٨/ ی دەستوور ) .
٢. ئازادکردنی ناوچە عەرەبیە داگیرکراوەکان.
٣. داڕشتنی پلانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتووری و سیاسی و سەربازی .
٤. پەسەندکردنی پلانی پێنج- ساڵە، گفتوگۆکردن لەبارەی سیاسەتی ئابووری بۆ پێشخستنی کەرتی کشتوکاڵی، کە پێشکەوتنی ئابووری نیشتمانی لەسەربەندە، هەروەك هاندانی بزوتنەوەی هاریکاری .
٥. زیادکردنی پێشکەوتنی کولتووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی هاوڵاتیان .
٦. تەواوکردنی دابەزاندنی سیستمی دیموکراتی جەماوەریی لەگەڵ دامەزراوە دەستوورییەکان و ئەنجومەنی ناوخۆ، لەپێناو دڵنیابوون لە سەروەری تەواوی خەڵك.

[١٣٥] پێرزس ١٦٤:١٩٩٥، جۆرج ٢٠٠٣: ٨٧

٧. بەرەو پێشبردنی زیاتری پێکهاتەی دیموکراتی ڕێکخراوە پیشەیی و گشتییەکان و تەرخانکردنی ئامرازی پێویست بۆیان، تا بتوانن ڕۆڵی بنچینەیی خۆیان لە دڵنیابوون لەوەی خەڵك کۆنترۆڵی بەسەر ئۆرگانە جیاوازەکانی دەسەڵاتی جێبەجێکردندا هەیە و کارکردن بۆ فراوانکردنی بناغەی ئەم ڕێکخراوانە.[١٣٦]

(بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتوخواز) کۆنترۆڵی زۆرینەی ٢٥٠ کورسیەکەی ئەنجومەنی گەلی کردووە و لە ناو ئەوەشدا حیزبی بەعس زۆرینەی بۆخۆی مسۆگەر کردووە.[١٣٧] ئەم ئەنجومەنە ناتوانێت یاسا یان بڕیار دەربکات، بەڵام بۆچوونەکانیان لەبارەی مەسەلە ئابوورییەکانەوە لەلایەن بڕیار دروستکەرانەوە حسابی بۆ دەکرێت. ئەو ڕاستییەی کە ئەم حیزبانە بە بڕیاری سیاسی و ئایدۆلۆجیای حیزبی بەعس ڕازین، ئاماژەیە بۆ ئەوەی، کە سەربەخۆیی کەمیان لە بیروڕا و ئایدۆلۆجیاکانیاندا هەیە. لە ڕاستیدا لەسەر ئەم بنەچانە (ڤۆلکێر پێرتێس) لەبارەی حیزبەکانی (بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتوخواز)ەوە نووسیویەتی، تەنیا هەردوو حیزبی کۆمۆنیستی سووریا و حیزبی بەعس، یاساین و بە حیزبی سیاسی دادەنرێت. بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت و دەنووسێت :

« ئەم بەرەیە ئاماژەیە بۆ سیستمێك کە بەشێوەیەکی بنچینەی نکوڵی لە بوونی ململانێی سیاسی دەکات و لەبەر ئەوەش ئەو هەلانەی بۆ بوونی سیاسی خۆیان لە ڕێگەی کێبڕکێکردنەوە بەرتەسك دەکاتەوە، کە بریتین لە وتووێژی کراوە و گفتوگۆکردن و سازشکردن.»[١٣٨] هەموو حیزبە سیاسیەکانی تر لە سووریا نایاساین و یاسایەك بۆ دروستبوونی حیزبی سیاسی نییە. بوونی چەندین حیزبی نایاسایی، لە نێوانیاندا حیزبە سیاسیە کوردیەکانیش، زۆرجار چاویان لێپۆشراوە لەبەرئەوەی چالاکیەکانیان لە بازنەی تایبەتدا بە سنورداری ماوەتەوە و ئایدۆلۆجیاو پرۆگرامی سیاسیان بەشێوەیەکی ڕاشکاوانە مەترسی یان هەڕەشەی بۆسەر ڕژێمەکە دروست

---

[١٣٦] نەتەوە یەکگرتووەکان، گرێبەستی جیهانیی مافەکانی سیاسی و خەڵکی مەدەنی. ٢٥/٨/٧٠:٢٠٠٠-٧١

[١٣٧] لە ریفراندۆمی ١٠/تەموزی /٢٠٠٠دا حیزبی بەعس لە ١٦٧ کورسی ١٣٥ای بەدەست هانی و ٣٢ کورسی چوو بۆ حیزبەکانی بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتوخواز، ٨٣ کورسییەکەی مابۆوە چوو بۆ کاندیدە سەربەخۆکان. لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیدا لە ئازاری ٢٠٠٣، حیزبی بەعس ١٦٧ کورسی لە کۆی ٢٥٠ کورسی بەدەست هێناو ڕێژەی تەواوی بەعسی بەجێهێشت بۆ ئەو ئەندامی پەرلەمانانەی کە بەعسی نین.

[١٣٨] پێرزس ١٦٦:١٩٩٥

نەکردووە. پێویست ناکات بڵێین: ئەوان هیچ بەشدارییەکیان لەناو (بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتوخواز) یان ئەنجومەنی گەلدا نییە، هەروەك لەگەڵ حکومەتدا خاوەنی دیالۆگێکی رەسمی نین.

تاکی کوردی خۆی بۆ هەڵبژاردن سازدەکات و ئەندامانی حیزبە سیاسیە کوردەکان دەبنە ئەندامانی پەرلەمان. بەڵام لەگەڵ ئەوەدا ئەوان ناتوانن وەك نوێنەری رێکخراوە سیاسیە کوردیەکان یان کۆمەڵگەی کورد هەڵبژێردرێن. کاندیدەکان پێویستە لەلایەن دەسەڵاتی سوورییەوە پەسەند بکرێت[١٣٩]، لەبەرئەوەش پێویستە پابەندی ئەجێندای سیاسی حیزبی بەعس بن و بە بڕیارەکانی کۆنگرەی حیزبی بەعس رازی بن و بەلایەنی کەمەوە خۆیان لە پەرەپێدانی ئەجێندا سیاسیەکانی تر بەدوور بگرن. لە کاتێکدا داخلکردنی چەند حیزبێکی دیاریکراو لەناو (بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتوخواز)داو بوونی ئەندام پەرلەمانی سەربەخۆ لەناو پەرلەماندا رکابەرەکانی حیزبی بەعسی ناکاریگەر کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا بۆتە هۆی پەرتبوون لەناو چەندین حیزبی سیاسی لەناوەوە و دەرەوەی بەرەکەدا.

دەستەگەری بووەتە دیاردەیەك لەناو حیزبە سیاسیە رەسمی و نهێنیەکانی سووریادا و پێدەچێت لە ئەنجامی تاکتیکی ئەم رژێمە بۆ دروستکردنی دابەشکاری دروست بوبێت. حیزبی بەعس بواری زیاتری بۆ رێگەپێدانی حیزبی سیاسی زۆرتر بۆ ناو (بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتوخواز) دروستکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا رکابەری زیاتری لە نێوان حیزبە سیاسیەکانی دەرەوەی بەرەکەدا دروستکرد، ئەگەر بەرەکەی بەرە و فراوان بوون بڕۆشتایە ئەوا ئاماژەیەك بوو، نەك سەرەتای دیموکراتیزە بوونی سیستمی سیاسی، بەڵکو رەخساندنی هەل بوو بۆ بە ئەندام وەرگرتن و پێکەوە گرێدانی گروپی بەرژەوەندی و کۆمەڵایەتی نوێ لەناو بازنەی رژێمی حکومڕاندا.

---

[١٣٩] پێرزس ١٩٩٥:١٦٨

## واسیتەکاری

بەشداربوون لە دەسەڵاتی پرۆسەی بڕیار دروستکردن و نوێنەرایەتیکردن کارێکی زۆر زەحمەتە، سیستمی سیاسی سووریا لەگەڵ تۆڕێکی چڕی واسیتەکاریدا بەیەکداچووە، کە مەبەست لێی دابەشکردن و بوونی داهاتە لە ڕێی واسیتە و نێوانکارییەوە.[١٤٠] ئەم تۆڕانە بۆ ناو سەرجەمی کۆمەڵگەی سووری دزەیان کردووە.

تۆڕەکانی واسیتەکاری بەرژەوەندی تاکەکەس لەگەڵ سیستم و باری ئێستای دەوڵەت پێکەوە گرێ دەدات، هەرچەندە لە رووی تیۆرییەوە هەموو کەس دەتوانێت داخلی تۆڕەکانی واسیتەکاری ببێت و لە رووی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە سودمەند ببێت، هەروەك بواری بەشداریکردنی لە پرۆسەی دروستکردنی بڕیاری سیاسیدا بۆ دەرەخسێت و چەند فۆرمێکی نوێنەرایەتیکردن یان بەشداریکردن لە پرۆسەی سیاسیدا بەدەست دەهێنێت، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەدا واسیتەکاری بە شێوەیەکی خراپ دابەشکراوە. وەك لایەنێکی بنچینەیی کەرتە رەسمی و نارەسمییەکانی سووریا، واسیتەکاری کارە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی کردۆتە تاکەکەسیی. دەستکەوتنی سود و هاوکارییەکانی دەوڵەت و کارو پەیوەندی قەرزو پێشینە بەندە بە نیشاندانی دڵسۆزی بۆ رژێم و ئایدۆلۆجیای بەعس و دروستکردنی پەیوەندیی باش. لە دۆخێکی وادا، توانای نوێنەرایەتیکردنی بەرژەوەندییەکانی گروپێك، کە پشتبەست بێت بە شوناسی نەتەوەیی، وەکو کورد، یان بە چین و توێژ و ئاین، زۆر سەختە. دەوڵەت کاری گروپەکانی هاوشێوەی ئەمە، بە هاندانی ململانێی نەژادی و مەزهەبی دادەنێت و بە فۆرمێکی نایاسایی رێکخراوی سیاسییان دەزانێت. خەڵکانی چالاکی کورد لە سووریا زۆرجار دەستگیر دەکرێن و لە پای ئەو کارانەشیاندا سزا دەدرێن.

بەم شێوەیە ئەوەی ئەوان کارێکی سیاسییە کە هیچ جێگەیەکی لە بازنەی سیاسیی رەسمیدا نییە و لەبەرئەوەش لە کارە سیاسییەکانیدا سنووردارکراوە. لەگەڵ ئەوەدا، غیابی ئایدۆلۆجیایەکی سیاسی کە هەموو گروپە مەزهەبی و نەتەوەیی و نەژادییەکانی سووریا لە خۆبگرێت، مانای ئەوەیە ئەم شێوەی دڵسۆزی نیشاندانە بۆ دەوڵەت بەردەوام خاوەنی هێزێکی بەرچاون.

---

[١٤٠] پێرزس ١٩٩٥: ٢٠، تێبینی ٣٤

## سوپا و موخابەرات و سیاسەت

حیزبی بەعس شەرعییەتی لە نێوان ئەو بەشە پەراوێزخراوەی کۆمەڵگەی سووریدا پەیداکرد، کە بە دوای ئەوەدا دەگەڕان لە پرۆسەی سیاسیدا نوێنەرایەتی خۆیان بکەن. بە هەمان شێوەش بۆ ئەم گروپانە، سوپا بووە ئامرازی هەڵکشان و پاراستن لە دەست سوننەی زۆرینە. لە کودەتاکەی حافز ئەسەدەوە لە ساڵی ١٩٧٠دا، سوپا بووەتە بەشێکی گرنگی سیاسەتی سووریا.

کودەتاکە دامەزراوە سەربازییەکانی بە چڕی تێکەڵی سیاسەتی دەوڵەت کردو باڵی مەدەنی پەراوێز خست. حافز ئەسەد دوای ئەوەی دەسەڵاتی گرتە دەست، سوپای بەهێز و فراوان و کارامە کرد و لەگەڵ بوونی بەرژەوەندی بۆ پاراستنی باری ئێستا، کە وەك گروپێکی هەڵبژاردەی چینی ناوەند دایمەزراند. کەسە دڵسۆزەکانی عەلەوی پۆستی ستراتیجییان لە نێو هێزەکانی سوپا و دەزگاکانی هەواڵگیریدا پێدرابوو، کە کاریان دڵنیابوون و کەمکردنەوەی هەڕەشەکان بوو بۆ سەر ڕژێم. دامەزراندنی کەسە دڵسۆزەکانی عەلەوی لەو پۆستە ستراتیجییانەی نێو هێزەکانی سوپادا ئەوەی دڵنیا دەکردەوە، کە تیرەگەر و تاقمە جیاوازەکانی کۆمەڵگە بە هێزی ناجێگیرکەری توند بۆ سەر ڕژێمەکە دادەنرێن، ڕەنگە بەشدارییپێکردنیان لەناو دەوڵەتدا خەمی تیرەگەریی عەلەوی لە حکومەتدا بڕەوێنێتەوە.[١٤١]

هەروەها کەسایەتییە سەربازییەکان دەستیان بەسەر ئەندامێتی حیزبی بەعسیشدا گرتبوو. کۆی هەموو ئەم هۆکارانە وای کردبوو، کە سوپا ببێتە دامەزراوەیەکی خاوەن ئاسایش و جێگری دەوڵەت، نەك ئۆرگانێك بۆ شۆڕش و گۆڕینی ڕژێم و ناجێگیری وەك ئەوانەی یەکەم کودەتای سەربازی حوسنی زەعیم لە ساڵی ١٩٤٩دا و تازەترین کودەتای سەرکەوتووی ساڵی ١٩٧٠.

بە هۆی دامەزراندنی پایە و جێگیرکردنی بارودۆخی سیاسییەوە لە سووریا، حافز ئەسەد متمانەیەکی زۆری پێبەخشرا، چونکە خەڵك بە دوای دابینکردنی ئەو

---

[١٤١] دام ١٩٩٦:٦٨

شتانەدا، وێڵ بوون، لەگەڵ ئەوەدا نرخی ئەم گەورە بوو، هەروەك سوپاو یەكە هاوپەیوەندییەكانی بەرگری و دەزگاكانی هەواڵگری وەك بەشێكی ناوەندیی لە كۆنترۆڵی ناوخۆی رژێمدا خزمەتیان دەكرد. موخابەرات[١٤٢] وەك هێزێكی سەركوتكەر بۆ چاندنی ترسێكی بۆماوە لە نێو كۆمەڵگەدا لە پای چالاكی سیاسییان و دەربڕینی بۆچوونی سیاسییان، كاری دەكرد. دڕندەیی رژێم و هێزەكانی ئاسایش بە توندی و لە شێوەی ئەشكەنجە و تۆقاندندا پێشانی خەڵك و هەموو كۆمەڵگە و رێكخراوە سیاسییەكان دەدرێت.

ئەو بزووتنەوە بەرهەڵستكارییەی لە كۆتایی ساڵی ١٩٧٠دا لە سووریا دەركەوت، چەندین دەنگی لە قاڵب دا، كە لە نێویاندا ماركسییەكان و كۆمونیست و هەڵسوڕاوانی بواری مرۆڤ هەبوون، بەڵام بە ئیخوان ئەلموسلمینی سووریا زیاتر هاندرا. خراپی باری ئابووری و داگیركردنی لوبنان لە لایەن سووریاوە و زیادبوونی ئەو رەنگدانەوەیە لای عەرەبی سوننەی زۆرینە، كە عەلەوییەكان رژێمیان قۆرخ كردووە، هەموو بەشداربوون لەو بارگرژییەی سووریا و رژێمەكەی هەژاند. دوای سەركوتكردنی ژمارەیەك راپەڕین كە ئیخوان ئەلموسلمینی كردە ئامانج و لە هێرشێكدا بۆ سەر زیندانی (تەدمور) لە ٢٧/ ٧/ ١٩٨٠دا، سەدان كەس كوژران، هەروەك هەموو رق و توڕەیی رژێم لە خاپوركردنی راپەڕینی (حەما) لە شوباتی/ ١٩٨٢دا پێشاندرا.[١٤٣] لە ٢/ شوباتی/ ١٩٨٢دا، سوپای سووریا و هێزە تایبەتەكان بۆ ماوەی (٢٧) رۆژ دەوری ئەو شارەیان گرت و تۆپبارانی ناو شاریان دەكرد، هەروەك لە ناوەوەش خەریكی تاڵان و وێرانكاری بوون. هەزاران هاووڵاتی مەدەنی لەو رووداوەدا كوژران[١٤٤] و سێیەكی شارەكە بە تەواوی وێران كرا.[١٤٥]

---

[١٤٢] موخابەرات ناوێكی عەرەبییە بۆ دەزگای زانیاری، هەروەها لقێكی جیاواز لە موخابەرات بە ناوی ئەمنی قەومی و ئەمنی سیاسی و موخابەراتی سەربازی و لقی فەلەستین...هتید كە لێرەدا وەك دەربڕینێكی گشتی بەكاردێن بۆ موخابەراتی سووری.

[١٤٣] بڕوانە كۆمیتەی مافەكانی مرۆڤ – سووریا ١٩٩٩.

[١٤٤] جۆرج (٢٠٠٣: ١٦) خەملاندن وەك بەڵگەیەك لە نێوان ٥٠٠٠ و ١٠٠٠٠دا كردووە، كاتێ كۆمیتەی مافەكانی مرۆڤ – سووریا ١٩٩٩ بەڵگەی نێوان ٣٥٠٠٠ و ٤٠٠٠٠ داناوە.

[١٤٥] بڕوانە كۆمیتەی مافەكانی مرۆڤ – سووریا ١٩٩٩.

به لای هەڵسوڕاوە سیاسییەکانەوە، نیشاندانی هێزی زیاد لە پێویست بوو بۆ روونکردنەوەی ئاکامە خراپەکانی بەرهەڵستکاریی سیاسی رێکخراو، بە شێوەیەك کە لەو کاتەوە هاوشێوەی ئەوە نەبینراوە. دوابەدوای راپەڕینەکەی (حەما)، دەزگاکانی ئاسایش بە شێوەیەکی بەرچاو فراوان کران، ئەمڕۆش گروپە رکەبەرەکانی زانیاری و هەواڵگری لە سووریا کۆدەکەنەوە و کۆنترۆڵی بزووتنەوەکان دەکەن و پۆلیسن بەسەر کۆمەڵگەی سورییەوە. کۆت و بەند دەخەنە سەر ئازادی رادەربڕین و فۆرمێکی بەهێزی خود سانسۆرییان لەناو خەڵکدا دروستکردووە، کە ترسی ئەوەیان هەیە زانیاری لە بارەیانەوە بدرێت.

لە کاتی راپەڕینەکەی (حەما)وە، سوپا بەو ژمارە زۆرە و بەو زۆرداریيە بەکارنەهاتووە، هەرچەندە جارێك سوپا بۆ دامرکاندنەوەی ململانێ مەزهەبییەکان بەکارهاتووە.[١٤٦] گەورەترین هێز لە دژی ئەو راپەڕینە کوردییانە بەکارهات، کە ناوچەکانی کۆمەڵگە کوردییەکانی لە مارسی ٢٠٠٤دا راماڵی و لەو رووداوەشدا زیاتر لە ٢٥ هاووڵاتی کورد کوژران.[١٤٧] تانکەکان دەوری شاری قامیشلیان دابوو، بە سەریاندا دەسوڕایەوە و سەربازی پیادەش شەقامی زۆربەی شارەکانی باکووری سووریایان گرتبوو، کە ئیدی کۆتاییان بە راپەڕینەکان هێنا و بە دوای ئەمەشدا، لە هەڵمەتەکانی دەستگیرکردندا زیاتر لە دوو هەزار هاووڵاتی کورد زیندانی کران و چەندینی تریش بێسەر و شوێن بوون، هەر لەناو سوپاشدا، ژمارەیەك لاوی کورد، کە خزمەتی سەربازیشیان دەکرد، یان لەگەڵ هێزە چەکدارەکان کاریان دەکرد، لە لایەن هاوڕێ سەربازەکانی خۆیانەوە کوژران.[١٤٨]

---

[١٤٦] MEIB ، کانونی یەکەم و شوباتی ٢٠٠٠

[١٤٧] ئەمە ژمارەیەکی رەسمییە لەلایەن عەلی حەمودی وەزیری ناوخۆی سووریا لە ٢٠٠٤/٣/١٩دا پێشکەش کراوە. سەرۆکانی حیزبی کوردی لە ٤٠ زیاتریان خستۆتە سەر ژمارەکە، یاسین ٢٠٠٤

[١٤٨] بڕوانە بۆ نموونە تەلەفیزیۆنی knn ، ١٠/جون/٢٠٠٤

## ڕێکخراوی جەماوەریی و کۆمەڵی مەدەنی

لە ژێر حکومڕانی حافز ئەسەددا، سووریا فراوانبوونێکی بەرچاوی لە ژمارە و قەوارەی ئەو ڕێکخراوە جەماوەرییانەدا بە خۆوە بینی، کە بە ئاراستەی حیزبی بەعس کاریان دەکرد.[149]

ڕێکخراوە جەماوەرییەکان لە سووریا وەك بەشێك لە سیستمی دەوڵەت کاریان دەکرد و بووبوونە لایەنی نوێنەرایەتیکردن و یەکدی ڕێکخستن. لەوەش زیاتر هانی دڵسۆزیان بۆ دەوڵەت دەدا و بنەچەی کۆنترۆڵکردنیان دەستەبەر دەکرد.[150]

بە پێی بنەما کۆمپانییەکان، کۆمەڵگە بە هۆی کارو ئەرکە جیاوازەکانەوە ڕێکدەخرێت و ڕێکخراوەکانیش ڕاستەوخۆ مامەڵە لەگەڵ حکومەتدا دەکەن، نەك کێبڕکێ لەگەڵ ڕێکخراوەکانی هاوشێوەی خۆیان بکەن یان ببنە چینی کۆمەڵایەتی، نموونەی ئەو ڕێکخراوە جەماوەرییانە وەك: یەکێتی بازرگانی، یەکێتی جوتیاران و یەکێتییە جەماوەرییەکانی تر، یەکێتی ژنان، یەکێتی نەتەوەیی خوێندکاران، ڕێکخراویی شۆڕشگێڕیی لاوان، پێشەنگەکانی بەعس، هتد.

ڕێکخراوە جەماوەرییەکانی سووریا، هەموویان لە ژێر دەسەڵاتی حیزبی بەعسدا کاردەکەن و هەمووشیان ئەرکەکانیان هاوشێوەی ڕەنگدانەوەی سروشتی سیستمی زۆرەملییە.[151]

ئەم ڕێکخراوانە بوونەتە بەشێکی دانەبڕاو لە پاراستنی دەسەڵاتی ڕژێمدا. ئەندامبوون لەم ڕێکخراوانەدا، هەرچەندە ئیجباری نییە، زۆرجار پێویستی کارکردنە لەگەڵ دەوڵەتدا.

---

[149] جۆرج ٢٠٠٣: ٧٤

[150] پێرزس ١٩٩٥:١٧٠

[151] پێرزس ١٩٩٥: ١٧١

ماوەی ساڵانی حەفتاکان و هەشتاکان، ئەم یەکێتی و ڕێکخراوانە بووبوونە مەیدانی چالاکییەکانی هەڵسوڕاوانی بواری دیموکراسی، لە ساڵی ١٩٧٦دا ڕژێم ئەم بزووتنەوەیەی سەرکوتکرد و گۆڕان و ریفۆڕمی لە ڕێکخراوەکانی وەك پارێزەران و بازرگانی و ژنان و خوێندکاراندا کرد و هەموویانی بە ویستی حیزبی بەعسی حکومڕان ڕێکخست. هەتا ئەمڕۆش، ئەم ڕێکخراوانە بە شێوەیەکی ئاسایی نامە و نووسراوی دڵسۆزی و پشتیوانی بۆ سەرۆك دەنێرن.[١٥٢]

ڕووداوەکانی (حەما)و ئەو ڕێ و شوێنانەی لەو کاتەدا لە دژی خەڵکە نارەزاییەکەی گیرایە بەر، کاریگەری تەواو نێگەتیڤی لەبارەی کۆمەڵی مەدەنی لە سووریا و ئۆپۆزسیۆنی سووریا هەبوو.

بە فراوانبوونی کۆنترۆڵی دەوڵەت بەسەر کۆمەڵی مەدەنی و دامەزراوەکانیدا، ئۆپۆزسیۆن بواری کەمی بۆ چالاکی هەبوو، لەبەرئەوەش بێدەنگ بوون، یان لە تاراوگە کاریان دەکرد، یان لە ژێرزەمین و لە بازنەی بەرتەسکدا چالاکییان ئەنجام دەدا، موخابەرات بە شێوەیەکی نهێنی بوونی لە بازنەی چالاکی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیدا هەبوو، بەوەش بوونی کاریگەر لە ناوخۆی سووریادا شتێکی مەحاڵە.

[١٥٢] بۆ نموونە بڕوانە تایمسی سووری، ٢٧،٢٨/١٠/٢٠٠٣

## سیستم و گەشەی ئابووری

سووریا دەوڵەتێکە کە داهاتێکی ناوەندی هەیە و لە ساڵی ٢٠٠٢دا کۆی بەرهەمی ناوخۆی ٢١,٩ بلیۆن دۆلاری ئەمەریکی بووە،[١٥٣] بە شێوەیەکی بنچینەیی ئابووری سووریا پشت بە کشتوکاڵ و پیشەسازی و وزە دەبەستێت.[١٥٤] بە شێوەیەکی دەستووری – تەماشای بەندی١٣(١) بکە- ئابوورییەکەی لە ناوەندەوە پلان و فەرمانی بۆ دەردەکرێت. سووریا وەك دەوڵەتێکی هەرەوەزی دەناسرێت، هەرچەندە هیچ لە یەکچوونێکی لەگەڵ دەوڵەتە هەرەوەزییە ئەوروپییەکانی وەك دانیمارك و نەرویجدا نییە. ڕێکخستنی دەوڵەت بەو شێوە هەمەجۆرییە لە ڕووی ئاین و نەژادەوە، لە وڵاتانی پاش ئیستعمار شتێکی باو بووە. ئەو پەیکەرە پەیوەستەی هاوبەشیتی، کە سیستمی لەسەر دامەزرابوو، سنوورە کۆمەڵایەتییەکانی شکاندووە و کۆمەڵگەی بە گوێرەی هێڵەکانی بنەچەی ئەرك و کار دابەشکردووە. بۆ نموونە، لە پیشەسازیدا دەستەی نوێنەرایەتیکردن نوێنەرایەتی فەرمانبەر و خاوەن کار و بەڕێوەبەر و خاوەنەکان وەك یەك دەکات.

ئابووری سووریا بە شێوەیەکی سەرەکی و پشت بەستن بە کشتوکاڵ مایەوە. کشتوکاڵ ٣٢٪ی (کۆی بەرهەمی ناوخۆی)یەکەی پێکدەهێنێت و هەروەها ٢٥٪ی هێزی کار بۆ خۆی دەبات.[١٥٥] بەرهەمی سەرەکی گەنم و جۆ و لۆکە و سەوزە و توتن و قامیشی شەکرە. پیشەسازی، کە بەشێوەیەکی سەرەکی لە قتونانی خواردن و بەرهەمهێنانی قوماشە، ٢٢٪ ی (کۆی بەرهەمی ناوخۆی) پێکدەهێنێت و ٢٩٪ ی هێزی کاریش بۆ خۆی دەبات. نزیکەی نیوەی قازانج لە هەناردەکان لە نەوتی خاوەوەیە (لە ساڵی ٢٠٠٠دا ٧٠٪ بووە) لە مانگی (١١/٢٠٠٠)ەوە هەتا رووخانی رژێمی

---

[١٥٣] بانکی نێودەوڵەتی a٢٠٠٣

[١٥٤] وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، ئۆکتۆبەری ٢٠٠٤

[١٥٥] جۆرج ٢٠٠٣:٢٣

بەعس لە عێراق لە ساڵی ٢٠٠٣دا، سووریا لە هەناردەی نەوتی قاچاخ لە عێراق بۆ سووریا و ناردنی شمەکی سووری بۆ بازاڕەکانی عێراق کەڵکی بینیوە.[١٥٦]

بە پێی وەزارەتی ڕاگەیاندنی سووریا، ئابووری سووریا (٧٪- ٨٪) لە ماوەی پێنج ساڵی ڕابردوودا زیادبوونی لە (کۆی بەرهەمی ناوخۆی)دا بە خۆوە بینیوە و، ئەو زیادبوونەش زیاتر لە وەبەرهێنانی کەرتی تایبەت و کرانەوەی ئابووریدا بووە.[١٥٧]

لەگەڵ، کورتەی بەراییەکانی بانکی جیهانی ئاماژە بەوە دەکەن کە(کۆی بەرهەمی ناوخۆی)ی سووریا بە بەردەوامی دابەزیوە و ڕێژەکەشی لە ساڵی ٢٠٠٢دا ٣,١٪ بووە.[١٥٨]

دەوڵەت بە دەست بێ کاری زۆر و هەژارییەوە دەناڵێنێت،[١٥٩] کە هەردووکیان بە هۆی زیادبوونی ساڵانەی ژمارەی دانیشتوان بە ڕێژەی ٢,٥٪ و بوونی دانیشتوانێکی گەنجەوە،[١٦٠] بەرەو نالەباری دەچن،[١٦١] ڕێژەی داهاتی تاك بە ١٠٠٠ دۆلاری ئەمریکی دەخەملێنرێت[١٦٢] و ڕێ و شوێنەکان بۆ کەمکردنەوەی بێکاری و باشکردنی پەروەردە، زۆر لاوازن.

زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان گەشەسەندنی ئابووری پەکخستووە و لەم چەند ساڵەی دوایشدا بووەتە هۆی دابەزینی ڕێژەی (کۆی بەرهەمی ناوخۆی)و پەکخستنی ئابووری.[١٦٣] وەك ئامرازێك بۆ لەخۆگرتنی هێزی کاری زیادە، بیرۆکراسی دەوڵەت ژمارەی فەرمانبەرانی زیاد لە پێویستە و لە ئاکامیشدا لێهاتووییان لە دەستداوە. بەڵام هێشتا بیرۆکراسی دەوڵەت وەك خاوەن کاری سەرەکی لە کۆمەڵگایەکدا کە ڕێژەی بێکاری ٢٠٪ زیادی کردووە، بەشی بەرچاوی لە بارودۆخی ئێستادا بە بنەچەی

---

[١٥٦] گامبل ٢٠٠١

[١٥٧] وەزارەتی ڕاگەیاندنی سووریا ٢٠٠٠

[١٥٨] بانکی نێودەوڵەتی a٢٠٠٣

[١٥٩] لە ٪٢٠-٢٥ ، بانکی نێودەوڵەتی a٢٠٠٣ . وەزارەتی ڕاگەیاندنی سووریا ڕایگەیاند کە تەنیا ٢٥٪ دانیشتوان چالاکی ئابوورییان هەیە.

[١٦٠] بانکی نێودەوڵەتی a٢٠٠٣ . بە هەرحاڵ، ریچاردس و واتبەری (١٩٩٨) بڕی ٣,٣٪ یان داناوە.

[١٦١] بە پێی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا (ئۆکتۆبەری ٢٠٠٤)، نزیکەی ٦٠٪ ی دانیشتوان لە ژێر تەمەنی ٢٠ ساڵییەوەن

[١٦٢] بانکی نێودەوڵەتی a٢٠٠٣

[١٦٣] جۆرج ٢٠٠٣:٢٥

جیاوازەکانی کۆمەڵگە بەخشیوە. فراوانبوونی بیرۆکراسی بووەتە ئامرازێکی تر بۆ بەدەستهێنان و راکێشانی دڵسۆزیی خەڵك.

**لە کۆتایی حەفتاکاندا نەوت لە ناوچە کوردییەکانی باکووری رۆژهەڵاتی سووریا دۆزرایەوە. لە کاتی ئەو دۆزینەوەیەو گەشەسەندنی کێڵگە نەوتییە گرنگەکان لە دۆڵی فورات لە ساڵانی هەشتاکاندا بەرهەمی نەوت لە ١٢٠,٠٠٠ بەرمیل لە** رۆژێکدا بۆ ٥٨٠٠٠٠ بەرمیل لە رۆژێکدا لە ساڵی ١٩٨٣دا زیادی کرد.[١٦٤]

بە بوونی بازرگانی قاچاخی نەوت لە عێراقەوە، داهاتی نەوت لە سووریا لەم دواییانەدا بە نزیکەی ٧٠٪ ی هەناردە و (٤٠٪- ٥٠٪)ی بودجەی دەوڵەت حساب دەکرێت.[١٦٥] هەرچەندە بازرگانی قاچاخی نەوت و شمەك لە نێوان عێراق و سووریادا بە دەستپێکردنی جەنگی عێراق کۆتایی هات. نرخی ئەمەش بۆ ئابووری سووریا نزیکەی یەك بلیۆن دۆلاری ئەمرکییە لە ساڵێکدا.[١٦٦] لە پەیوەندییە هەرێمییەکانی سووریادا، ئابووری سووریا سودی لەو دۆخە وەرگرتووە، کە دەوڵەتێکی نزیك بەرەی جەنگ و سەرسنوورە لە ململانێکانی عەرەب- ئیسرائیلدا.

پرسی فەلەستین بۆ ناسیۆنالیزمی عەرەبی و پەیوەندییەکانی عەرەب لە نێوان خۆیاندا و پەیوەندییان لەگەڵ ئیسرائیل و رۆژئاوادا جێگەی بایەخە. هەڵوێستی سیاسەتی دەرەوەی سووریا بەرامبەر ئیسرائیل وایکردووە چەندین ئامێر و کەل وپەلی سەربازی و هاوکاری و قەرزی لە دەرەوە، بە زۆری لە یەکێتی سۆڤیەتی جاران و دەوڵەتانی کەنداوی عەرەبەوە، پێبگات. هەرچەندە قەرزەکانی سەری ساڵی ٢٠٠١دا و بە ٢٠,٨ بلیۆن دۆلاری ئەمەریکی خەملێنراوە.[١٦٧]

لەم ساڵانەی دواییدا و بە گۆڕێکی زیاتر لە سەردەمی سەرۆکایەتی بەشار ئەسەددا، ئابووری بە ئاگاییەوە هەمەجۆر کراو وەبەرهێنان لەلایەن کەرتی تایبەتەوە هاندراوە، پێدانی کۆنتراکتە نوێیەکان بە زۆری ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لە رژێمەوە نزیکن و بەرژەوەندییان لە هێشتنەوەی بارودۆخی ئێستادا هەیە و بە زۆریش پشت بە

---

[١٦٤] جۆرج ٢٠٠٣:٢٤

[١٦٥] جۆرج ٢٠٠٣:٢٤

[١٦٦] کامبل ٢٠٠٤

[١٦٧] بانکی نێودەوڵەتی a٢٠٠٣

واسیتەکاری دەبەستێت. کۆنترۆڵی دەوڵەت بەسەر دەرکردنی کۆنتراکت و مۆڵەتدا بووەتە هۆی ئەوەی کە هاندانی کەرتی تایبەت ببێتە ئامرازێکی تر بۆ هێنانی بەرژەوەندی نوێ بۆ ناو ئەم سیستمەی لە ئێستادا هەیە.

گەندەڵی بە شێوەیەکی بەرچاو لەناو بەرپرسان و فەرمانبەران و کارمەندانی ئاسایشدا هەیە، هەموو ئەمانەش لە ڕێی تۆڕەکانی واسیتەکارییەوە بەڕێوە دەبرێن و خێرو بێرەکەشی تەنیا بۆ چەند کەسێك یان گروپێکی دیاریکراوە.

پلەدارە سیاسی و سەربازەکان کۆنترۆڵی لایەنە سەرەکییەکانی ئابووری و بازاڕی ڕەشیان کردووە و بەمەش ئەو گەندەڵییەی لێکەوتۆتەوە و تا ئەمڕۆش بووەتە مەسەلەیەکی ڕەمزی.[١٦٨]

ریفۆرمی ئابووری لە سووریا یەکێکە لە کێشە و پێکۆڵییەکانی (تەحەدی) ئەمڕۆ کە ڕووبەڕووی بەشار ئەسەد بووەتەوە. بێکاری بەربلاو و بوونی دانیشتوانێکی گەنج لە ئێستادا وەك بۆمبێکی تەوقیت کراو بۆ ڕژێمەکە وایە، کە ترسی لە ئیسلامیزم و ڕاپەڕینی جەماوەری هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا ریفۆرمی ڕادیکاڵی کە لە ئێستادا پێویستە، بە مانای ئەوە دێت، ئەو بناغانە لەبەر یەك هەڵبوەشێنرێنەوە، کە بە هۆیانەوە چەند کەسێك لەناو ڕژێم و سوپادا سودمەند دەبن.

وەستانەوە لە دژی ریفۆرم لەناو ڕژێمدا زۆر بەهێزە و ئەو ڕێ و شوێنانەش کە تا ئێستا گیراونەتە بەر وەك پێویست نین.

## سیستمی یاسایی

سیستمی یاسایی لە سووریا لە تێکەڵەی یاسای شەریعی ئیسلامی و یاسای مەدەنی پێکدێت. زۆربەی کۆدە مەدەنی و بازرگانی و تاوانییەکان پەیوەستن بە سیستمی یاسای فەرەنساوە. مەسەلەکانی باری کەسێتی وەك هاوسەرگیری و تەڵاقدان و باوکایەتی و بەندکردنی منداڵان و میراتگری لە زۆربەی ناوچەکانی وڵاتەکەدا بە هۆی یاسای

---

[١٦٨] جۆرج ٢٦:٣:٢٠٠

شەرعەوە بەڕێوە دەبرێن. هەرچەندە ئەم یاسایە راستکردنەوە و نوێگەریی تێداکراوە و تا رادەیەك دۆخی ژن باش کراوە و یاساکانی میراتگری روونکراوەتەوە.[169]

رەشنووسی یاساکان لە لایەن سەرۆکی پەرلەمانەوە بۆ گفتوگۆکردن دەخرێتە بەردەم پەرلەمان و ئەگەر پێویستیش بوو، لەگەڵ حکومەتدا باس لە گۆڕانکاری تیایاندا دەکرێت، دوای دەنگدان یاساکە دووبارە دەخرێتە بەردەم سەرۆك کە پاشان دەیکاتە یاسا، یان دووبارە دەینێرێتەوە پەرلەمان، یان ڤیتۆ بەکاردەهێنێت. لە رووی تیۆرییەوە دوو- سێی زۆرینە لە پەرلەمان دەتوانن بڕیار بەسەر ڤیتۆی سەرۆکدا دەربکەن، بەڵام لە پراکتیکدا ئەمە هەرگیز رووی نەداوە.[170]

## دەستوور و یاسای سزادان

دەستووری کۆماری سووریا لە ١٩٧٣/٣/١٣دا کاری پێکرا، دەستوور کاراکتەری عەرەبی دەوڵەت دیاری و دووبارە دەکاتەوە، سووریا ناوچەیەکە لە نیشتمانی عەرەب و حکومەت و سەربەخۆیی دەوڵەت "ئامرازێکن لە پێناو خەباتکردن بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگەی سۆشیالیست و یەکگرتووی عەرەب"(پێشەکی) و" یەکگرتنی گشتگیری نەتەوەی عەرەب"(بەندی ١ "٣")

لە دەستووردا بەهاو دامەزراندنی دیموکراسی جەماوەری (بەندی ١ '١') و بنەماکانی یەکسانی و ئازادی رادەربڕین (بەندی ٣٨) و پەروەردەی گەردوونی (بەندی ٣٧) پشتگیریان لێکراوە. بە هەمان شێوە یاساکانی سزادان گەرەنتی لە دژی خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات و پێشێلکردنی یاساو ئازادی کۆمەڵان و رادەربڕین و کۆبوونەوە و ئەشکەنجەدانی جەستەیی و دەروونی و بەزۆر ئیعتیراف پێکردن و دەستوەردانە کاروبارەکان دەدات.[171] لە هەمان کاتدا، ئەحکامی یاسای سزادان و گەرەنتییەکانی بە شێوەیەکی ئاسایی لە دژی ژمارەیەکی دیاریکراوی لایەن و کەرتەکانی کۆمەڵگە بەکاردەهێنرێن، ئەمە بۆ کوردەکانی سووریا راستە، کە زۆرجار بە تاوانی وەك

[169] ماسۆن ١٩٨٨:١٩٢

[170] پیرزس ١٩٩٥: ٢٢٢

[171] وتاری ١٩,١٩٩٨: ٢٠-٢١

"هاندانی جیاکاری نەژادی، یان جۆشدانی ململانێ لە نێوان کۆمەڵگە جیاوازەکان و پێکهاتەکانی نیشتماندا" (بەندی ٣٠٧) یان بە تاوانی " ئەندامبوون لەو کۆمەڵە و رێکخراوانەی بەو مەبەستانەی لە بەندی (٣٠٧)دا ئاماژەیان پێکرا، دامەزراون" (بەندی ٣٠٨).[١٧٢]

بە شێوەیەکی لەگەڵ یەك نەگونجاوی و پێچەوانە ئەم دەستەواژانە، کە بۆ پارێزگاریکردن لە دژی سەرکوتکاری و دووبەرەکی لەسەر بنەمای نەژاد، یان ئاین دروستبوون، بەڵام بە شێوازێکی دووبەرەکیانە لە دژی دانیشتوانی کوردی سووریا بەکاردەهێنرێن.

هەموو ئەو بەندانەی لە دەستووردا هاتوون بابەتی یاسان. سووریا لە کاتی راگەیاندنی بارودۆخی نائاساییدا هەموو ئەو گەرەنتییانەی لە دەستوور و قەوارەی یاسای ناوخۆ لە ٨/مارسی/ ١٩٦٣وە هەیە، ئەمەش رۆژی روودانی کودەتای حیزبی بەعسە، کە ئەنجومەنی نیشتمانی بڕیاری شۆڕشی دامەزراند.

## بارودۆخی نائاسایی

ئەو یاسایەی کە ساڵی ١٩٦٢ بارودۆخی نائاسایی لە سووریا دامەزراند، لە لایەن ئەو حکومەتەی پێش حیزبی بەعس هەبوو دامەزرا، بە روودانی کودەتای حیزبی بەعس لە ٨/مارسی/ ١٩٦٣دا، بارودۆخی نائاسایی لە سووریا جارێکی تر و بە بڕیاری سەربازی ژمارە (٢) لە ٨/مارس دەرکرایەوە، هەتا ئەمڕۆش بە بیانووی داگیرکردنی بەردەوامی بەرزاییەکانی جۆلان لە لایەن ئیسرائیلەوە، وەك خۆی ماوەتەوە.

یاسایی بوونی بارودۆخی نائاسایی جێگەی پرسیارە، چونکە فەرمانەکەی لە لایەن پەرلەمانەوە گفتوگۆی لەبارەوە نەکراوە، یان پەسەند نەکراوە،[١٧٣] بەڵام هێشتا سووریا بۆ ماوەی زیاتر لە چل ساڵە بە هۆی یاسای سەربازییەوە بەڕێوە دەبرێت، لە

---

[١٧٢] نەتەوە یەکگرتووەکان، گرێبەستی جیهانیی مافەکانی سیاسی و خەڵی مەدەنی. ٢٠٠٠/٨/٢٥ :٨١

[١٧٣] بڕیاری یاسایی ژمارە ٥١(٥) ی ١٩٦٢/١٢/٢٢

ئاکامیشدا یاسای بارودۆخی نائاسایی وەك چوارچێوەیەکی یاسایی هەمیشەیی لە سووریا دادەنرێت.[174] یاسای بارودۆخی نائاسایی بۆ سەرۆك و دەسەڵاتە لە رادەبەدەری **تەشریعی و یاسابییەکانی فراوان بووە و بۆ سەرکوتکردنی ئۆپۆزسیۆن و کۆت و بەند خستنەسەر ئازادی کۆبوونەوە و بزوتنەوەکان و سانسۆر خستنەسەر نامە و گەیاندنی خەڵك و زەوتکردنی موڵك و ماڵ و داخستنی ئۆرگانەکانی میدیا.**[175]

هەروەك رێگەی دەستگیرکردن و رەتکردنەوەی مافی گیراوەکانی بە هۆی ئەم یاسایەوە دەدات، هەروەها دەتوانێت گیراوەکان بۆ دادگای سەربازی رەوانە بکات و بە تۆمەتی ئاڵۆز و نائاشکرای وەك "زیانگەیاندن بە دەسەڵاتی گشتی"[176] کاری تێکدەرانە بۆ نەمانی دڵنیایی خەڵك "یان"دروستکردنی مەترسی گشتی" حکوم دەدرێت. سەرەڕای ئەوە، ئەم یاسایە رێگە بە دەسەڵاتەکانی حکومەت دەدات، کە دژی هەر کەسێك بیانەوێت بە بێ هیچ هۆکار و یاسایەك کاربکەن و کارەکانیشیان لە سەرو یاسای بنچینەیی دەوڵەتەوەیە، هەرچەندە یاساکە دەسەڵاتی رەهای گرتن و بەندکردن دەداتە خودی فەرمانڕەوایی یاسای سەربازی (واتە سەرۆك)، بەڵام لە پراکتیکدا ئەم دەسەڵاتانە بەهێزەکانی ئاسایشیش دراون.[177]

سەپاندنی یاسای بارودۆخی نائاسایی بەسەر یاساکانی دەوڵەتدا مانای ئەوەیە، کە دەسەڵاتەکانی جێبەجێکردن و تەشریعی و یاسا لە دەست فەرمانڕەوای یاسای سەربازی و جێگرەکانیدایە. بەندی (١١١)ی دەستوور لە ژێر حوکمی ئەو یاسایەدا نووسراوە و رێگە بە سەرۆك دەدات کە دەسەڵاتی تەشریعی بەکاربهێنێت. بەندی (١١٣)ی دەستوور بەم شێوەیە شەرعیەت بە بارودۆخی نائاسایی دەدات: "

لە کاتی بوونی مەترسی، یان بارودۆخێکی جدی و تایبەتدا، کە هەڕەشە بن بۆ سەر یەکێتی نیشتمانی، یان سەلامەت و سەربەخۆیی نیشتمان، یان رێگە لە دامەزراوەکان بگرن تا ئەرکی دەستووریی خۆیان جێبەجێبکەن، ئەوا سەرۆك کۆمار دەتوانێت بۆ رووبەڕووبوونەوەی مەترسییەکان لە بارودۆخی ئاوادا، رێ و شوێنی

---

[174] بروانە بەندی ١٩، ١٩٩٨: ٢١، ئەنجەرینی ٢٠٠١

[175] چاودێری مافی مرۆڤ ١٩٩١: ٢٤

[176] بەندی ١٩، ١٩٩٨: ٢١

[177] ئەنجەرینی، ئۆکتۆبەری ٢٠٠١

پێویست بگرێتە بەر". سروشتی ئەو "ڕێ و شوێنانە" بە دیارینەکراوی ماوەتەوە و دەسەڵاتێکی وای بە سەرۆك و نوێنەرانی بەخشیوە، کە چۆن دەیانەوێت ئاوا دەنگی ناڕەزایی لە ناوچەکەدا سەرکوت بکەن.

**گەرەنتییەکانی ئازادی و مافی مرۆڤ، کە لە دەستوور و یاسای سزاداندا هاتوون، هیچ کاتێك جێبەجێ ناکرێن، چونکە یاسای بارودۆخی نائاسایی پێش ئەوان** کەوتووە. لە جیاتی ئەوە، ئەم دۆکیومێنتانە بۆ پشتگیریکردنی نەرمی و چاوپۆشیکردنی دەوڵەتی سووریا لە بەرامبەر ئازادیی سیاسی و دیموکراسی حوکمی یاسا بەکاردەهێنرێن.

بوونی بارودۆخی نائاسایی و ئەو دەسەڵاتانەی بۆ دەزگاکانی ئاسایش گوێزراونەتەوە، بەو مانایە دێت کە دەتوانرێت ڕێ و شوێنە یاساییەکان بەزێنرێن. ئەمەش ئەو ڕاستییە دەخاتە پێش چاو کە ئازادیی بنچینەیی نکوڵی لێدەکرێت و تۆقاندن و گرتنی هەڕەمەکی و بەندکردنی بەبێ دادگاییکردن و ئەشکەنجەدان و دیارنەمانی خەڵك شتێکی باو و بەربڵاون،[178] ئێستا زیاتر لە هەزار زیندانی سیاسی لە سووریادا هەن، کە بەبێ دادگاییکردن زیندانی کراون، هەروەك دەشێت کەسێك بە هۆی بوونی، یان خوێندنەوەی شتی سیاسی نا- بەعسی وەك ڕۆژنامەکانی حیزبە سیاسییە کوردییەکان، بە تۆمەتی سیاسیی دەستگیر بکرێت.[179]

چەمکی سەربەخۆیی یاسا لە بەندەکانی (١٣١) و(١٣٣)ی دەستووری سووریا ئاماژەی پێکراوە، بەڵام لە بواری کردەییدا ئەوە لە سووریا، لە ڕاستییەوە دوورە، یەکێك لە ڕۆڵ و پۆستە زۆرەکانی سەرۆك کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای یاسایە، کە بە هۆیەوە دادوەرەکان دادەمەزرێنێت یان لەسەرکار لایان دەبات، هەروەك دەسەڵاتی بەرچاوی لە پێکهێنان و جێبەجێکردنی یاسادا هەیە. یەکێتی پارێزەران و (نەقابەی پارێزەران) بە درێژایی ساڵانی حەفتاکان، هێنرانە ژێر کۆنترۆڵی بەعسەوە، ئەوەش کاتێك بوو کە دەستیان کرد بە گوشار دروستکردن بە مەبەستی چاکسازیی لە سیستمەکەدا.

---

[178] چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەندامی ئۆپۆزیسیۆنی HRAS ، سووریا ٢٠٠٢. نوێنەری (اخباری شرق) ڕاپۆرتی دا ژمارەی زیندانییە سیاسییەکان لە ساڵی ٢٠٠٣دا بەرزبۆوە لە ١٠٠٠ بۆ ٣٠٠٠ کەس، لەندەن ٢٠٠٤/١/٢٧.

[179] چاوپێکەوتنەکان لەگەڵ کوردەکان، سووریا (ناوەکانیان لە لایەن نووسەرەوە پارێزراوە)

دوابەدوای داگیرکردنی لوبنان لەلایەن سووریاوە لە ساڵی(١٩٧٦)داو زیادبوونی چالاکی ئۆپۆزسیۆنی، یەکێتی پارێزەران و (نەقابەی پارێزەران) زۆر چالاک بوون بەوەی سەلماندبوویان کە هێزی پێشەنگی بزووتنەوەی دیموکراتی و عیلمانین.[١٨٠] لە وەڵامی ئەوەدا، پەرلەمانی سووریا هەموو کۆمەڵە پیشەییەکانی بە بیانووی ئەوەی کە چەند"لایەنێکی کۆنەخواز دزەی کردووەتە ناویان"و"مەترسین بۆ سەر کۆمەڵگە"،[١٨١] هەڵوەشاندەوە هەموو کۆمەڵە نەتەوەیی و ناوچەییەکانی (نەقابەی پارێزەران) داخران یاسای ژمارە (٣٩) لە (٣١)ی ئابی ١٩٨١دا، بڕیاری دووبارە پێکهێنانەوەی (نەقابەی پارێزەران)ی دەرکرد بۆ ئەوەی رێگە لە ئەندامانی ئۆپۆزسیۆنی دیموکراتی بگرێت لە بەدەستهێنانی کۆنترۆڵ بەسەریدا و لە دروستکردنی کاریگەریی لە ناویدا، هەتا ئەمرۆش وەك "باڵی هەرەوەزی دەوڵەت و حیزبی فەرمانڕوا ماوەتەوە."[١٨٢]

پێویست بە وتن ناکات کە یاسادانان لە سووریا سەربەخۆ نییە، سەرۆك کۆمار سەرۆکی دادگای باڵایە و کاریگەریی بەرچاوی هەیە بەسەر یاسادا و دادوەران ئازادیی کەمیان هەیە بۆ حکومدان. چەندین پارێزەر بە هۆی بێجێگەیی لە کارە یاساییەکاندا، وازیان لە پیشەیی یاسایی هێناوە، بە شێوەیەکی گشتی، ئەوانەی بە تۆمەتی سیاسیی دەستگیرکراون لە بەردەم دادگای باڵا و دادگای دەستووریی یان دادگای باڵای ئاسایشی دەوڵەتدا گوێیان لێدەگیرێت. بەرگریکاران مافی تێهەڵچوونیان لە دژی بڕیارەکانی دادگای باڵای ئاسایشی دەوڵەتدا نییە و بە شێوەیەکی رۆتینیش پارێزەرانی بەرگریکردن مافی ئەوەیان نییە مشتەرییەکانیان ببینن و کاتیان بۆ ئامادەکردنی کەسی بەرگریکردن نادرێتێ. لە ئاکامی ئەوەشدا، چەندین زیندانی سیاسی بە حوکمی دیارینەکراو زیندانەکانی سووریایان پڕکردووە. کوردە کارا و چالاکەکانی بواری سیاسی و کولتووری کوردی بە ئاشکرا لە بەردەم دادگای ئاسایشدا بە تۆمەتی ئەندامبوون لە رێکخراوی نایاسایی و جوداخوازیی، دووچاری لێپرسینەوە دەبن.

---

[١٨٠] چاودێری مافی مرۆڤ ١٩٩١: ٨٥

[١٨١] هەمان سەرچاوە

[١٨٢] هەمان سەرچاوە

چەندین کەس لەو سەدان هاوولاتییە کوردانەی لە پشێوییەکانی ئازاری (٢٠٠٤)ەوە دەستگیرکراون، هیچ ئەگەرێکی دەرکەوتنیان لە بەردەم دادگا نییە تا ببنە جێگەی گرنگی و سەرنجی خەڵك. ئەنجامەکەشی سیستمێکە کە تێیدا حوکمی یاسا دەستی بەسەر سیستمەکەدا گرتووە، بەڵام لە راستیدا بە فەرمانی سەرۆك، نەك بە یاسای نووسراو بەڕێوە دەبرێت. [١٨٣] سزادانی بەرچاوی خەڵکی ئاسایی، کە لە رۆژئاوادا بە چالاکی رۆژانە دادەنرێت، ئەوە دڵنیا دەکاتەوە کە بزوتنەوەکانی ئۆپۆزسیۆن و سەرکردەکانیان بە شێوەیەکی دەگمەن پشتیوانی فراوانی گەل بەدەست دەهێنن .

## کەمایەتییەکان

لە سەردەمی ئینتیدابی فرەنساوە، رابردووی نەژادی و ئاینی فەرمانڕەواکانی سووریا جیاواز و گۆڕاو بوون، لەوەی تا چەند گۆڕانە ئابووری و سیاسییەکان بەسود بوون یان نا. هەرچەندە لە ژێر حوکمی حیزبی بەعسدا سەرۆکی سووریا (حافز ئەسەد و بەشار ئەسەد) و زۆربەی پشتیوانانی دڵسۆزی رژێمەکە سەر بە مەزهەبی عەلەوین، هەروەها عەلەوییەکان دەستیان بەسەر رژێمەکەدا گرتووە یان وەك (Eyal Zisser) بە"یەکەی رەسمی"دەڵێت. [١٨٤]

هەندێك لە نزیکترین هاوکارانی سەرۆك و کەسانی سەربازی پلەدار موسوڵمانی سوننەن، [١٨٥] نیازی راشکاوانەی رژێم [١٨٦] " بۆ پیادەکردنی ستراتیژێکی مەزهەبی فراوان بۆ پێکهێنانی هاوپەیمانی" هاوڕێك لەگەڵ ئەو کاراکتەرە جەماوەرییەی هەیەتی، یارمەتی داوە حوکمی خۆی بەسەر سووریادا بەهێز بکات. هەرچەندە رێژەیەکی زۆری فەرمانده سەربازییەکانی عەلەوین [١٨٧] و ئاسایشی رژێمێکیش بە شێوەیەکی بەرچاو پشت بە پەیوەندییە خێزانی و مەزهەبییەکان

---

[١٨٣] جۆرج ٢٠٠٣: ١٠٣

[١٨٤] سیزەر ٢٠٠١: ٢٥. کەرتی رەسمی، کە دەزگا رەسمییەکانی دەوڵەت دەگرێتەوە.

[١٨٥] بۆ نموونە مستەفا تلاس (وەزیری بەرگری) و عەبدولحەلیم خەددام (جێگری سەرۆك کۆمار)

[١٨٦] هەیدمەن ١٩٩٩:٣

[١٨٧] بڕی ٩٠٪ لای ئیەڵ زیسەر، بەڵام ٦٠٪ وەزیرەکانی حکومی و نوێنەران موسڵمانی سوننەن، زیسەر ٢٠٠١: ٢٥-٢٦

دەبەستێت، ئەندامانی ئەو تۆڕە خێزانی و مەزهەبییانە پۆستە ستراتیجییەکانی ناو رژێم و هێزە چەکدارەکان و کەرتی ئابووری کە (Zisser) پێی دەڵێت "یەکەی رووکەش" داگیرکردووە. ئەوەش ئەم یەکەیەیە کە ئاسایشی سەرۆك و حیزبی بەعس و رژێم دڵنیا دەکاتەوە.

دەستووری سووریا بە ئاماژەی وەك نەتەوەی عەرەب، ئامانجەکانی (شۆڕشی) عەرەبی و ئامانجی یەکێتی عەرەب سەنگین بووە، بەڵام هیچ باسێکی کەمایەتییە نەژادی و نەتەوەییەکان ناکات. سەرەڕای ئەو راستییەی کە هاووڵاتییانی سووریا وەك عەرەبی سووریا دەناسرێن، ئامانجی کۆمەڵگە و کولتوور و سیاسەت و نەتەوەش بە شێوەیەکی راشکاوانە وەك عەرەب باسکراوە (بەندی ٤٣). ئاماژەیەکی تری تایبەتیی عەرەب ئەوەیە لە کاتێکدا ئازادی باوەڕ گەرەنتی پێدراوە، کەچی هیچ گەرەنتییەك بۆ ئازادی دەربڕینی شوناسی نەژادی، کولتوور و بوونی نییە، هەروەك بە هەمان شێوەش هیچ دەستەواژەیەك نییە کە پارێزگاریی لە کەمایەتییە نەژادییەکان لەناو سووریادا بکات.

دوای گرتنە دەستی دەسەڵات لە ساڵی ١٩٧٠دا، حافز ئەسەد دەرگای ئەندامبوونی لە حیزبی بەعس و سیستمی سیاسیدا بۆ هەموو هاووڵاتیانی سووریا کردەوە، لە نێویاندا کەمایەتییە نەژادییەکانیش دەگرێتەوە، بەڵام بە مەرجێك بە عەرەبیزم رازی بن و واز لە شوناسی نەژادی خۆیان بهێنن، وەك تاکتیکێك بۆ هاندانی تێکەڵ بوون، ئەمە بە شێوەیەکی گشتی کوردی بە دوور خستبوو لەو ئازادبوونە سیاسییەی کە سەرکەوتنی ئەسەد بۆ کەمایەتییە ئاینییە عەرەبەکانی فراوانکرد، یان بۆ ئەو کەسانەی ئامادە بوون لە پێناو نوێنەرایەتی سیاسیدا واز لە شوناسی نەتەوەیی خۆیان بهێنن.[١٨٨]

کەمایەتییە نەژادی و نەتەوەییەکانی سووریا جگە لە کورد بریتیین لە: جولەکە، فەلەستینییەکان، ئەرمەنییەکان، تورکمان، قەوقازییەکان، ئاشورییەکان. ئەو گروپە کەمایەتییانەی لە چوارچێوەی شوناسی نەتەوەیدا خۆیان رێکدەخەن و رژێم کۆنترۆڵی بەسەریاندا نییە، وەك هەڕەشە بۆ سەر دەوڵەت لە رووی کولتوورییەوە

---

[١٨٨] دام ١٩٩٦: ١٧

مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت، ئەم گروپە نەتەوەییانەی کە کورد نین، بە شێوەیەکی ڕێژەیی لە ئاستی پەروەردەیی تایبەت لە کولتوور و زمانی نەتەوەییدا دووچاری کۆت و بەندی کەمتر بوونەتەوە، ئەمەش ڕەنگە لەبەرئەوە بێت، کە داوای خاکی سووریا ناکەن. لەگەڵ ئەوەدا لە ڕووی سیاسییەوە (بۆ جولەکەکان لە ڕووی ئابووریشەوە) ڕژێم سەرکوتی کردوون.[189]

پەیوەندی جولەکەکان لەگەڵ ئیسرائیلدا، ترسی دزەکردنی هێزی بیانی دروستکردووە،[190] هەروەك بەکارهێنانی مەسەلەی فەلەستین لە بانگەشە و هاشەوهوشە رەسمییەکان لە لایەن ڕژێمەوە هەمیشە ڕەزامەندی ئەوانە بە دەست ناهێنێت، کە پاڵەوانێتی دەکەن. ڕژێم ئەم گروپانە بۆ چاودێریکردنی ورد بەکاردەهێنێت و سیاسەتێکی ئاشکرای سەرکوتکردن لە دژی ئەو ڕێکخراوە سیاسییە فەلەستینییانە پیادە دەکات، کە بە شێوەیەکی چالاك پشتیوانی لە ئەسەد ناکەن.[191]

لە غیابی خۆپیشاندانی گشتی لەناو ئەم گروپانەدا لە ماوەی دوو دەیەی رابردوودا ئەنجامی کارەکانی دەوڵەتە، کە لە ماوەی ساڵانی هەشتاکاندا لە دژیان ئەنجامی داوە، هەروەك ئەنجامی ئەو تۆقاندن و چاودێرییە وردەشە، کە لە دژیان کراوە نەك نیشانەی داماڵین لە سیاسەت یان گۆڕانێکی گرنگ لە بارودۆخیاندا.[192]

کوردی سووریا لە کەمایەتییەکانی تری سووریا بەو سەرکوتکارییەی لەسەر بنەمای نەژادی لە دژیان ئەنجام دەدرێت، جیادەکرێنەوە. ئەوان هەمان کۆت و بەندی ئازادی بنچینەییان لە سەرە، کە هەموو دانیشتوانی سووریا بە گشتی و بە هەمان شێوە لە سەریانە، بەڵام سەرەڕای ئەوە، کورد لە ڕووی ڕەگەزیشەوە سەرکوتکراوە. پیادەکردنی ناسیۆنالیزمی عەرەبی لە ساڵانی پەنجاکاندا و باڵادەستی لە هاشەوهوشی سیاسی دەوڵەتدا و دامەزراندنی کۆماری عەرەبی سووریا لە ساڵی ١٩٦١دا، هەموو پێکەوە بەشداربوون لە زیادبوونی گرژییەکانی کە لەسەر بنەمای جیاکاری نەژادی دروست بووبوون. ئەمڕۆش بە سیاسیکردنی شوناسی نەژادی کورد لە لایەن دەوڵەتەوە بووەتە هۆی ئەوەی دەربڕین و بەکارهێنانی کولتوور و زمانی کوردی بە تاوان دابنرێت

---

[189] چاودێری مافی مرۆڤ ١٩٩١: ٩٩-١٠٧

[190] چاودێری مافی مرۆڤ ١٩٩١: ١٠٧

[191] چاودێری مافی مرۆڤ ١٩٩١: ١٠٦

[192] چاودێری مافی مرۆڤ ١٩٩١: ١٠٧

و بە توندیش لە لایەن دەوڵەتەوە کۆنترۆڵ و سەرکوت بکرێت. شوناسی نەژادی کورد وای لێکردوون چاودێریِ زیاتر بکرێن و توشی دەستگیرکردن و بەندکردنی هەرەمەکی ببنەوە، بگرە بە هۆی کاری ناسیاسی و دوور لە توندو تیژیشەوە، ئەوەی، کە بە چالاکی رۆژانە دادەنرێت. کورد بووەتە بابەتی چەندین رێ وشوێنی سەرکوتکاری لە سووریا و سەرکوتکاری نەژادی هەر لە کاتی سەربەخۆیی سووریاوە. هەرچەندە حافز ئەسەد لە.ساڵی (١٩٧٦)دا بە رەسمی" کۆتایی بە چەند سیاسەتێك هێنا، کە بە شێوەیەکی نێگەتیڤ کاری کردبووە سەر کەمایەتییە نەتەوەییەکان،[١٩٣] بەڵام بە شێوەیەکی نارەسمی چەندین سیاسەتی سەرکوتکاری تر بەردەوام بوو، هەروەك چەندینی تر جێبەجێکران، بە هەمان شێوەش، بڕیارەکانی پارێزگا و بەیاننامە و ئاگادارییەکان هەموویان کوردیان کردبووە ئامانجی خۆیان و ئەو دەسەڵاتە فراوانەش کە درابووە دەزگاکانی ئاسایش بە تایبەتی لە دژی کوردبوو.

لەو کاتەوەی بەشار ئەسەد لە ساڵی (٢٠٠٠) دا دەسەڵاتی گرتە دەست، چەند هەوڵێکی ئازادکردن دراون، بەڵام سووریا هەروەك دەوڵەتێکی موخابەراتی ناسیۆنالیستی عەرەبی، کە تێیدا ئازادی رادەربڕین سەرکوت دەکرێت و مافی مرۆڤ بە شێوەیەکی ئاسایی پێشێل دەکرێت، ماونەتەوە. لە چوارچێوەی ئەم دەوڵەتە دیکتاتۆرەدا، کورد وەك کەمایەتییەکی گەورەی نا-عەرەب، پێگەی تایبەتی گرتووە. هۆکاری ئەوەی کورد لە سووریا کراوەتە ئامانج ئەوەیە، کە نەژادێکی جیایان هەیە و شوناسی نەتەوەییان بە نارێك و نەگونجاو لەگەڵ شوناسی عەرەب و ئایدۆلۆجیای عەرەبی دادەنرێت، هەر ئەمەش بووەتە بانگەشە و هاشەوهوشەی شەرعیەت پێدراوی حیزبی بەعسی فەرمانڕەوا و دەوڵەت. بە لای رژێمی فەرمانڕەواوە، قەیرانەکانی بەدەستهێنانی شەرعیەت و حەزیان بۆ پارێزگاریکردن لە دەسەڵاتیان و مێژووش، وایکردووە کورد وەك هەڕەشەیەك بۆ سەر دەوڵەت و ئایدۆلۆجیاو ناسنامەکەی و ئەو یەکبوونە ناوخۆییەی هەیەتی، جیابکرێتەوە.

زیادبوونی گوشاری هەریەك لە ئەمریکا و ئەوروپا لە ساڵانی (٢٠٠٣-٢٠٠٤)دا بۆ سەر سووریا، کاریگەریی دوو لایەنەی لەبارەی سیاسەتی سووریاوە

[١٩٣] کۆتایی سیاسەتی پشتێنەی عەرەب لە ناوچە کوردییەکان، هێورکردنەوە و کەمکردنەوەی کۆسپ بوو لەبارەی جوڵە و چالاکی ئابووری جوڵەکەکان.

بەرامبەر بە کورد هەبوو. لە لایەك سووریا هەوڵی دەداتە جۆرێك لە شەفافیەت لەو کەسە یاساییانەی جێگەی سەرنجی نێودەوڵەتی بەرچاو بوون، بەکار بهێنێت. ئەمەش لە دانیشتنی دادگای چەند زیندانییەك و بڕیاری لێبووردنی چەند کەسێکی دوورخراوە (ئەوانەی لە تاراوگە بوون) نیشان درا.

ئەو کارەی سووریا یارمەتیدەر بوو لە رەواندنەوەی خەمی لایەن و رێکخراوەکانی مافی مرۆڤی ئەوروپا کە لە (رێکەوتنی کۆمەڵەی ئەوروپا)دا خرابوونە روو و بووبووە هۆی پێشخستنی پەیوەندییە ئابووری و سیاسییەکان لە نێوان ئەوروپاو سووریادا. بەڵام لە لایەکی ترەوە سووریا بەردەوام بوو لە سەرکوتکردنی هەڵسوڕاوانی بواری دیموکراسی و ئەشکەنجەدانی گیراوان و ئەو کەسە چالاك و هەڵسوڕاوانەش دەبووایە دادگایی بکرانایە، لە دادگا ترسناکەکانی ئاسایش و سەربازییەکاندا (ssscs) دادگایی دەکران، لە مانگی مایسی (٢٠٠٤)دا بەشار ئەسەد دادگاییکردنی حەوت کوردی کارای تا مانگی حوزەیران دواخست، ئەو کاتەی چەند دیپلۆماتێکی ئەوروپی گەیشتن و ئامادەی دانیشتنەکانی دادگا بوون بۆ چاودێریکردن، لە لایەن پۆلیسەوە دوورخرانەوە و لە رۆژانی دواتریشدا پاسپۆرتی کوردێکی کارا لە بواری مافی مرۆڤدا کە بڕیاربوو لە دانیمارك لە دانیشتنی پەرلەمان سەبارەت بە کوردی سووریا ئامادە بێت، دەستی بەسەردا گیراو زەوت کرا.[١٩٤]

ئەم رووداوانە بە گرنگییەوە ئەوەیان پێشاندا، کە چۆن سەرکوتکردنی کورد لە لایەن سووریاوە، لە پاڵ خەمەکانی سووریا سەبارەت بە گوشارە نێودەوڵەتییەکان و دەستوەردان لە کاروباری ناوخۆدا، زیادی کردووە.

جەنگی عێراق و رووخانی سەدام حسێن و حیزبی بەعسی عێراقیش ئەو لێکدانەوانەی سووریای قووڵ کردەوە کە لە بەردەم هەڕەشەی نێودەوڵەتی، وڵاتانی دراوسێیدایە. لە نێو ئەوانەی بە هەڕەشەی توند دانراون، کوردەکانن ئەویش لەبەرئەوەی لە کاتی جەنگدا هاوکاریی سەربازە ئەمریکییەکانیان لە باکووری عێراق کرد، بە هەمان شێوەش، زیادبوونی گوشاری دیپلۆماسی ئەمریکا بۆ سەر سووریا و دەرچوونی

[١٩٤] گامبل ٢٠٠٤

ئابلۆقەکانی (SALSA) بوونەتە هۆی دواخستنی ریفۆرم لە سووریا، ئەویش بە قوولکردنەوەی لایەنە پارێزگارەکانی ناو حکومەت.

لە پەیوەندییەکی تا رادەیەك ناکۆکدا، دەوڵەتی سووریا نکوڵی لە شوناسی نەتەوەیی کورد دەکات کە ناتوانێت لەگەڵ هاشەوهوشەی شەرعیەت پێدراوی عەرەبیزمدا هەڵبکات، بە دوای ئەوەشدا دەگەرێت کورد وەك عەرەب تێکەڵی دەوڵەت بکات. لۆجیکی پشت ئەم سیاسەتانەش ئەوەیە کە ئەوە روون بکاتەوە بۆچی دەوڵەت بوارێکی شەرعی بۆ کورد تەرخان ناکات، تا بەپێی کولتوور و تەقالیدی خۆیان هەڵسوکەوت بکەن، یان داوای سیاسی خۆیان بخەنەروو.

هێشتا لە حاڵی وادا، جگە لە چەند حاڵەتێکی دەگمەن، سەرکوتکردنی شوناسی نەتەوەیی بە شێوەیەکی نەگۆر بووەتە هۆی بەهێزکردنی شوناسی نادەوڵەتی. لەبەرئەوەی کورد دڵسۆزییەکی ناو دەوڵەتی و نیمچە دەوڵەتییان هەیە، ئەمە وایکردووە، کە وەك هەرەشەیەکی توندوتیژ بۆ سەر شوناس و ئاسایشی دەوڵەت جیابکرێنەوە و ببینرێن. وەڵامی رژێم لە سووریا لە بەرامبەر بێتوانایی بۆ تێکەڵکردنی کورد بە هەمان بنەمای هاوشێوەی هاوولاتییانی عەرەب، هەوڵدانییەتی بۆ بە زۆر تێکەڵکردن و نکوڵیکردن لە شوناسیان و سەرکوتکردنی کولتووری کوردی و بەعەربکردنی ناوچە کوردییەکان.

## باسی چوارەم
## بەعەرەبکردن

لەو راپۆرتەی ناوبەناو لەبارەی نەهێشتنی جیاوازیی رەگەزییەوە دەدرا بە کۆمیتەی نەتەوە یەکگرتووەکان، لە ١٩٩٨دا، حیزبی دەسەڵاتداری دەوڵەتی سووریا لە کۆبوونەوەیەکی دیاریکراودا ئەوەی راگەیاند: " ئێمە دەمانەوێ ئاماژە بەوە بکەین، کە لە کۆماری عەرەبیی سووریادا کێشەیەك نییە پێی بووترێ کێشەی کورد."

راپۆرتەکە لەسەر روونکردنەوەکە بەردەوام دەبێت..."کورد، لەو کاتەوە کە بە سەرتاپای وڵاتەکەدا بڵاوبوونەتەوە، کۆمەڵگەیەك پێکناهێنن، بەڵکو ئەوان بەشێکن لە پێکهاتەی کۆمەڵگەی سووریایی."

دیسانەوە، لە ئازاری/ ٢٠٠٤دا، جەماوەری بێزار، مووشەك ئاسا ناوچە کوردییەکانی سووریای هەژاندەوە. کەچی ئەحمەد ئەلعەلی، وەزیری راگەیاندنی سووریا، لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ کەناڵی ئاسمانی جەزیرەدا رایگەیاند، کە کێشەی کورد لە سووریادا نییە، هەروەها وەك دوو شتی لەگەڵ یەك نەگونجاو دەستی کردەوە بە باسی کورد و هەروەك بیەوێ بڵێت: کوردە عەرەبەکان، یان عەرەبە کوردەکان.[١٩٥]

ئەم رونکردنەوە و وێناکردنانەی کورد لە سووریا، وەکو خەڵکی کۆچەریی تورکیا و عێراق، بە شێوەیەکی بەرچاو تێکەڵی کولتووری عەرەبی سووریا و شێوازی ژیانیان بوون، کوردیان وەك کەمایەتییەکی نەژادی پەرتەوازە و لاواز لە سووریا وێنە کردووە، کە هیچ مافێکی مێژووییان بەسەر خاکەکەیەوە نییە.

سیاسەتی بەعەرەبکردن، کە لە ناوچە کوردییەکاندا ئەنجام دراوە، لەگەڵ ئەو تاکتیکانەش، کە بەکارهاتوون بۆ بەزۆر تێکەڵکردنی دانیشتوانی کورد لەنێو کۆمەڵگەی عەرەبیدا، پێکەوە وایانکردووە، کە مێژووی کورد لە ناوچە کوردییەکاندا بسڕێتەوە و خەڵکی کورد پەرتەوازە بکرێن و سانسۆر بخرێتە سەر دەربڕینی

---

[١٩٥] نەتەوە یەکگرتووەکان، CERD، کۆمیتەی نەهێشتنی جیاوازیی رەگەزایەتی ٢٦/ئۆکتۆبەری/١٩٩٨، پەرەگرافی ١٠

ئێستادا سیاسەتی دەوڵەت بەرامبەر بە کورد لە چەند لایەنێکەوە وەکو ساڵانی شەستەکان و حەفتاکان ئاشکرا نییە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە، کە هەڵوێستی دەوڵەت بەرامبەر بە کورد گۆڕانی گرنگی بەسەردا هاتبێت. پاراستنی دەسەڵات وەك خەمی سەرەکیی رژێم ماوەتەوە و زیادبوونی لێکدانەوە لەبارەی هەڕەشە دەرەکییەکانیش بە شێوەیەکی گشتی بۆتە هۆی هێشتنەوەی توندڕەوەکانی ناو رژێمەکە و بەهێزکردنی بانگەشە و هاشەوهوشەی عەرەبی و رێگرتن لە ریفۆرم و گەشەسەندنی فۆرمە بەدیلەکانی شەرعیەت، کە رێگە بەتێکەڵبوونی پێناسنامەی کوردی دەدەن. لە دوای کۆتایی پێهێنانی جەنگی سارد، سووریا لەبەردەم گوشاری دەرەکی و گۆڕانەکانی لە دینامیکی ناوچەییدا زیاتر دوورەپەرێز و لاواز بووە. لە راستیدا هەموو بەڵگەکان ئەوە دەسەلمێنن، کە سەرکوتکردنی دانیشتوانی کوردی سووریا بە هێز بەردەوامە و کورد خۆیان گەواهی ئەوە دەدەن، کە لەکاتی هاتنە سەر حوکمی بەشار ئەسەدیشەوە سیاسەتی رەگەزپەرستی بەرامبەر بە کورد زیاتر بووە. بەعەرەبکردن لە سووریا هاوشانی سیاسەتی دژ بە کورد لە عێراق و تورکیا زیادی کردووە.

لە تورکیا و عێراق بە تورککردن و بەعەرەبکردنی کورد و ناوچە کوردییەکان بەشێوەیەکی بەرچاو چەند تاکتیکێکی هاوشێوەی لەخۆگرتووە. سیاسەتی گۆڕینی دیمۆگرافیای دەستکردو دەرکردنی کورد لە زەوی و شوێنی خۆیان، لە ناوەڕاستی سییەکانی سەدەی رابردودا لە سووریا دەستی پێکرد و لە ساڵی ١٩٦٢دا دووبارە دەستی پێکردەوە. ئەم سیاسەتانە بەهەمان شێوەش لە تورکیا و عێراق جێبەجێ کراون، بە تایبەتی لەو ناوچانەی لە رووی ستراتیژیی بەرگری و ئابوورییەوە گرنگ بوون، وەك ناوچە شاخاوییە سنوورییەکانی تورکیا و کەرکوکی دەوڵەمەند بە نەوت لە عێراق. هەرچەندە بەکارهێنانی سەربازی و تاکتیکی توندوتیژانە لە عێراق و تورکیا زیاتر بووە، بە بەراورد لەگەڵ سووریادا، بەڵام ستراتیژی بنچینەیی لە پشت سیاسەتی هەموویانەوە وەك یەك بووە. نکۆڵیکردن لە بوونی کورد لە تورکیا و سیاسەتی بەزۆر تێکەڵکردن و توانەوەی کورد لەگەڵ ستراتیژی دەوڵەتی سووریاش بەرامبەر کورد، بە هەمان شێوە بەراورد دەکرێت.

پرۆژەی بەعەرەبکردن، کە کوردی سووریای کردۆتە ئامانج، بە هەمان شێوە کوردی تورکیا و عێراقیش، لەو لێکدانەوانەوە سەرچاوەی هەڵگرتووە، کە کورد بە

هۆی پێناسنامەی نەتەوەیی و نەژادییانەوە گروپێکی هەڕەشەن بۆ سەر دەوڵەت. لە سنوور و چوارچێوەی ICCRP پەیمانی جیهانی لە بارەی مافە سیڤیل و سیاسییەکان، ئەم شێوە سیاسەتە، رەگەزپەرستییە. لەگەڵ ئەوەشدا، لە راپۆرتێکدا، کە پێشکەشی کۆنگرەی نێودەوڵەتی کردووە بۆ نەهێشتنی هەموو شێوەکانی رەگەزپەرستی، دەوڵەتی عەرەبی سووریا ئاماژەی بەوە داوە کە:

"کۆمەڵگەی سووریا لە هەموو کۆمەڵگەکانی تری جیهان جیاوازە، ئەویش بە هۆی لێبووردەیی و چاوپۆشی و نەبوونی رقخوازییەوە. دیاردەی رەگەزپەرستی لە مێژووی ئێمەدا نییە و لە کۆمەڵگەی ئێمەدا شتێکی نامۆیە، کە تیایدا هەر رەفتارێك یان کارێك مەبەستی رەگەزپەرستیی لە پشتەوە بێت، بە کارێکی ناپەسەند دادەنرێت، لەبەرئەوە گەلی ئێمە لە جەنگێکی نەبڕاوەدایە بەرامبەر رەگەزپەرستی، کە سیفەتی ئایدۆلۆژیای ئیسرائیلییە."[196]

بەعەرەبکردنی ناوچە کوردییەکان و بەعەرەبکردنی خەڵکی کورد چەندین سیاسەتی جیاوازی لەخۆگرتووە. لەم بەشەدا بە وردی باسی ئەو شێوازە هەمەجۆرانە دەکرێت، کە بە هۆیانەوە پێناسنامەی کوردی و نوێنەرایەتیکردنی کۆمەڵایەتیی سیاسی و بوونی ئابووری هەروەك تۆماری جیۆگرافی و مێژوویی کورد بە ئەنقەست لە لایەن رژێمەوە دوچاری داخوران کراون.

ئەم بەشە بەسەر دوو تەوەردا دابەشکراوە. یەکەمیان باسی سیاسەتی دەوڵەت دەکات لە گۆڕینی دیمۆگرافیای ناوچە کوردییەکان. دووەمیان باسی ئەو رێگرییانە دەکات، کە بە هۆیانەوە کولتووری کوردی قەدەغە و سانسۆر کراوە، ئەویش بە ئامانجی بە زۆر تێکەڵکردن و تواندنەوەی کورد لە پێناسنامەی عەرەبیدا.

[196] Serhildanaqamislo.com, ٢٠٠٤/٣/١٥

## گۆڕینی دیمۆگرافیا

## سەرژمێری ساڵی ١٩٦٢ی حەسەکە

سەرژمێری ساڵی ١٩٦٢ی حەسەکە لە سووریا، ڕووداوێکی گرنگ بوو لە مێژووی کورددا، کە کاریگەرییەکانی بەردەوام و تەواو نالەبار بوون، بەتایبەتی لەسەر ئەوانەی ڕاستەخۆ کاریان تێکراوە. بەشێکی زۆری دانیشتوانی کورد لە سووریا بە هۆی بێبەشبوونیان لە مافی هاوولاتیبوون، ئاوارە بوون. شێوازی ئەنجامدانی سەرژمێرییەکە و ئاکامەکانی پڕبوون لە هەڵە و ناڕێکی، کە دواتر وەك کارێکی ناڕەوا و راپرسییەکی پشت پێنەبەستراو دەرکەوت. ئەنجامی سەرژمێرییەکە ئەو مافە بنچینەییانەی پێشێل کردووە، کە لە چەندین یاسای نێودەوڵەتیدا باسکراون و سووریا و یاسا ناوخۆییەکەشی پێوەی پابەندن. شکستی حکومەتی سووریا لە چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی بە هۆی سەرژمێرییەکەوە دروستبوون، ڕەنگدانەوەی هەڵوێستی دەوڵەتە بەرامبەر دانیشتوانە کوردەکەی. بایەخی ئەم مەسەلەیە لە یاسای نێودەوڵەتیدا وەك هێمایەك بۆ ڕەگەزپەرستی لە دژی کورد، هەمیشە بەردەوامە.

لە ٢٣/ ئاب/ ١٩٦٢دا حکومەتی سووریا بڕیاری (ژمارە/٩٣)ی یاسادانانی دەرکرد، کە بڕیاری دا لە ماوەی یەك ڕۆژدا سەرژمێرییەکی پەلە و نائاسایی لە پارێزگای حەسەکەی باکووری ڕۆژهەلاتی سووریا بکرێت. پێویستیی ئەنجامدانی سەرژمێرییەکە، لە خەم و نیگەرانییەکانی دەسەلاتی سووریاوە سەرچاوەی هەلگرتبوو، لەبارەی هاتنی ژمارەیەك کوردەوە دوای جەنگی جیهانیی دووەم لە تورکیاوە بۆ سووریا. کوردێکی زۆر لە تورکیا و عێراقەوە لە ترسی چەوساندنەوە و سزادانیان لە لایەن دەسەلاتدارانی ئەو دوو وڵاتەوە، بە درێژایی ساڵانی بیستەکانی سەدەی ڕابردوو هەڵهاتوون، یان کۆچیان کردووە و لە نێو کەمایەتیی کوردی سووریای ئینتیدابدا جێگیربوون. ژمارەی تەواوی ئەو کوردانەی بەو شێوەیە هاتوونەتە ناو سووریاوە نەزانراوە، بەڵام باوەڕ وایە نزیکەی ٢٥,٠٠٠ کەس بن، کە هەندێکیان پێناسنامەی

سوورییان پێدراوە.[197] بە هەمان شێوە باوەڕ وابووە، کە لەبەر هۆکاری ئابووری و خۆشگوزەرانی جەزیرە، کورد بەرەو جەزیرەی سووریا کۆچی کردبێت. لە ترسی کاراکتەری دیمۆگرافیای ناوچەکە، دەسەڵاتدارانی سووریا بانگەشەی ئەوەیان دەکرد، هەندێك کورد، کە لەبەر هۆکاری ئابووری و سیاسی کۆچیان کردووە، بە شێوەیەکی نایاسایی دۆکیۆمێنتی پێناسنامەی سوورییایان پەیداکردووە. ئامانجی سەرژمێرییەکە ئەوە بوو، کە جیاوازی بکات لە نێوان ئەوانەی مافی هاووڵاتیبوونیان هەیە و ئەوانەی، کە نییانە، هەروەك ئەوانەی بە شێوەیەکی نایاسایی پێناسنامەیان دەرکردووە.

دانیشتوانی پارێزگای حەسەکە هیچ ئاگادارنەکراون لەوەی، کە سەرژمێرییەکە دەکرێت، یان ئاکامەکانی چ دەبێت. تەنیا لە یەك رۆژدا، کە ٥/ ئۆکتۆبەر/ ١٩٦٢ بوو، سەرژمێرییەکە کراو هەر لە هەمان شەودا، لە نێوان ١٢٠,٠٠٠- ١٥٠,٠٠٠ هاووڵاتی کورد مافی هاووڵاتیبوونیان لێسەندرایەوە. سەرژمێرییەکە لە لایەن نوێنەرانی حکومەتەوە کرا، کە بە ناو شار و گوندە کوردنشینەکانی پارێزگای حەسەکەدا دەگەڕان و ماڵ بە ماڵ داوای ئەوەیان لە خەلکەکە دەکرد، کە مافی نیشتەنی خۆیان بەر لە ساڵی ١٩٤٥ لە سووریادا بە هۆی یەکێك یان ئەم سێ دۆکیۆمێنتانەی خوارەوە بسەلمێنن: پێناسنامەی سووریایی، یان کارتی خێزانی، یان تاپۆی زەوی و خانوبەرە، کە خاوەندارێتیی مولکەکە لە پێش ساڵی ١٩٤٥دا بسەلمێنێت.

لە هەمان کاتی سەرژمێرییەکەدا، سیستمی خاوەندارێتی زەوی لەم ناوچەیەی سووریادا بە شێوەی نەریتی کۆن چەسپی بوو، زۆربەی ئەو کوردانەی خاوەنی زەوی بوون، بەشێکی زۆری زەوییەکان مولکی خۆیان بوون و جوتیاری کورد تیایدا دەژیان و کاریان دەکرد. بەم شێوەیە و هەرچەندە بەشێکی زۆری ئەم جوتیارانە مافیان بەسەر ئەو زەوییانەدا هەبوو، کە کاریان تێدادەکرد و هەندێکیشیان وایان دادەنا، کە خاوەنی ئەو زەوییانەن، کە جێگەی کاریان بوو، بەڵام هیچ تاپۆیەکی ئەو زەویانەیان نەبوو. هەندێکیان پسووڵەی باجی مەڕو ماڵاتیان بەکار دەهێنا تا ئەوە بسەلمێنن، کە ئەوان پێش ١٩٤٥ لەو جێگایانەدا ژیاون، گرنگ ئەوەبوو، ئەم دۆکیومێنت و پسوڵانە ئەوەی

---

[197] نەتەوە یەکگرتووەکان، CERD، کۆمیتەی نەهێشتنی جیاوازیی رەگەزایەتی ٢٦/ئۆکتۆبەری/١٩٩٨، پەرەگرافی ٣

دەسەلماند، کە هەرگیز ئەوەش بە خەیاڵی جوتیارەکانی کورددا نەهاتووە و هەروەها هەندێکییان نەیانتوانیوە پسولەی پارەدانی باجی مەڕومالاتی پێش حەڤدە ساڵ لەوەبەر بپارێزن.[198]

هەزاران کورد، ئەوانەی، کە زانیارییە داواکراوەکانیشیان دابین کردبوو، لەگەڵ ئەوانەشی، کە نەیانتوانیبوو دابینی بکەن، هەرەوەها ئەوانەی بە ئەنقەستیش رێگری ئەوەیان لێکراوە، هەموویان پێکەوە لە سووریادا بوونە بێگانە، ئیتر ئایا بە رەچەڵەك لە تورکیا و عێراقەوە کۆچیان کردبێت یان نا.

بە پێی چەند سەرچاوەیەك، نزیکەی هەموو ئەو کوردانەی لەسەر سنوورەکانی تورکیا و عێراق دەژیان، بە بیانووی ریفۆرمی زەویوزارەوە، لەم ناوچانەدا هاوولاتیبوونیان لێسەندرایەوە.[199] هەروەها زەوییەکانیان لە لایەن دەوڵەتەوە زەوت کرا. لەوەش زیاتر ئەو جوتیارە کوردانەی لە زەوی ئەو کەسانەدا دەژیان، کە مافی هاوولاتیبوونیان لێسەندرابووەوە، لەو زەوییانە دەرکران، چونکە لە لایەن دەوڵەتەوە داگیرکرابوون و رێگری ئەو مافە دەکرا، کە کاری کشتوکاڵ لەو زەوییانەدا بکرێت. بەشێکی زۆری ئەو زەوییانە دواتر دووبارە بەسەر عەرەبەکانی سووریادا دابەشکران و لەم ناوچانەدا و لە لایەن دەوڵەتەوە نیشتەجێ کران.

ئەو کوردانەی لەلایەن دەسەلاتدارانی سووریاوە رەگەزنامەی سوورییایان لێسەندرابووەوە، وەك بێگانە تۆمارکراون و نکوڵی کرا لە هەموو ئەو مافە مەدەنییانەی پەیوەندییان بە هاوولاتیبوونیانەوە هەیە. کەسیان نەنێردراونەتەوە، هەروەك ئەو مندالانەی لەم بێگانانە لە دایك دەبوون، هەمان حسابیان بۆ دەکرا. لە جیاتی پێناسنامەی ستانداردی رەگەزنامە، کوردە بێگانەکان پارچە وەرەقەیەکی سوورییان هەڵدەگرت، کە دۆخ و حاڵەتەکەیانی لەسەر نووسرابوو. ئەو کوردانە مافی ئەوەیان نەبوو، کە پاسپۆرتیان بۆ دەربکرێت. تا ئەمڕۆش وەك بێگانە لە سووریا حسابیان بۆ دەکرێت و مافی خاوەندارێتیی موڵك و زەوییان نییە و ناتوانن بازرگانی بکەن و سلفەی دەوڵەت وەربگرن و نەخۆشخانەکانی دەوڵەت بەکار بهێنن. هەروەها لەوانەیە نەشتوانن ئۆتۆمبیلی خۆیان هەبێت و لە دامودەزگاکانی دەوڵەتدا کاربکەن،

---

[198] سەیفلسبەرگ و هاجۆ ٢٠٠٤: ٣.

[199] چاوپێکەوتنێ لەگەڵ پارێزەرێك، دیمشق، سێپتەمبەری ٢٠٠٢، ناوەکەی لە لایەن نووسەرەوە پارێزراوە.

ئەگەر لە نێویاندا هەبێت، ناتوانن وەك دوكتۆر و ئەندازیار و پارێزەر... كاربكەن. لەم پۆستانەدا تەنانەت رێگەی ئەوەشیان پێنادرێت، كە كار بۆ كۆمپانیا و كەرتی تایبەتیش بكەن. هەروەك رێگەیان پێنادرێت، كە ئۆفیسەكانی دەوڵەت بەرێوەبەرن و ناشتوانن وڵات بەجێبهێڵن.

ژنهێنانی پیاوێك، كە كوردی بێگانە بێت، لەگەڵ هاووڵاتییانی سووریادا نایاساییە و تۆمار ناكرێت. هەر منداڵێك، كە لە رێگەی ئەم جۆرە هاوسەرگیرییەوە لە دایك بێت بە مەكتومین واتە تۆمار نەكراوەكان دەناسرێن و بە ناشەرعی لە قەڵەم دەدرێن و بە هیچ شێوەیەك تۆمار ناكرێن، چونكە بە شێوەیەكی فەرمی بوونیان نییە. لەبەرئەوە ئەوان بوونەتە بابەتی جیاوازیی رەگەزایەتیی زیاتر... بڕوانە لای خوارەوە.

بە پێی ئەو چاوپێكەوتنانەی لەگەڵ چەند كوردێكی ناوەوە و دەرەوەی سووریادا كراون، جگە لە گرانی و سەختی خستنەڕووی بەڵگەی نیشتەجێبوون لە سووریا پێش ١٩٤٥و تەنیا لە یەك رۆژدا، كە سەرژمێرییەكەی تێدا ئەنجامدرابوو، چەندین هاووڵاتیی كورد بە ئەنقەست رێگرییان لێكراوە لە بەشداربوونیان لە سەرژمێرییەكەدا، چونكە ئەوان هەوڵی ئەوەیان داوە، كە پەیوەندیی نەكەن بە سوپای سووریاوە.[٢٠٠] ئاكامەكانی بەشداری نەكردن لە سەرژمێرییەكەدا بۆ ئەوانەی رێگرییان كردووە یان لە بارو دۆخەكە تێنەگەیشتوون نەزانراوە. دەسەڵاتدارانی سووریاش هەرگیز روونكردنەوەیەكیان لە بارەی سەرژمێرییەكەوە بەو كەسانە نەداوە، كە بەشدارییان تێدا كردووە، هەر بەم شێوەیە بایەخ و پەلەكردن لەكاری تۆماركردندا لە دەست درا، چونكە لە یەك رۆژدا هەموو پرۆسەكە ئەنجامدرا.

لە بنەڕەتدا كورد زۆرینەی ناوچەی جزیرە پێكدەهێنن و باوەڕیش وایە لە چوارچێوەی بازنەی دەوڵەتدا كورد هەڕەشە بووە بۆ سەر كاراكتەری عەرەبی لە ناوچەكەدا و راپەڕینی كوردی باكووری عێراقیش، كە لە ساڵی ١٩٦١ دەستی پێكردبوو، بەناو ناوچەی جزیرەی سووریادا بڵاو بووبێتەوە.[٢٠١] سەرژمێرییەكە و تۆماركردنی هەزاران كورد وەك بێگانە بە شێوەیەكی گشتی ئەوە دەگەیەنێت، كە

---

[٢٠٠] زانیارییەكە لەلایەن كۆمەڵەی كوردەكانی رۆژئاوای لەندەنەوە پێشكەشكراوە WKA ٢٧/ئۆكتۆبەر/٢٠٠٣.

[٢٠١] چاوپێكەوتن لەگەڵ پارێزەرێك، دیمەشق، سێپتەمبەری ٢٠٠٢. چاوپێكەوتن لەگەڵ نووسەرێكی كورد، دیمەشق، سێپتەمبەری ٢٠٠٢. چاوپێكەوتن لەگەڵ نوێنەری حیزبی یەكێتی دیموكراتی كورد لە سووریا. ناوەكان لەلایەن نووسەرەوە پارێزراون.

ئەمە ئامرازێکە بۆ گۆڕینی کاراکتەری دیمۆگرافیای ناوچەکە لە بەرژەوەندی عەرەب و کەمکردنەوەی ئەو هەڕەشانەی ناوچەکە دروستی کردبوون. ئەمڕۆ نزیکەی ٢٠٠,٠٠٠ هاوولاتیی کورد لە سووریا وەك بێگانە و ٨٠,٠٠٠- ١٠٠,٠٠٠ هاوولاتی دیکە وەك مەکتومین[٢٠٢] تۆمارکراون و لە ژێر کۆت و بەندێکی زۆر و بارودۆخێکی ناهەمواری پڕ هەژاری و نەبوونی مافی یاسایی، ژیان بەسەردەبەن.

جۆری دووەمی کوردە بێ ولاتەکان ئەوانەن، کە بە مەکتومین ناسراون. کوردی پارێزگای حەسەکە، کە لە ١٩٦٢ بەشداری سەرژمێرییەکەیان نەکردبوو، بوون بە مەکتومین، لەگەڵ ئەوەی ئەگەر خاوەنی رەگەزنامەی سووریاش بووبن. پاش ئەوە ئەو منداڵە کوردانەی لە یەکێك لەم دایك و باوکانەی خوارەوە لە دایك بووبن ئەم حاڵەتەیان بەسەردا سەپێنراوە:

١. هەردوو دایك و باوکەکە لە حاڵەتی مەکتومدا بن.
٢. یەکێك لە دایك یان باوك مەکتوم بێت، ئیتر حاڵەتی ئەوەی تریان هەرچییەك بێت گوێی پێ نادرێت.
٣. دایکێك، کە رەگەزنامەی سووریایی هەبێت، لەگەڵ باوکێکی بێگانەدا بێت.

ژمارەی ئەو کوردانەی، کە بە تۆمارنەکراو ناسراون، لە ساڵی ١٩٦٦دا بە پێی سەرچاوەیەکی فەرمی سووریا، ٧٥٠٠٠ کەس دەبن،[٢٠٣] بەلام بە پێی سەرچاوە کوردییەکان ئەو ژمارەیە زۆر زیاترە. تەنانەت بە ژمارەیەکی رەسمی و لەگەڵ زیادبوونی ساڵانەی ژمارەی دانیشتوان، کە بە ٢,٥٪ دەخەملێنرێت،[٢٠٤] لەوانەشە ژمارەکە لە ساڵی ٢٠٠٤دا زیاتر بێت و بگاتە ١٠٠,٠٠٠ کەس.[٢٠٥]

ئەو کوردانە، کە بە تەواوی تۆمار نەکراون، بارودۆخێکی نزمتریان لە بێگانان هەیە و هیچ ماف و هەلێکی ئەوتۆیان لە سووریادا نییە. هەندێکیان پارچەیەك وەرەقەی سپی هەڵدەگرن، کە وێنە و زانیاری خێزانەکەیانی لەسەر تۆمارکراوە و

---

[٢٠٢] بروانە لێکۆلینەوەکەی محمد گلب هیلال لەبارەی جزیرە ١٩٦٣، و چاوپێکەوتنەکەی وەزیری راگەیاندنی سووریا لەگەڵ رۆژنامەی الدستور ی ئەردەنی، ٢١/سێپتەمبەر/٢٠٠١، وەك نموونە.

[٢٠٣] سەرچاوەیەکی حوکومەتی سووریا دەڵێت، کە ٦٧٤٦٥ کورد وەك بێگانە و ٧٥٠٠٠ وەك مەکتومین تۆمارکراون، چاودێری مافی مرۆڤ ئۆکتۆبەری ١٩٩٦، پاشکۆی A.

[٢٠٤] چاودێری مافی مرۆڤ، ئۆکتۆبەری ١٩٩٦، پاشکۆی A.

[٢٠٥] بانکی نێودەولەتی، ٢٠٠٣ ب.

لەلایەن موختاری ناوچەکەوە بۆیان دەردەکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا هەموویان ناتوانن ببنە خاوەنی ئەو دۆکیومێنتە. بە شێوەیەکی گشتی دوای دڵنیابوون لە باری ئاسایش، ئەو دۆکیومێنتانە لە لایەن موختارەوە دەردەکرێن. سەرەڕای ئەوەش بڕیارەکانی پارێزگا، بەدەستهێنانی ئەو دۆکیومێنتانەی گرانتر کردووە. لە ١٥/ئۆکتۆبەر/١٩٩٩دا سەرۆکی شارەوانی پارێزگای حەسەکە یاداشتی ژمارە ج- ٧٨٨٩ی ناوخۆی دەرکرد،[٢٠٦]، کە دەسەڵاتی دەرکردنی هەر بەڵگەنامەیەکی بۆ مەکتومین لە موختار و ئیدارە ناوچەییەکان سەندەوە.[٢٠٧] سەرنجی ئەوە دەدرێت، کە لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بڕیارە بە تەواوی جێبەجێ نەکراوە، بارودۆخەکە و ژیانی رۆژانەی ئەو کوردانەی ئەو حاڵەتەیان هەیە بە شێوەیەکی بەرچاو قورستر و گران کردووە.[٢٠٨]

ئەو کوردانەی لە حاڵەتی تۆمار نەکراودان، ئەگەر بتوانن ئەو دۆکیومێنتانە بە دەست بهێنن، رەنگە رێگری چوونە قوتابخانەیان تا پۆلی شەشەم نەبێت، واتە بە شێوەیەکی ئاسایی تا تەمەنی ١٢ ساڵ. بەڵام لەگەڵ تەواوکردنی ئەو قۆناغی خوێندنەشدا هیچ بڕوانامەیەکیان پێنادرێت، لە جیاتی ئەوەش وەرەقەیەك وەردەگرن، کە تیایدا نووسراوە تا پۆلی شەشەمیان خوێندووە و هەروەك ئاماژەش بەوە کراوە، کە حاڵەتی مەکتومیان هەیە. بەم شێوەیە رێگە بە مەکتومین نادرێت دوای ئەو قۆناغە درێژە بە خوێندنی دەوڵەتیی بدەن. هەروەك ناشتوانن چارەسەر لە نەخۆشخانەکانی دەوڵەت یان لە بنکە تەندروستییەکان وەربگرن و لە دامودەزگاکانی دەوڵەتیشدا دابمەزرێن. مەکتومین هیچ مافێکی یاساییان لە سووریادا نییە. ناتوانن حاڵەتێکی یاسای مەدەنی بخەنە بەردەم دادگا. خاوەندارێتی و بە کرێدانی موڵك و خانوبەرە و زەوی و ئۆتۆمبیلیان لێ قەدەغە کراوە.[٢٠٩] ناتوانن وڵات بەجێبهێڵن یان سەفەری لوبنانیش بکەن، کە تەنانەت بۆ هاووڵاتییانی سووریا پاسپۆرتیشی پێویست نییە.

بێگانە و مەکتومین بوونەتە بابەتی جیاوازی رەگەزایەتی و رۆژانە لە پێناوی ژیانێکی ئاساییدا رووبەڕووی تەنگوچەڵەمە دەبنەوە، چونکە داواکردنی پێناسنامە

---

[٢٠٦] کۆمەڵەی مافی مرۆڤ - سووریا، نۆڤەمبەری ٢٠٠٣، بەڵگەی ٨٠٠٠٠ لەو ژمارە کوردە مەکتومانەی لە سووریان.

[٢٠٧] ل، وەك پیتی جیمی عەرەبی دەردەبڕێت.

[٢٠٨] اتحاد الشباب بڵاوکراوەی ٢٩٢، نۆڤەمبەری ٢٠٠١، ٦-٧.

[٢٠٩] کۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە سووریا، نۆڤەمبەری ٢٠٠٣: ٨

لێیان، بەشێکی رۆتینی ژیانی رۆژانەیانە لە.سووریادا. داواکردنی پێناسنامە لە کاتی گەشت و گەڕانی ناوخۆ و دامەزران لە دامودەزگاکانی دەوڵەتدا و وەرگرتنی هاوکاری و سلفەی دەوڵەتی و بە کرێدانی موڵك و شوێنە بازرگانییەکان، گرتنی ژورێکی هۆتێل یان پشکنینی ئاسایی رۆژانە، پێویستە و داواکراوە. بانگەشەی حکومەتی سووریا لەوەی ئەو کوردانەی رەگەزنامەیان لێسەندراوەتەوە "بێگانەن دزەیان کردووە و گومانی لێدەکرێ" بەهۆی ئەو راستییەی، کە تا ئێستا هیچ هەوڵێکی ئاشکرا نەدراوە لە دوای گۆڕانەکانی شۆڕشی مارسی ١٩٦٣ و بزووتنەوەی راستکردنەوەی ساڵی ١٩٧٠، بۆ ناردنەوەی ئەو کوردانە یان بەخشینی رەگەزنامە پێیان، لە جیاتی ئەوە ئەم کوردانە بەشێکی پەراوێزخراوی لایەنی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتیی سووریایان پێکهێناوە و بوونەتە کەرەستەی سەرکوتکاریی رۆژانە و بارگرانییان بەسەردا سەپێنراوە. مەبەستی فەرمی لە پشت ئەنجامدانی سەرژمێرییەکەوە ناڕاستی پێوە دیارە، ئەویش بە هۆی گەڕانەوەی هەڕەمەکی رەگەزنامە بۆ ژمارەیەك کورد، کە پێشتر و لە ساڵی ١٩٦٢دا لێیان سەندرابووەوە. ژمارەیەکی کەمی کورد، کە وەك بێگانە و مەکتومین تۆمارکراون توانیویانە بەهۆی بەرتیلدان بە بەرپرسان، رەگەزنامە وەرگرنەوە.[٢١٠]

چەند هاووڵاتییەکی کورد، کە بەر لە ١٩٤٥ لە سووریادا لە دایك بوون، لە نێویاندا ئەندامانی خێزانە ناودارەکان و بەرپرسانی کوردی سووریا هەبوون، لە ئاکامی سەرژمێرییەکەدا رەگەزنامەیان لێسەندرایەوە. لەوانەش وەك جەنەراڵ تۆفیق نیزامەدین، کە لە ساڵی ١٩٥٦دا سەرۆکی دیوان بوو، هەروەها ئیبراهیم پاشا ئەلمالی، کە یەکێك بوو لە ئەندامانی دامەزرێنەری پەرلەمانی سووریا لە ساڵی ١٩٢٨دا.[٢١١] لەوەش زیاتر و لە چەند حاڵەتێکدا ئەندامانی هەمان خێزان تەنانەت خوشك و براکان بە جیاواز تۆمار کراون. بۆ نموونە پیاوێك ساڵی ١٨٨١ لە سووریا لە دایك بووە و وەك هاووڵاتییەکی سووریایی پۆلێن کراوە، کەچی کوڕەکەی، کە ئەویش هەر لە سووریا

[٢١٠] چاوپێکەوتن لەگەڵ پارێزەرێك، دیمشق، سێپتەمبەری ٢٠٠٢. ناوەکە لە لایەن نووسەرەوە دانەنراوە.
[٢١١] چاوپێکەوتن لەگەڵ پارێزەرێك، دیمشق، سێپتەمبەری ٢٠٠٢. ناوەکە لە لایەن نووسەرەوە دانەنراوە.

ساڵی ١٩٣٥ لە دایك بووە، وەك بێگانە تۆمار کراوە، سەرەڕای ئەوەی، کە لە سوپای سووریادا خزمەتیشی کردووە[٢١٢]

بە هەمان شێوە، لە چەند بۆنەیەکدا ئەوە ڕاگەیەندراوە، کە ئەو کوردانەی وەك بێگانە یان مەکتوم تۆمار کراون، فەرمانی بەشداربوونیان لە سوپای سووریادا پێگەیشتووە و ناچارکراون خزمەتی نیشتمانی لە سوپای سووریادا تەواو بکەن. لە یاسای باری نەتەوەیی سووریادا لە بەندی ٤٤،٤٣ دا هاتووە، کە خزمەتی نیشتمانی سووریا بۆ ماوەی دوو ساڵ و نیو بۆ هەموو کەس، کە باری نەتەوەیی سوورییایی بێت و تەمەنی سەروو ١٩ ساڵ بێت، زۆرەملێیە.[٢١٣] بۆیە بە پێی خودی یاساکەی سووریا بەشداربوونی ئەو کوردانەی، کە وەك بێگانە تۆمارکراون پێشێلکاری یاسا بنچینەییەکانی ناوخۆی سووریاش دەکات. قەدەغە نییە ئەگەر کەسێك هاووڵاتی سووریا نەبێت و لە هێزە چەکدارەکاندا دابمەزرێت و وەك یاسایەکیش کورد ئەوانەشی، کە هاووڵاتی سورین داواکانیان بۆ پەیوەندیکردن بە ئەکادیمیای سەربازی و پۆلیسەوە ڕەت دەکرێتەوە، سەرەڕای خزمەتیان بۆ دەوڵەت، ئەم کوردانە لە مافە بنچینەییەکان و دۆکیومێنت و پێناسنامەی سەربازی ستانداردی سووریا بێبەشبوون.

کوردێك هەوڵی داوە پشتبەست بەو خزمەتە نیشتمانییەی هەیبووە ڕەگەزنامەی سووریا بەدەست بهێنێتەوە، بەڵام داواکەی ڕەت کراوەتەوە و ئەو دۆکیومێنتانەشی، کە وەك بەڵگەی خزمەتی سەربازی پێشانی دابوو، دەستی بەسەردا گیرا.[٢١٤]

سەرەڕای سەرژمێرییەکەی حەسەکە، ژمارەیەکی بەرچاوی کورد لە هەموو ناوچەکانی کوردستانی سووریادا بەهۆی هۆکاری سیاسیی ئاشکراوە دووچاری زەوتکردنی مافە مەدەنییەکانیان بوونەتەوە، ژمارەی ئەو کوردانەش بە ٢٧,٠٠٠ کەس زیاتر دادەنرێن.[٢١٥] هەموو ئەمانە لە نێوان ساڵانی ١٩٥٨-١٩٦١ ڕوویان داوە، کاتێك ڕژێم چەند هەڵمەتێکی لە دژی ڕێکخراوە سیاسییە کوردییەکان ئەنجامداو

---

[٢١٢] بەکێنی، سێپتەمبەری ٢٠٠٣: ٦.

[٢١٣] کۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە سووریا، نۆڤەمبەری ٢٠٠٣: ٦.

[٢١٤] خزمەتی نەتەوەیی لە ساڵی ٢٠٠٥دا کەمکرایەوە بۆ دوو ساڵ.

[٢١٥] ماکدۆوەڵ ١٩٩٨: ٥٣.

سەرژمێری حەسەکەش لە ساڵی ١٩٦٢دا رووی داو لە کاتی فەرمانڕەوایی حیزبی بەعسیش پێش کودەتای حافز ئەسەد لە ساڵی ١٩٧٠ و دواتریش.

جگە لە لێسەندنەوەی مافە مەدەنییەکان، هاووڵاتیان مافی هەبوونی پاسپۆرتیشیان لی زەوت کرابوو، چونکە مافی بەجێهێشتنی وڵات بە شێوەیەکی یاسایی رێگری لێدەکرێت.

## سەرژمێری حەسەکە و یاسا...

### باری نەتەوایەتی لە یاسادا:

بەندی ١٥ لە جاڕنامەی جیهانیی مافی مرۆڤ ئەوە روون دەکاتەوە کە:"هەموو کەس مافی نەتەوایەتی هەیە، هیچ کەسێك نابێت بەبی هۆکارێك لە مافی نەتەوایەتی بێبەش بکرێت".

"بە هەمان شێوە یاسای سووریاش ئاماژە بەوە دەکات، کە نەتەوایەتیی مافێکی مرۆڤە و هەموو کەس بەبی جیاوازی لە سەرەتای لە دایك بوونییەوە مافی نەتەوایەتیی هەیە و هێمای ئەوەش دەکات، کە مافی نەتەوایەتی ناتوانرێت بە شێوەیەکی هەرەمەکی زەوت بکرێت."[٢١٦] لە رووی تیۆرییەوە، یاسای سووریا گەرەنتی پێدانی رەگەزنامە دەدات بەو منداڵانەی، کە لە دایك و باوکێکی سوورییایی یان ئەوانەی لەسەر خاکی سووریا لە دایك دەبن. بەندی ٢٠ لە دەستووری حیزبی بەعس هەموو مافێکی نەتەوەیی بە هەموو ئەو نەتەوانە دەدات، کە لە خاکی عەرەبدا دەژین و حیزبەکە خۆی بۆ نەتەوەی عەرەب تەرخان کردووە و لە پێکهێنانی بلۆکی رادیکاڵی خۆی بەدوور دەگرێت.

باری نەتەوایەتی لە سووریا لە رێگەی باوکەوە دەگوازرێتەوە، نەك لە رێگەی دایکەوە. ئەمەش بۆ خۆی پێشێلکاری ئەو یاساغ کردنە نێودەوڵەتییە، دژی سەرکوتکاری هەردوو رەگەزی نێر و مێ، کە لە بەندی (٢٣)ی پەیمانی جیهانی لەبارەی

---

[٢١٦] بەکێنی، سێپتەمبەری ٢٠٠٣: ٤.

مافەکانی سیڤیل و سیاسییەوە هاتووە. منداڵێك ئەگەر لە باوکێکی مەکتوم یان بێگانە و دایکێکی سووریایی لە دایك بێت، وەك مەکتوم تۆمار دەکرێت، واتە حاڵەکەی لە دایکییەوە بۆ نامێنێتەوە. بە پێشێلکاری یاساکەی خۆیان، کە باری نەتەوایەتی لە رێگەی باوکەوە دەگوازرێتەوە. ئەگەر منداڵێك لە سووریا لە باوکێکی بێگانە و دایکێکی مەکتوم بێت، ئەوا راستەوخۆ منداڵەکەش دەبێت بە مەکتوم، بە هەمان شێوەش ئەگەر پیاوێکی سووریایی ژنێکی مەکتوم بخوازێت، منداڵەکانیان دەبنە مەکتوم.[217] مامەڵەکردنی دەوڵەتی سووریا بەرامبەر بە کورد، بە شێوەیەك پەیڕەوی سەرکوتکردنی کورد و تا رادەیەکیش پێشێلکردنی یاساکانی دەوڵەتیشە.

یاسای سووریا مافی هاوولاتیبوون دەداتە هەموو ئەوانەی، کە لە ۲۱/شوبات/۱۹۵۸ بە دواوە بە رەگەز سورین و ئەوانەش، کە رەگەزنامەی کۆماری یەکگرتووی عەرەبییان لە نێوان ساڵانی ۱۹۵۸-۱۹٦۰ هەیە.[218] بەندی سێیەمی یاسای نەتەوایەتی سووریا و بڕیاری ژمارە/۲۷٦ی ساڵی ۱۹٦۹ مافی بەدەستهێنانی رەگەزنامەی سووریایی فراوانتر دەکاتەوە بە بوونی مافی زەوی و هاوخوێنییەوە. بەم شێوەیە، هەموو ئەو منداڵانەی، کە بەهۆی یەکێك لەم شێوازانەی خوارەوە لە دایك دەبن، رەگەزنامەی سووریا وەردەگرن.

- منداڵێك، کە لە خاکی سووریادا لە باوکێك بێت،کە رەگەزی سووریایی بێ، لە ناوەوە یان دەرەوەی سووریادا بێت.
- منداڵێك، کە لە ناو سووریادا و لە دایك و باوکێکی غەریب بێت، کە منداڵەکە نەتوانێت باری نەتەوایەتییان بە دەست بهێنێت.
- منداڵێك، کە لە ناو سووریا و لە دایك و باوکێکی نەناسراو بێت و باری نەتەوایەتییەکی زانراویان نەبێت، یان بێ وڵات بن. یاسای نەتەوایەتیی سووریا، بەندی/۳.

بە پێی یاسا، منداڵێك، کە لە سووریا لە دایك بێت و وەك بێگانە تۆمار بکرێت، یان مەکتوم بێت، واتە لە دایك و باوکێکی غەریب لە دایك ببێت، کە منداڵەکە نەتوانێت باری نەتەوایەتییان بە دەست بهێنێت مافی یاسایی هەیە، کە

---

[217] چاوپێکەوتن لەگەڵ پارێزەرێك، دیمشق، سێپتەمبەری ۲۰۰۲. ناوەکە لە لایەن نووسەرەوە دانەنراوە.

[218] زانیاریەکە لەلایەن ۲۰۰۵ Europaisches Zentrum fur Kurdisches Studien) Berlin, January ) دراوە.

ڕەگەزنامەی سووریا بەدەست بهێنێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کورد ئەم مافەشی پێ نەدراوە!

لەبەر ئەوەی، کە کورد وەك بێگانە تۆمار دەکرێن، مافی ئەوەیان نییە پاسپۆرت یان دۆکیومێنتی گەشتیاری دەربکەن، منداڵانی کوردی بێگانە بە شێوەیەکی پێویست لەسەر خاکی سووریا لە دایك دەبن، کەچی بێ وڵاتن. مەکتومینی سووریا بە تەواوی دروستکراوی سووریان. ڕەگەزنامەی سورییان لی ناسەندرێتەوە، چونکە هەرگیز نەیانبووە، بەڵام لەسەر خاکی سووریا لە دایك بوون و لەبەرئەوە مافی ڕەوای خۆیانە لە ڕێی داوا پێشکەشکردنەوە ڕەگەزنامەی سووریا بەدەست بهێنن. بەڵام دیسانەوە یاسای سووریا وا دەرناکەوێت، کە ئەوە بۆ ئەم جۆرە کوردانە بکات.

لە سەرو ئەوەشەوە دەکرێ ڕەگەزنامەی سوورپایی لە ڕێگەی ئیسقاتی جنسییەی نەتەوە بیانییەکانەوە بە دەست بهێنرێت. لەم بارەدا ئەو کەسانە پێویستە تەمەنیان ١٨ ساڵ، یان سەروتر بێت و ماوەی پێنج ساڵ لە سووریادا نیشتەجی بووبن و لە ساڵێك زیاتر سووریایان بەجێ نەهێشتبێت و دووچاری نەخۆشییەك نەبووبن و توانای کارکردنیان هەبێت و خاوەنی رابردوویەکی باش بن و شارەزاییان لە شتێکدا هەبێت، کە سوود بە دەوڵەت بگەیەنێت. هەروەها پێویستە توانای خوێندنەوە و نووسینیان بە زمانی عەرەبی هەبێت.[٢١٩] منداڵانی خوار تەمەنی ١٨ ساڵ، دەتوانن مافی نەتەوایەتی سوورپایی بەدەست بهێنن، بەبی ئەوەی داوا پێشکەش بکەن، ئەگەر لەو وڵاتە نیشتەجی بن. ئەو منداڵانەی، کە مافی نەتەوایەتی بە دەست دەهێنن، لەسەرو ١٨ ساڵەوە بن، پێویستە بۆ ماوەی دوو ساڵ لە سووریا نیشتەجی بووبن بەر لەوەی بتوانن داوا پێشکەش بکەن بۆ بەدەستهێنانی ڕەگەزنامە.[٢٢٠] بەڵام هێشتا بۆ کوردە بی وڵاتەکان پشتبەست بەو ڕاستییەی، کە هەڵگری هیچ ڕەگەزنامەیەکی تر نین، لەوە دوورخراونەتەوە، لە کاتێکدا دەیانتوانی بە کەڵك وەرگرتن لەم یاسایە ئەو کارەیان بۆ بکرێت.

لەگەڵ ئەوەشدا پێشکەشکردنی داوا بۆ بەدەستهێنانی ڕەگەزنامەی سوورپایی، ڕەزامەندی نووسینگەی کۆچکردن پێویستە، وەزیری ناوخۆ و سەرۆکی وڵات، مافی

---

[٢١٩] فەرمانی ژمارە/٦٧، بەندی/١، ٣١/ئۆکتۆبەر/١٩٦١.

[٢٢٠] چاوپێکەوتن لەگەڵ پارێزەرێك، دیمەشق، سێپتەمبەری ٢٠٠٢. ناوەکە لە لایەن نووسەرەوە دانەنراوە.

ئەوەیان هەیە هەر داوایەك بیانەوێت رەتی بکەنەوە. بەخشینی رەگەزنامە بە کەسێك، پێویستە دواتر لە بڕیارێکی سەرۆکایەتیدا رابگەیەنرێت. بەم شێوەیە پەیوەندی دەوڵەت بە کوردەوە بە تۆمەتی هەڕەشەی ئاسایش و خیانەتکاری، مانای ئەوەیە زۆر بە دەگمەن کورد رەگەزنامە، یان مافە مەدەنییەکان بەدەست دەهێنێتەوە. هەر بەو شێوەیەش کوردێکی مەکتوم، کە دایکی هاووڵاتی سووریا بێت و باوکی بێگانە بێت، رەنگە هەوڵ بدات حاڵەتەکەی خۆی بە رێگەی یاسایی بگۆڕێت، کە تیایدا دادگا و پۆلیس و دەزگاکانی ئاسایش بەشدار دەبن.[221] دیسانەوە بەشداریی ئەم دەزگایانە لەم جۆرە کارانەدا و رقی سروشتیان بەرامبەر بە کورد ئەوە دەگەیەنێت، کە سەرکەوتن لەو جۆرە مەسەلانەدا شتێکی مەحاڵە.

بە گشتی بەدەستهێنانی رەگەزنامەی سووریایی بۆ نەتەوە بێگانەکان ئاسانترە، بە تایبەتی ئەوانەی لە دەوڵەتە عەرەبییەکانەوە هاتوونەتە ناو سووریاوە، یان منداڵانی عەرەبی بێگانە، کە لە سووریا نیشتەجێن، بەراورد لەگەڵ کوردانی بێگانە و مەکتومین. بەدەستهێنانی مافی نەتەوەیی لە سووریادا لە لایەن عەرەبە بیانییەکانەوە بەوە ئاسانکاری تێدا کراوە، کە عەرەب پێویستە تەنیا دوو ساڵ لە سووریا نیشتەجێ بێت و منداڵە نیشتەجێبووەکانیشیان بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بەبێ ئەوەی داوا پێشکەش بکەن، رەگەزنامە بەدەست دەهێنن.

هەروەك نەتەوەکانی عەرەب پێویست ناکات بە بڕیارێکی سەرۆکایەتی وەرگرتنی رەگەزنامەکانیان رابگەیەنرێت و جنسیەی تایبەت ببەخشرێت بەو عەرەبانەی خزمەتی نیشتمانیی تایبەت بۆ دەوڵەتی سووریا ئەنجام دەدەن.[222] لەوەش زیاتر لە یاسای دەوڵەتی سووریادا ئاماژە بەوە کراوە، کە بیانییەکان دەتوانن لە رێگەی ئەنجامدانی هاوسەرگیری لەگەڵ هاووڵاتییەکی سووریادا رەگەزنامەی سووریایی بەدەست بهێنن، یان نیشتەجێبوون بۆ ماوەی پێنج ساڵ یان زیاتر لەو وڵاتەدا.[223] بەڵام ئەم یاسایە وا دەرناکەوێت، کە بێگانە و مەکتومین بگرێتەوە، ئەوانەی، کە بە بەردەوامی مافی هاووڵاتیبوونیان نکوڵی لێدەکرێت و هاوسەرگیرییان نایاسایییە.

---

[221] چاوپێکەوتن لەگەڵ پارێزەرێك، دیمەشق، سێپتەمبەری ٢٠٠٢. ناوەکە لە لایەن نووسەرەوە دانەنراوە.

[222] زانیارییەکە لەلایەن (Europaisches Zentrum fur Kurdisches Studien)Berlin, January ٢٠٠٥ )

[223] چاوپێکەوتن لەگەڵ پارێزەرێك، دیمەشق، سێپتەمبەری ٢٠٠٢. ناوەکە لە لایەن نووسەرەوە دانەنراوە.

بۆچوونی فەرمیی دەوڵەتی سووریا وایە، کە دانیشتوانی کوردی سووریا لە تورکیا و عێراقەوە کۆچیان کردووە، لەبەرئەوە کورد بە لای سووریاوە هیچیان بە هاووڵاتی دانانرێن. لەم رووەوە، سەرەڕای یاساکانی ناوخۆی سووریا، نکوڵی بەردەوامی پێدانی رەگەزنامە بەوانەی لە سەرژمێری حەسەکەی ساڵی ١٩٦٢ لێیان سەندرابۆوە، پشت بەستە بەو گریمانەیەی، کە کورد هاووڵاتیی شوێنێکی ترە، لەبەرئەوە دەوڵەت نکوڵی لە پێدانی رەگەزنامە دەکات، هەرچەندە مافێکی یاسایی خۆیانە. دیسانەوە ئەم بیرکردنەوەیە بەهۆی ئەو راستییەوە دووچاری شکست و گومان بووە، کە کورد بۆ هیچ وڵاتێکی بنەڕەت نەگەڕێنراونەتەوە و ژمارەیەکی گرنگیان رەگەزنامەیان بە هۆکاری سیاسیی ئاشکرا لی سەندراوەتەوە.

## مافەکانی منداڵ

بەندی (٢٤٢)ی پەیمانی جیهانی لەبارەی مافەکانی سیڤیل و سیاسییەوە ئاماژە بەوە دەکات، کە: "هەموو منداڵێك راستەوخۆ دوای لە دایك بوون تۆمار دەکرێت و ناوێکی دەبێت". هەروەك داوا لە دەوڵەتان دەکات، لەوە دڵنیابن هەموو منداڵێك، کە لەسەر خاکەکەیان لە دایك دەبن، رەگەزنامەیان پێبدرێت، بە تایبەتی ئەگەر ئەو منداڵە بی وڵاتیش بێت.[٢٢٤] رێ پێنەدانی رەگەزنامە بە منداڵان، بەندی حەوتەمی ١٩٨٩ لە کۆبوونەوەی مافەکانی منداڵان، پێشێل دەکات، کە سووریا لە سێپتەمبەری ١٩٩٠دا واژۆی کرد و لە نیسانی ١٩٩٣دا هەمواری کرد.

لە یاسای ناوخۆی سووریادا، کە لە سەرەوە ئاماژەی پێکرا، ئەگەر منداڵێك لەسەر خاکی سووریا و لە دایك و باوکێك بێت، کە نەتەوایەتییان نەزانراوە، یان بی وڵاتن، یان منداڵەکە نەتوانێت باری نەتەوایەتی ئەوان بەدەست بهێنێت، مافی ئەوەی هەیە رەگەزنامەی سووریا وەربگرێت. دەسەڵاتدارانی سووریا حاشا لەوە دەکەن، کە منداڵێك لە سووریادا بەبی ناو، یان باری نەتەوایەتی هەبێت.[٢٢٥] بەڵام بە پێی چەند

[٢٢٤] یاسای دەسکەوتنی هاونیشتمانیی سووری، ژمارە/٢٧٦، ١٩٦٩، بە گەواهی کۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە سووریا، نۆڤەمبەری ٢٠٠٣: ٦.

[٢٢٥] کۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە سووریا، نۆڤەمبەری ٢٠٠٣: ٧-٨

سەرچاوەیەکی کوردیی نزیکەی ٢٥,٠٠٠ منداڵی کورد بێ وڵاتن، یان وەك بێگانەو مەکتومین تۆمارکراون.[٢٢٦] بوونی بەشێکی کورد، کە بە مەکتومین ناسراون لە خۆیدا بەرهەمی نکوڵیکردنی پێدانی ڕەگەزنامەیە بە کوردی بێگانە و دانپیانەنانی هاوسەرگیرییانە. بەم شێوەیە منداڵانی کوردی بێگانە و مەکتومین بە بەردەوامی بەربەستی ئەوەیان لێکراوە، کە ڕەگەزنامەی سووریایی وەربگرن و هەموو ساڵێکیش کێشەکانیان بەرەو زیادبوون دەچێت، بەڵام بە بەراوردی ئەوەی منداڵانی عەرەب، کە لە سووریا نیشتەجێن بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی و بەبێ ئەوەی ناچار بکرێن بۆ ماوەیەك نیشتەجی بن، ڕەگەزنامە وەردەگرن.[٢٢٧]

## تۆمارکردنی لە دایکبووان...
## مردن و هاوسەرگیری

تا ساڵی ١٩٩٩، دایك و باوکی منداڵانی مەکتوم، دەیانتوانی لە لای موختار یان سەرۆکی گوند داوای بەرگە بۆ منالەکانیان بکەن. بەڵام وا پێویست بوو، کە پێش ئەوەی منداڵەکانیان تۆمار بکەن، سەردانی دەزگاکانی ئاسایش بکەن و ئەستۆپاکی خۆیان بسەلمێنن. تەنانەت ئەو منداڵانە بەڵگەی لەدایکبوونیشیان بۆ دەرنەدەکرا، وەرەقەیەکیان وەردەگرت، کە تیایدا نووسرابوو، ئەو کەسە منداڵی دایك و باوکییەتی. ئەم پرۆسەیە زۆرجار چەند مانگێکی پێدەچوو تا تەواو دەبوو، بە درێژایی ئەو کاتەش دان بە بوونی منداڵەکەدا نانرێت و هیچ ناوێکی فەرمی یان حاڵەتێکی فەرمییان لە سووریادا نابێت. گرانی و سەختی ئەم پرۆسەیە و چەندین بۆنە و حاڵەت، کە تیایدا ئەستۆپاکی ئاسایش بە داواکەران نادرێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە چەندین کوردی مەکتوم هەرگیز تۆمار نەکراون.

لە ساڵی ١٩٩٩دا ئیتر ئەوە قەدەغەکرا، کە موختار بتوانێت هیچ دۆکیومێنتێك بۆ مەکتومین دەربکات، کە ئەم وەرەقانەش قەدەغە بکرێت، ئەوا ئیدی

[٢٢٦] کۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە سووریا، نۆڤەمبەری ٢٠٠٣: ٧.

[٢٢٧] بەکێنی، سێپتەمبەری ٢٠٠٣، کۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە سووریا، نۆڤەمبەری ٢٠٠٣: ٧-٨.

کوردی مەکتوم هیچ بوونێکی فەرمیی لە سووریادا نابێت و تەنانەت ناشتوانن بە پاسی دەوڵەتیی هاتوچۆ بکەن. کوردی مەکتوم، لەبەرئەوەی بە شێوەیەکی فەرمی لە دایك نەبوون، هەر بۆیە مردنیشیان تۆمار ناکرێت.

لە بەندی (٢٣)ی پەیمانی جیهانی لەبارەی مافەکانی سیڤیل و سیاسییەوە، مافی هاوسەرگیری دەستەبەر کراوە:

"مافی پیاو و ژن لە تەمەنی هاوسەرگیرییدا بۆ پێکەوەنانی ژیانی هاوسەریو پێکهێنانی خێزان دانی پیانراوە".

بە هەمان شێوەش بەندی (١٦)ی جارنامەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکانیش لە بارەی مافی مرۆڤەوە دەڵێت:

١. ژن و پیاو لە تەمەنی تەواویاندا بەبێ هیچ سنوور بەندییەك بەهۆی نەژاد، نەتەوە، یان ئاینەوە، مافی ئەوەیان هەیە هاوسەرگیری ئەنجام بدەن و خێزان پێکبهێنن. هەردوولاش مافی یەکسانی هاوسەرگیری و لە یەك جیابوونەوەییان هەیە.

٢. هاوسەرگیری تەنیا کاتێك ئەنجام دەدرێت، کە رازیبوونی ئازاد و تەواوی ژن و پیاوەکەی لە گەڵدایە.

٣. خێزان یەکەی گروپی بنچینەیی و سروشتی کۆمەڵگەیە و شیاوی پارێزگاریکردنە لە لایەن کۆمەڵگە و دەوڵەتەوە.

لە سووریا هاوسەرگیریی کچێکی سووریایی لەگەڵ کورێکی بێگانە یان مەکتومدا قەدەغە و نایاساییە. لەبەرئەوە مەراسیمی هاوسەرگیری بە شێوەیەکی نافەرمی ئەنجام دەدرێت و بە تۆمار نەکراوی بەسەر دەوڵەتدا تێدەپەڕێت.

لە وەڵامی حکومەتی سووریا بۆ راپۆرتی رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ، ساڵی ١٩٩٦ لەبارەی کوردی سووریاوە، هاتووە کە:

"ئەگەر لە حاڵەتێکدا کچێکی سووریایی ئەو مەترسییە بگرێتەبەر و شوو بە کەسێکی بێگانە بکات، ئەو هاوسەرگیرییە بە نایاسایی دادەنرێت".[٢٢٨]

---

[٢٢٨] چاوپێکەوتن لەگەڵ پارێزەرێك، دیمەشق، سێپتەمبەری ٢٠٠٢. ناوەکە لە لایەن نووسەرەوە دانەنراوە.

ئاكامی ئەوەش بۆ خێزانە کوردەکان گرنگە. وەك لە سەرەوە باسکرا، منداڵانی ئەو هاوسەرگیرییە بە هیچ شێوەیەك تۆمار ناکرێن و ئەوپەرەکەی پارچەیەك کاغەزی سپییان دەدرێتی، کە وێنە و زانیاری لە بارەی خێزان و دۆخەکەیانەوە لەسەری دەبینرێت. لەسەر دۆکیومێنت و پێناسنامەی خێزاندارەکانیش وەك سەڵت ناونووس دەکرێن. ئەگەر ژنێکی سووریایی شوو بکات بە پیاوێکی بێگانە یان مەکتوم، ئەوا زەوی و موڵکەکانیان پێویستە بە ناوی ژنەکەوە تۆمار و تاپۆ بکرێت. هەر بەو شێوەیەش، لە دوای مردنی ژنەکە موڵکەکە نە بۆ مێردەکەی و نە بۆ منداڵەکانی بەجێنامێنێت. بەڵکو لە جیاتی ئەوە موڵکەکە دەگوازرێتەوە بۆ ماڵە دایکانی، خۆ ئەگەر کەسیشی نەبوو بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەگوازرێتەوە بۆ دەوڵەت.

## سایەو پەناگا

بەندی (١٧)ی جاڕنامەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ دەڵێت:

- هەموو کەس مافی ئەوەی هەیە، کە بە تەنیا، یا لەگەڵ کەسانی تردا موڵکی هەبێت.
- نابێت هیچ کەسێك بە شێوەیەکی هەڕەمەکی و بەبێ هۆکار لە موڵکەکەی بێبەش بکرێت.

دەرکردنی کورد لە ماڵ و حاڵی خۆی و نکوڵیکردن لەو مافەی، کە کوردی بێگانە و مەکتومین لە سووریا خاوەنی موڵك و ماڵ بن، یان بە کرێی بدەن، لە خۆیدا سەرپێچیکردنی ئەو بنەمایانەیە.

وەك لە سەرەوە باسکرا، ئەو منداڵانەی مەکتومن موڵکیان لە دایك و باوکیانەوە بۆ نامێنێتەوە، کە ڕەگەزنامەی سووریاییان هەبێت. لەبەرئەوە نەوە لە دوای نەوە، مەکتومین زیاتر لە زەویوزار و ماڵی باوباپیرانیان دوور دەخرێنەوە و بێبەش دەکرێن.

بە هەمان شێوە ڕێگەیان پێنادرێت موڵك، یان تەنانەت ژوورێکی هۆتێلیش بە کری بگرن. کوردی بێگانە و مەکتومین داوایان لێدەکرێت لای لقی ناوخۆی ئاسایش

داوا پێشکەش بکەن، تا مۆڵەت وەربگرن بۆ ئەوەی بتوانن شەو لە هۆتێلێکدا بمێننەوە، هەندێك جار ئەو مۆڵەتەش نادرێت. ئەم کۆت و بەندە چەندین کێشە بۆ ئەو کوردە بێ وڵاتانە دروست دەکات، کاتێك بەناو سووریادا بگەڕێن یان بیانەوێت کارێك بدۆزنەوە.

زۆرئاوا ناوچەیەکە لە کەناری دیمەشق، لە لایەن کوردەکانی جەزیرەوە دروستکراوە، ئەوانەی، کە لە دیمەشق کاردەکەن و توانایان نییە خانوو لەناو، یان نزیك شارەکە بکڕن، یان بە کرێی بگرن. هەموو خانووەکان بەبێ مۆڵەتی دەوڵەت دروستکراون و ڕەنگە لە هەر کاتێکدا بێت دەوڵەت بیانڕووخێنێت.

## مافی خوێندن

ئازادیی خوێندن و مافی خوێندن لە لایەن جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، دەستەبەر کراوە، بەندی ٢٦ ی جاڕنامەکە دەڵێت:

١. هەموو کەس مافی خوێندنی هەیە. خوێندن بە خۆڕایی دەبێت، بەلایەنی کەمەوە لە قۆناغی سەرەتایی و بنەڕەتیدا. خوێندنی سەرەتایی ئیجباری دەبێت. خوێندنی تەکنیکی و پیشەیی بە شێوەیەکی گشتی فەراهەم دەکرێن و خوێندنی باڵاش بە شێوەیەکی یەکسان و لەسەر بنەمای لێهاتوویی بۆ هەموان دەبێت.

٢. خوێندن بە مەبەستی گەشەسەندنی کەسایەتی مرۆڤ و بەهێزکردنی ڕێز بۆ مافی مرۆڤ و ئازادییە بنچینەییەکان ئاراستە دەکرێت. هان و پەرە بە تێگەیشتن و لێخۆشبوون و هاوڕێیەتی لە نێوان گروپە نەتەوەیی نەژادی و ئاینییەکان دەدات و چالاکییەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پارێزگاریکردن لە ئاشتی زیاتر دەکات.

٣. دایك و باوك مافی ئەوەیان هەیە جۆری ئەو خوێندنە هەڵبژێرن، کە دەدرێت بە منداڵەکانیان.

دەستووری سووریا ئاماژە بەوە دەکات، کە خوازیارە خوێندنی جیهانی دەستەبەر بکات. بەڵام ڕێ نەدان بە مافی خوێندن بۆ کوردانی بێگانە و مەکتومین خاڵی ناکۆکی و پێچەوانەی ئەو یاسا هەرە بنچینەییانەیە.

ئەوە ڕاگەیەندراوە، کە مەکتومین ڕێگەیان پێنادرێت بچنە قوتابخانە هەتا ڕەزامەندی هۆبەی سیاسی دەزگای ئاسایش بە دەست نەهێنن[229]

ڕاپۆرتی ڕێکخراوی چاودێری مافەکانی مرۆڤ لە ساڵی ١٩٩٦، لەبارەی سووریا و کوردەوە سکاڵای پیاوێکی کورد دەخاتەڕوو، کە ویستویەتی منداڵەکەی لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی بەم شێوەیە تۆماربکات:

"پیاوەکە ئاماژەی بە کچە گەنجەکەی کرد و وتی پێویستم بە ٢٩ ڕۆژ هەبوو بۆ ئەوەی سەردانی بنکەی پۆلیسی ڕاوێژکار و بەشی ئاسایش و ئۆفیسی ڕەگەزنامە بکەم، تەنها بۆ ئەوەی لە پۆلی یەکەم ناونووسی بکەم. دواتر دەبووایە موختار سەردانی ئاسایشی سیاسی بکات، کە بێن و منداڵەکە ببینن. پیاوەکە وتی: کارەکانی ئاسایش هێندەی تر بارودۆخەکەیان گرانتر کرد، تەنانەت زیاتر بە ئازارتر بوو بۆ هەندێك خێزان. چونکە ئەوان پێیان دەوتین، کە ئەم منالآنە هی خۆمان نین، لەوانەیە لە ئیسرائیل و تورکیاوە هاتبێتن"[230]

ناونووسکردنی منداڵ وەك مەکتوم تا بچن بۆ قوتابخانە بە پێی یاسا ڕێپێدراو نییە و تەنیا لە کاتێکدا ڕێگەیان پێدەدرێت ئەگەر بەڵگەی موختاریان پێبێت.[231]

هەروەها ڕێگە بە منداڵی تەمەن سەرو شەش ساڵان نادرێت، کە بچێتە بەر خوێندن لەبەرئەوەی لەگەڵ تاقیکردنەوەی بڕوانامە ستاندارەکان ناگونجێت، کە لە کۆتایی ئەو ساڵەدا ئەنجامی دەدەن.

بە شێوەیەکی ئاسایی خوێندکار ئەگەر لە ساڵی شەشەمدا سەرکەوتوو بوو، ئەوا دیپلۆم بەدەست دەهێنێت. هەرچەندە هیچ هەڵسەنگاندنێکیان بۆ ناکرێت ئەگەر بێتو لە تاقیکردنەوەکانیشدا دەربچن و بەڵگەکان بە پێی مەکتومین مامەڵەیان پێدەکرێت و لە لایەن وەزارەتی پەروەردەوە ناناسرێت. کوردە بێگانەکان دەتوانن بچنە زانکۆ لە کاتێکداکە نمرەیەکی بەرز بە دەست دەهێنن و نابنە بابەتی ئەوەی جیابکرێنەوە بە پێی ئەوەی کوردن بەڵکو وەك بێگانە ناونووس دەکرێن. لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانن دابمەزرێن

---

[229] چاودێری مافەکانی مرۆڤ ئۆکتۆبەری ١٩٩٦، پاشکۆی A.

[230] چاوپێکەوتنەکان لە سووریا، ئۆگۆستی ٢٠٠٢، و لە ئەورووپا، دیسەمبەری ٢٠٠٢ ناوەکان لە لایەن نووسەرەوە پارێزراوە، چاودێری مافەکانی مرۆڤ، ئۆکتۆبەری ١٩٩٦: ٢٢.

[231] چاودێری مافەکانی مرۆڤ، ئۆکتۆبەری ١٩٩٦: ٢٢.

یان لە بوواری شارەزایی خۆیاندا بە شێوەیەکی سەربەخۆ وەك پارێزەر یان پزیشك کاربکەن. کورد دەیەوێت لەو بووارانەدا کار بکات لەبەرئەوەی ئاواتەخوازن خۆیان رۆشنبیر بکەن و پلە و پایە لەناو کۆمەڵگەی کوردییدا بە دەست بهێنن و هیوادارن رۆژێك لە رۆژان بارودۆخەکەیان گۆڕانی بەسەردا بێت.[٢٣٢] سەرەڕای ئەوەش چەند خوێندنگایەکی دیاریکراوی وەك خوێندنگەی سەربازی و خوێندنگەی رۆژنامەنووسی و پزیشکی بە هیچ شێوەیەك ئەو کوردانە وەرناگرن.[٢٣٣] ئەم جیاکارییە تایبەتییەی سیاسەتی حکومەت بەرامبەر رەخساندنی هەل و رۆشنبیرکردنی منداڵانی کوردی سووریا وایکردووە، هەندێك جار پەنا بەرنە بەر کارکردن لەسەر شەقام و کاری دەستگێڕی و رێستۆرانتەکان بۆ ئەوەی لە پەیداکردنی بژێوی ژیانی خێزانەکەنیاندا بەشداربن. ئەم بارودۆخە تەنیا تایبەت نییە بە منداڵە کوردەکانەوە، بەڵکو کەمە نەتەوایەتییەکانی تری سووریاش دەگرێتەوە. بەڵام لەبەرئەوەی کۆمەڵگەی کوردی بە شێوەیەکی دیار هەژارن و ئەم بارە دژوارەش لەناویاندا بڵاوترە، منداڵە کوردەکانی لە هەلی یەکسانی لە بوواری خوێندن و دامەزراندندا زیاتر بێبەش کردووە.[٢٣٤]

ئەم بەربەستانەی لە بەردەم پەروەردە و خوێندنی کوردە بێگانە و مەکتومەکاندا هەن، ئەوەی لە بڕیاری ٢٨ ی کۆبوونەوەی مافەکانی منداڵدا هاتووە پێشێل دەکات، کە ئاماژە بەوە دەکات، هەموو منداڵێك مافی خوێندنی هەیە لەسەر بنەمای هەلی یەکسانی. مەسەلەی پێدانی بڕوانامەی نزمتری پەروەردە و رۆشنبیری بە منداڵانی کوردە بێ وڵاتەکان بۆتە رێگر لە بەردەم بەدەستهێنانی پلەی بەرز و بێبەش بوونیان لە هەلی یەکسانی.

## ئازادیی هاتوچۆ

تۆمارکردنی بەشێکی زۆری دانیشتوانی کوردی سووریا وەك بێگانە و مەکتومین و رەتکردنەوەی بەڵگەی هاووڵاتیبوونیان وەك سوورییایەکی پلە یەك، یان نەدانی پاسپۆرتی سوورییایی پێیان، پێچەوانەی بڕیاری (١٢)ی پەیمانی جیهانی لەبارەی

[٢٣٢] لەو کاتەوە، کە فەرمانەکانی ١٥/نۆکتۆبەر/١٩٩٩ دەرچووە، رێگە نادرێ بە موختار، کە ئەو دۆکۆمێنتانە دەرکات.
[٢٣٣] چاوپێکەوتنێك لەگەڵ کوردێکی پەناهەندەی بریتانیدا، سێپتەمبەری ٢٠٠٤ ناوەکەی لە لایەن نووسەرەوە پارێزراوە
[٢٣٤] کۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە سووریا، نۆڤەمبەری ٢٠٠٣: ١٢.

مافەکانی سیڤیل و سیاسییەوە، کە تیایدا هاتووە: هەموو کەسێك بەبێ هیچ جیاوازییەك، ئازادە لە بەجێهێشتنی هەر ولاتێك بە ولاتەکەی خۆشییەوە، بەلام کوردی بێگانە و مەکتومینەکان مافی کۆچکردنییان نییە، تەنانەت ئەگەر گەشتێکیش بکەن بۆ لوبنان.

لەناو سووریادا، هەموو کەسێکی سوریی بەبێ هیچ بەلگەنامەیەك دەتوانێت لە رێگەی خزمەتگوزارییە گشتییەکانی گواستنەوەوە هاتوچۆ بکات، بەلام کوردە بێگانە و مەکتومینەکان با پێپێناسنامە و دۆکۆمێنتیشیان هەبێت، کەچی، کە دەیانەوێت لە نێوان شارەکانی سووریادا بێن و بچن، رووبەرووی چەند رێوشوێنێکی درێژ خایەن و بیرۆکراتی و بازگەکانی ئاسایش دەبنەوە.

## تۆقاندن

ململانێی رۆژانەی کوردە بێ ولاتەکان لە پێناوی تۆمارکردنی هاوسەرگیری و مندالبوون و پەروەردە و ئیشکردن لە دەولەتێکی هەژاردا، هەموو ئەو شتانە پێکەوە وایان لەم گروپە کردووە تا ببنە کەرەستەی تۆقاندن لە لایەن دەزگاکانی هەوالگر و ئاسایشەوە.

پێویستی پێدانی مۆلەت لە لایەن لقەکانی ئاسایش و سیاسییەکانەوە وای لە کوردەکان کردووە تا ببنە ئامانجی پیاوانی ئاسایش. لە ئەنجامدا ئەو کوردانە پێویستیان بە پشتگیری کەسانی پلەدار هەیە لە سووریادا، یان پێویستیان بە ئەستۆپاکی هەیە لە لایەن ئاسایشەوە بۆ چەند کارێکی رۆتینی وەك تۆمارکردنی ناوی مندال لە ئۆفیسی تۆمارگە، یان هاتوچۆ لە نێوان شارەکانی تری سووریا، یان بۆ چارەسەری پزیشکی و مانەوەیان لە هۆتێلدا.

ژمارەیەکی زۆر لە کوردە بێ ولاتەکان، ناچار بوون ناوی ئەو هاوولاتییە مردوانە لە خۆیان بنێن بۆ ئەوەی لە هەژاری رزگاریان بێت. کورد بوون بە بێ بوونی رەگەزنامە تەنها بارودۆخی توندوتیژ و نادادپەروەری بۆ هێناون.[235] هەندێکی تر لە

---

[235] هەمان سەرچاوە

کوردەکان بە شێوەیەکی نایاسایی چەند ڕێگەیەکیان دۆزیوەتەوە بۆ بەجێهێشتنی ئەو وڵاتە.

لە سەردانی یەکەمی بەشار ئەسەد بۆ پارێزگای حەسەکە لە ساڵی ۲۰۰۲دا و لە چاوپێکەوتنێکی ئەم دواییەیدا، لە کەناڵی ئاسمانی جەزیرە لە ۱/ مایس/۲۰۰٤...

بە شێوەیەکی ئاشکرا رایگەیاند، کە ڕێگەچارە هەیە بۆ بارودۆخی کوردە بێ ڕەگەزنامەکان. هێشتا ئەو بڕیارەی ۲۰,۰۰۰ کورد دەگرێتەوە، کە ڕەگەزنامەی سووریاییان پێبدرێت ئەو پرسیارە دێنێتەوە پێش، کە ئاخۆ ۲۰۰,۰۰۰ کوردی بێ ڕەگەزنامە چییان بەسەر دێت؟ ئەگەر ئەو دەوڵەتەش کار بەم بڕیارە بکات، سەرەڕای ئەو وتارانەش هێشتا هیچ چارەیەك لە مەڕ ئەو کێشەیە نییە.

## ریفۆرمی زەویوزار و پشتێنەی عەرەب

ریفۆرمی زەوی و کێڵگە کشتوکاڵییەکان هەر لە سەرەتای ۱۹٥۰ لە سووریا دەستی پێکردەوە، لە ساڵی ۱۹٥۸-۱۹٦۱ لە کۆماری یەکگرتووی عەرەبییەوە، ناسر ریفۆرمی میسری کردە مۆدێلێك بۆ ریفۆرمکردنی سووریا و دووبارە دابەشکردنەوەی ئەو زەوی و کێڵگانە بەسەر جوتیاری کێڵگەکاندا بەبێ ئەوەی خاوەن موڵکە گەورەکان دەستیان تێدا هەبێت.

زۆربەی خێزانە کوردەکانی عەفرین و کوبانی، خاوەن زەوی کشتوکاڵیی زۆر بوون و لە لایەن دەوڵەتەوە دەستیان بەسەردا گیراوە.[۲۳٦]

دوای ئەوەی سووریا لە ۱۹٦۱ەوە دوای کۆماری یەکگرتووی عەرەبی کەوت، حیزبی بەعسیش هەمان شێوازیان بەکار هێنا لە ریفۆرمکردندا، مەبەستیشیان سنووردارکردن و فراوانکردنی ناونیشانی زەوییەکان و دامەزراندنی سەروەت و سامانێکی دادپەروەرانەی دابەشکراوە.

هەلکەوت و بارودۆخی جیۆگرافیای پارێزگای جەزیرە وایکردووە، لەو کاتەدا چەند موڵکێکی زۆر لەو ریفۆرمی زەوییە کشتوکاڵیانە بەدوور بێت. دەیڤد ماکدۆوەڵ

---

[۲۳٦] چاوپێکەوتن لەگەڵ بێگانە و مەکتومی کورد، سووریا ۲۰۰۲ ناوەکان لە لایەن نووسەرەوە پارێزراون.

پێی وایە، ئەوە بەهۆی ناتەواویی نەخشەی دارشتنی پلانەکەوە بوو بێت. سەرچاوە کوردییەکانیش پێیان وایە، کە دواخستنەکەی، حسابێکی بەمەستی بۆ کرابوو بۆ ئەوەی بە پێی کات دیمۆگرافیای دروستکراو لە ناوچەکەدا بگۆڕن.[٢٣٧] وەك ئاماژەی پێدراوە سەرژمێری حەسەکە لە ساڵی ١٩٦٢ بە شێوەیەکی دیار ڕێژەی کوردی کەمکردەوە، کە پێشتر زۆرینەی پێکهێنابوو.

پشتێنەی عەرەب لە ساڵی ١٩٦٥دا، پلانێکی سیاسی بوو لە لایەن حیزبی بەعسەوە بڕیاری لەسەر درابوو، بەڵام تا ساڵی ١٩٧٣ لە سایەی حکومەتی حافز ئەسەددا جێبەجێ نەکرا. وەك بەشێکی پرۆگرامی ریفۆرمکردنی زەوییە کشتوکاڵییەکان سیاسەتێکی تایبەتی سەرەتایی لە هەرێمی جەزیرەدا گیرایەبەر، کە زۆرینەی کوردن. پلانی دروستکردنی ئابلۆقەی سەربازیی بە درێژایی سنووری سووریا – تورکیا و سنووری کوردستانی عێراق لە (رأس ألعين) دارێژرا.

بە درێژایی سنووری عێراق هەتا تەلکوچەك، نزیکەی ١٠-١٥ کیلۆمەتر قووڵی و ٣٧٥ کیلۆمەتر درێژییە. پرۆژەکە هاوشێوەیەکی زۆری لەگەڵ خاڵی نۆی پیلانەکەی موحەمەد تەلەب هیلال هەبوو لە مامەڵەکردنی کوردەکانی جەزیرەی سووریا.[٢٣٨] بە پێی پێشنیازەکەی هیلال لە ساڵی ١٩٧٣ پشتێنەی عەرەب بە شێوەیەکی پراکتیکی کاری پێکرا و بە تەواوکردنی بەنداوی تەبەقە لەسەر رووباری فورات، کە رووبەرێکی فراوانی ئەو ناوچەیە بەر لافاو کەوتووە و بۆتە هۆی بێ لانەبوونی سەدان خێزانی عەرەب. لە هەمان کاتدا لە ناوچە سەر سنوورییەکانی سووریا- تورکیا- عێراق سێ سەدو چل گوندی کوردنشین ناچارکران، کە ماڵەکانیان جێبهێڵن و پێیان وترابوو، کە لەو جێگایانە نیشتەجێبن، کە کورد نین لەناو سووریادا وەك ناوچەکانی دێرەزور. بە گەیشتنی دەسەڵاتدارانی سووریا بۆ بینینی ئەو شوێنانەی، کە کوردەکان تیایدا جێگیربوون، لە یەکەمین گونددا دوای گواستنەوەیان، گوندنشینەکانی عەلی فورۆ خۆپیشاندەرەکانی تریش لەسەر شەقامەکان دانیشتن و لەسەر رێی هاتوچۆی ئۆتۆمبیلدا راکشان و جێهێشتنی ماڵ و زەوی و زارەکانی خۆیان رەتکردەوە، لە گوندی عەلی فورۆ

---

[٢٣٧] چاوپێکەوتن لەگەڵ کوردێکی ئاوارەدا، بریتانیا، سێپتەمبەری ٢٠٠٤ ناوەکەی لە لایەن نووسەرەوە پارێزراوە.

[٢٣٨] زانیاریەکە لەلایەن کۆمەڵەی رۆژئاوای کوردستانەوە پێشکەش کراوە، لەندەن، ئۆکتۆبەری ٢٠٠٣.

نزیکەی نەوەد کەس لە لایەن دەسەڵاتدارانی سوورییاوە دەستگیر گران.[239] ئامانجی دیاری چالاکییە هاوشێوەکان و دەستگیرکردنیان هانی دەسەڵاتدارانی دا، کە سیاسەتی خۆیان پەیڕەو بکەن. لە جیاتی گواستنەوەی هەموو کوردەکان لە ماڵەکانی خۆیان، دەستیان کرد بە هێنانی عەرەب بۆ ئەو ناوچانە و دروستکردن و گۆڕینی دیمۆگرافیای دەستکرد.

خێڵە عەرەبە دەشتەکییەکانی فورات دوای بێ شوێن بوونیان بەهۆی دروستکردنی بەنداوی تەبقە و دەریاچەی ئەسەد، لەو شوێنەدا نیشتەجێ کران.

لە نێو پشتێنەی عەرەبدا، نزیکەی ٤٠-١٠٠ گوندی تایبەت و نوێیان دروستکرد، کە ١٥٠-٢٠٠ خانوو دەبوون[240] بۆ ئەو خێزانە عەرەبانەی، کە بەهۆی لافاوەوە بێ لانە بوون و لەوێدا نیشتەجێ کران.

ئەو زەوییانەی، کە ئەو گوندانەیان لەسەر دروست کراوە، هەروەها ئەوانەشی، کە دابینکران بۆ ئەو عەرەبانەی تازە نیشتەجێبوون، زەوی ئەو کوردانە بوون، کە لە ساڵی ١٩٦٢دا بەهۆی ریفۆرمکردنی زەوییەکانی حەسەکەوە دەستیان بەسەردا گیرابوو. ئەو کوردانەی، کە خاوەنی رەگەزنامەی سووریاین و ئەوانەشی کوردی بێگانەن و ئەو خێزانانەش، کە بێ وڵات و بێ زەوین، تەنها بەشێکی کەمیان بۆ ماوەتەوە، ناچار وەك جوتیار لەو زەوییانەدا کاردەکەن، کە عەرەبە تازە هاوردەکان بوونەتە خاوەنی و لەوانیان سەندۆتەوە، یان ناچارن منداڵەکانیان بنێرن بۆ ناوەندی شارەکان بۆ ئیشکردن و ناردنەوەی دەستکەوتەکانیان بۆ ماڵەوە.[241]

لە سەرەتاوە پەیداکردنی بەرهەمە کشتوکاڵی و خۆماڵییەکانی وەك تۆو و پەین بۆ عەرەبە هاوردەکان زۆر گران بوون ، بەڵام بۆ ئەوەی عەرەبەکان هان بدرێن، کە بەرەو ناوچە کوردنشینەکان کۆچبکەن، ئاسانکاری بەدەستهێنانی قەرزی کشتوکاڵیان بۆ کرا و تەنانەت چەکداریش کرابوون.[242]

---

[239] هیلال ١٩٦٣: ٤٨

[240] چاوپێکەوتنێك لەگەڵ جەواد مەلا، کۆمەڵەی رۆژئاوای کوردستان ئەحمەد ٢٠٠١: ٧٨

[241] چاودێری مافەکانی مرۆڤ ئۆکتۆبەری ١٩٩٦: ١٣

[242] ئەم زانیارییە لەلایەن کۆمەڵەی رۆژئاوای کوردستاندراوە، لەندەن، ٢٧/ئۆکتۆبەر/٢٠٠٣.

گوندە نوێیەکان هەموو خزمەتگوزاری و پێداویستییەکانی بۆ دابین کرابوو، پێچەوانەی ئەوەش، گوندە کوردییەکان لە خزمەتگوزاریی سەرەتایی وەك ئاو و کارەبا و ڕێگاوبانیش بێبەشبوون و بۆیان دابین نەکرابوو.

هەروەها ئەوەش ڕاگەیەنراوە، کە زۆربەی ئەو زەوییانەی دراون بە عەرەبە نیشتەنیەکانی گوندە نوێکان لە ناوچەکەدا، بی ئەوەی کەڵکی لێوەربگرن، هەروا لەلایەن خاوەنەکانیانەوە بەجێهێڵراون،[243] یان تەواو پشتیان بەستووە بە جوتیارە کوردەکان و کرێکاران بۆ هێشتنەوەی زەوییە کشتوکاڵییەکان و بەرهەمەکانیان.

چەردەیەك دەربڕینی نارەزایی هەبوو لە لایەن دانیشتوانی گوندەکان لەناو پشتێنەی عەرەبدا. لە یەکێك لەو گوندانەدا، هەموو دانیشتوانە کوردەکان، چ ئەوانەی، کە خاوەنی ڕەگەزنامەی سووریاین و چ ئەوانەشی، کە وەك ئەجنەبی ناویان تۆمارکراوە و لە ساڵی ۱۹۷۳دا زەوییەکانیان دەستیان بەسەردا گیراوە، لە خۆپیشاندانێکدا لە ساڵی ۱۹۸٦، دانیشتوانە عەرەبەکان لەگەڵ کوردە خۆپیشاندەرەکان بەشەڕهاتن و لە ئەنجامدا کیژۆڵەیەکی کورد کوژرا و هەموو کوردە خۆپیشاندەرەکان دەستگیرکران.[244] سەرەڕای بوونی پشتێنەی عەرەب، پرۆگرامی ریفۆرمکردنی زەوی بە شێوەیەکی گشتی و بەرفراوان لە جەزیرەدا جێبەجێ کرا و بەشێکی زۆری موڵکایەتییە کوردییەکان هەڵوەشێندرایەوە و دووبارە بەسەر جوتیاراندا دابەشیان کردەوە، هەرچەندە جوتیارە کوردەکان، کە کاریان لەو زەوییانەدا دەکرد، لەو هەلە بێبەشبوون و زەوییەکان دران بە عەرەبە نیشتەنییە نوێکانی ناوچەکە. بەهۆی ریفۆرمکردنی زەوییە کشتوکاڵییەکانی ناوچەی جەزیرەوە، نزیکەی ٦,٥٥٢-٧٠٠٠م٢ زەویی جوتیارە کوردەکان دەستیان بەسەردا گیراوە.[245] بە پێی وتەی سەلاح بەدرەدین سکرتێری پێشووی حیزبی هەڤگرتنا گەلی کورد لە سووریا، ئەو زەوییانەی لە لایەن حکومەتی سووریاوە دەستیان بەسەردا گیراوە ڕێژەی ٤٣٪ سەرجەمی زەویوزاری سووریا پێکدەهێنێت.[246] ئەو یاسایەی، کە لە ساڵانی ۱۹٦٥-۱۹۸۹دا جێبەجێکرا

---

[243] چاودێری مافەکانی مرۆڤ نێزکتزبەری ۱۹۹٦: ۱۳

[244] وانلی ۱۹۹۲: ۱٦۲

[245] هەمان سەرچاوە

[246] بدرالدین ۲۰۰۳: ۲٥

موڵکایەتییە کوردییەکانی هەڵوەشاندەوە و جوتیارەکانی لی دوورخستنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا حکومەت چەند سنوور و مەرجێکیشی بۆ دیاریکردن، کە ئەگەر جێبەجێیان نەکەن، ئەوا زەوییەکان دەستیان بەسەردا دەگیرێت:

١. ئەگەر زەوییەك بۆ ماوەی پێنج ساڵ بە بەردەوامی لە لایەن خاوەنەکەیەوە کاری تێدا نەکرێت دەبێتە موڵکی دەوڵەت.
٢. هەر کەسێك بۆ ماوەی ١٠ساڵ بە بەردەوامی کار لەسەر پارچە زەوییەك بکات مافی ئەوەی هەیە ببێتە خاوەنی پارچە زەوییەکە.
٣. هەر کەسێك پارچەیەك زەوی لە حکومەت بە کری بگرێت و بۆ ماوەی بیست ساڵ و بە بەردەوامی کاری تێدا بکات مافی ئەوەی هەیە ببێتە خاوەنی ئەو زەوییە[٢٤٧].

جێی سەرسوڕمان نییە، کە ئەم یاسایانە، کوردە بێگانە و مەکتوومینەکانی نەدەگرتەوە و وا راگەیەنراوە، کە کورد بە شێوەیەکی گشتی بێبەشبووە لە مافی خاوەندارێتی و بە شێوەیەکی زۆر دەگمەن سوودمەند دەبوون لە دووبارە دابەشکردنەوەی زەوییەکان، بە تایبەتی لە ناوچەی جەزیرەدا.

سەرەڕای ئەم جیاوازکاریەیش، وا راگەیەنراوە، کە ژمارەیەك لە بڕیارەکانی پارێزگا، ئامانجیان کورد بووە و پاڵپشتی لە دەست بەسەراگرتنی زەویوزارەکانیان کردووە. کورد مافێکی ئۆتۆماتیکی نییە بۆ بوون بە خاوەنی موڵك، یان تۆماری خاوەنایەتیی موڵك بکات، لە جیاتی ئەوە ئەگەر ئاواتەخوازی ئەوە بێت پارچەیەك زەوی لە هەر شوێنێکی سووریادا بۆ خۆی چنگ بخات، پێویستە پێشەکی لە راژەکانی ئاسایشدا بەڵێننامەیەکی دڵنیایی هەبێت.

راپۆرت لەبارەی ئەوەوە دراوە، کە کوردەکان بەردەوام روخسەتی بوون بە خاوەنی زەوی و موڵکایەتییان رەتدەکرێتەوە، بە تایبەتیش لە ناوچە کوردییەکانی باکووری سووریا.

ناوچەکانی دەوروبەری عەفرین و کوبانی دوور نەبوون لە ریفۆرمکردنی زەوییەکان و بە عەرەبکردن. هەرچەندە سیاسەتی عەرەب بەسەر ئەو ناوچە کوردییانەدا

---

[٢٤٧] هەمان سەرچاوە

جێبەجێ نەکرا، بەڵام ریفۆرمکردنی زەوی بەشێکی گەورەی ناوچەی عەفرینی گرتەوە، کە کورد خاوەنی ئەو زەویانە بوون و لە لایەن حکومەتەوە دەستیان بەسەردا گیراوە. لە بەشێکی کوبانیدا، کورد بێبەش کراوە لە وەدەست هێنانی زەوی و ماڵ و موڵك، هەروەها لە داڕشتنەوەی کاروبارەوە لە هەردوو شارەکانی تەرابلوس و تەلئەبیەزدا[٢٤٨].

سەرچاوە کوردییەکان لەو بڕوایەدان، کە ئەم هەوڵە مەبەستێکی لە دواوەیە بۆ دابڕکردنی ناوچە و شارە کوردییەکانی ناو سووریا لە یەکتری و دابەشکردنی زۆرینەی عەرەب بەسەریاندا، بۆ نموونە لە نێوان عەفرین و کوبانی،کوبانی و سەرێ کانی (رأس العین)دا.[٢٤٩]

هەروەها وا ڕاگەیەنراوە، کە ئەم هەوڵانە بۆ بە عەرەبکردنی شارۆچکەی کوبانی نراوە بەهۆی دابەشکردنەوەی زەوییەکانی کوردەکانەوە بەسەر عەرەبەکاندا. بۆ ڕێگرتن لەم هەوڵە و بەگژاچوونەوەی دەست بەسەراگرتنی زەوی، کوردێکی خاوەن زەوی چەند مینێکی لە ناوچەکانی سنووری تورکیاوە هەڵگرتەوە و لە کێڵگەکەی خۆیدا دایچاندن، ئەو عەرەبەی، کە دەستی کردبوو بە کارکردن لەوزەویەدا کوژرا، کاتێ، کە بە تراکتۆرەکەی بەسەر مینەکاندا ڕۆشتبوو.[٢٥٠]

بە هەمان شێوە بە قووڵایی پەنجا کیلۆمەتر زەوییەك بە درێژایی سنووری تورکیا لە ناوچەکانی کوبانی و باکووری عەفرین پاسەوانێکی زۆر بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوچەکان هەیە و لە ئامادەباشیدان لە حاڵەتێکدا ئەگەر هەڕەشەی تورکیا بۆ سەر ئەو ناوچەیە هەبێت. هەر بۆیە زەوییەکان لەو ناوچانەدا فرۆشتن و کڕینیان قەدەغەکراوە. هەروەها گۆڕینی ناوی تۆمارکراوی خاوەنەکەی تەنانەت دوای مردنی خاوەنەکەشی و یان بۆ مەبەستی یاسایی قەدەغەکراوە، خاوەنی زەوییەکان هێشتا دەتوانن لە زەوییەکانیاندا کاربکەن، بەڵام لە ئەنجامدا ئەم زەوییانە لە هەر کاتێکدا بێت دەتوانرێت لە لایەن حکومەتەوە دەستیان بەسەردا بگیرێت، بەبێ هیچ

---

[٢٤٨] چاوپێکەوتنێك لەگەڵ خێزانێکی کورد لە کوبانی، سووریا، ٢٠٠٢، ناوەکانیان لەلایەن نووسەرەوە پارێزراوە.

[٢٤٩] چاوپێکەوتنێك لەگەڵ پارێزەرێکدا، دیمەشق، ئۆگۆستی ٢٠٠٢ ناوەکەی لەلایەن نووسەرەوە پارێزراوە.

[٢٥٠] چاوپێکەوتنێك لەگەڵ خێزانێکی کورد لە کوبانی، سووریا، ٢٠٠٢، ناوەکانیان لەلایەن نووسەرەوە پارێزراوە.

ئاگادارکردنەوەیەکی یاسایی و دوای مردنی خاوەن موڵکەکەش زەوییەکە ڕاستەوخۆ دەگەڕێتەوە بۆ دەوڵەت.[٢٥١]

بایەخی ناوچە کوردییەکان بۆ سووریا بە بەها ئابوورییەکەیەوە وێنا کراوە. جەزیرە بە ناوچەی بەرهەمهێنانی لۆکە و گەنم جیا دەکرێتەوە و دۆزینەوەی نەوت لەو هەرێمە بۆتە هۆی بایەخدان بە زاڵبوونی کورد بەسەر ستراتیجی سەرچاوەکاندا. پێشنیازکراوە، کە پشتێنەی عەرەب و ریفۆرمکردنی زەوییەکان لە کاتێکدا جێبەجێکراوە، کە دەنگۆی ئاشکرابوون و قۆرخکردنی نەوت لە قەرەچوك و ڕومەلان لە جەزیرەدا بلاوە.

کۆچکردنی عەرەبەکان بۆ ناوچە کوردییەکان بۆ گۆڕینی دیمۆگرافیایەکی ڕەگەزایەتی دروستکراو، سیاسەتێك بوو زووتر لە لایەن کۆماری عێراقەوە جێبەجێکرا، بە تایبەتی لە شاری کەرکوکی دەوڵەمەند بە نەوت لە ساڵانی ١٩٣٠ و دواتریش لە لایەن حیزبی بەعسی عێراقەوە.

بایەخدانی کورد بەم ناوچانە لە ڕووی کارەوە، کە لە کەرکوکەوە دەستی پێکرد، وا پێدەچێت حکومەتی سووریا نیگەرانی زاڵبوونی نەتەوەی کوردی هەبێت، لە ڕووی ستراتیژی ئابووری و جیۆگرافیای ناوچەکەوە.[٢٥٢] لە سووریا ژمارەی ئەو فەرمانبەرە کوردانەی لە کارگەی پیشەسازی نەوتی ڕومەلان و قەرەچوکن، بەردەوام لە کەم بوونەوەدان، بە تایبەتی، کە خانوو بۆ کرێکارە عەرەبە هاوردەکان دروست کرا. بە هەمان شێوە تەواوکردن و پڕکردنەوەی بەنداوی تەبەقە لە سووریا و بەنداوی کیبان لە تورکیا لە ساڵی ١٩٧٣، کە بووە هۆی کەمکردنەوەی ڕژانی جۆگە ئاوییەکان لە ئەنجامدا گرژی و ئاڵۆزیی خستنە نێوان سووریا و تورکیاوە و هەروەها سووریا و عێراقیش. تەنانەت عێراق هەڕەشەی لە تەقاندنەوەی بەنداوی تەبەقە کرد و سووریا و عێراقیشی تا کەناری جەنگ برد، لە ساڵانی ١٩٧٤-١٩٧٥ سوپای سەربازی هەردوو وڵاتی لەسەر سنوورە دیاریکراوەکانیان کۆکردەوە.[٢٥٣]

---

[٢٥١] چاوپێکەوتنێك لەگەڵ خێزانێکی کورد لە کوبانی، سووریا، ٢٠٠٢، ناوەکانیان لەلایەن نووسەرەوە پارێزراوە.

[٢٥٢] چاوپێکەوتنێك لەگەڵ خێزانێکی کورد لە کوبانی، سووریا، ٢٠٠٢، ناوەکانیان لەلایەن نووسەرەوە پارێزراوە.

[٢٥٣] ماکدۆوێل ١٩٩٨: ٢٨.

زیادبوونی ئەم گرژییانە هاوکات بوو لەگەڵ دروستکردنی پشتێنەی عەرەب، جێی سەرنجیشە، کە پشتێنەی عەرەب بەشێك بوو لە نەهێشتنی دەستێوەردانەکانی تورکیا و عێراق بۆ سەر کاروبارە ناوخۆییەکانی سووریا، ئەویش بە هۆی دانیشتوانە کوردیەکانیانەوە، کە زۆر بە خیانەتکارانە دەبینرا.

هەروەك لە بەشی پێشوودا ئاماژەی پێدرا، پەرەپێدانی ناسیۆنالیزمی کورد و عەرەب بووە هۆی گرژی و ئاڵۆزیی گومانی هاوبەشی هەردوولا. ناسیۆنالیزمی کورد لە بارێکی هەڵسانەوەدا دەبینرا. لەگەڵ راپەرینەکەی مەلا مستەفای بەرزانی لە باکووری عێراقدا سەری هەڵدا و نیشانەی یەکەمی ئەم ناسیۆنالیزمە لە تورکیاش بەئاگای هێنانەوە، سووریاش لەوە ترسا، کە ببێتە هۆی هاندانی کوردی سووریا بۆ کار و چالاکی سیاسی و شەرعیەتی لاوازیی حکومەتی خستە بەردەم گومانەوە.

پشتێنەی عەرەب، کوردی سووریای لە هاوپەیمانە سروشتییەکانی خۆی لە تورکیا و عێراق جیاکردەوە. هەروەها سووریا ترس و نیگەرانی لەو دەوڵەتە دوژمنانەی بەرژەوەندی هاوبەش و دەستێوەردانە دەرەکییەی بەرامبەر بە نەتەوەی بە ویژدانی کورد هەبوو وەك راگەیەنراوە، کە ئیسرائیل پشتیوانی مەعنەوی بەرزانی کردووە. هەروەها بە عەرەبکردنی ناوچە کوردییەکان و دروستکردنی پشتێنەی عەرەب و ئایلۆقەی پاراستن لە نێوان کوردی سووریا و تورکیا و عێراق، هەردووکیان هەوڵێك بوون بۆ جیاکردنەوەی کوردی سووریا لە کاریگەرییە دەرەکییەکان و پەیوەندیی بەرژەوەندییەکانیان و لە هەمان کاتدا بۆ دانانی کاراکتەری دیمۆگرافیا لە ناوچەکەدا.

## کۆچکردن و راگواستن

لە چەند سەرچاوەیەکدا هاتووە، کە چەندان کەس و کۆمەڵە خەڵك بە پەیوەندی لەگەڵ رژێم و دەزگاکانی موخابەراتی سووریا، چەردەیەکی زۆر سودمەند بوون لەو هەڵهاتنە بەرفراوانە بۆ ئەورووپا.

سەدان کورد لە سووریاوە بە کەشتی و لە رێگەی لوبنانەوە بەرەو ئەورووپا براون، کە زۆربەیان وا چاوەڕوان دەکرا لە ئەڵمانیا بمێننەوە.

له نێوان ساڵانی ١٩٩٨- ٢٠٠٢ گروپێكی تایبەتی مافیا، دەربازكردنی سەدان كوردی له ڕێگەی كەشتی بارهەڵگرەوە بۆ ئەوروپا ڕێكخستووە.

به پێی ڕاپۆرتی دیر سپیگل بڵاوكراوەی دەوریی ئەڵمانی[٢٥٤] و سایتی كوردی Amude.com[٢٥٥] مافیایەكی قاچاخچی له سووریا له لایەن پیاوێكی كوردی سووریاوە، كه ناوی (مەجید بیركی)یه له چالاكییەكانی لەگەڵ تاكەكەس و گروپەكانی تر له سووریا و لوبنان و ئەوروپاشدا بەشداری كردووە.

له ساڵی ١٩٩٨ به ناردنی ٢٠-٢٥ كوردی سووریا بۆ ئەڵمانیا دەستی پێكردووە و ڕێكخراوەكەی بیركی له ساڵانی دواتردا بەرفراوان بوو. كەشتی گەورەتر بەكار هێنرا، گروپەكه دەستی كرد به دەربازكردنی زیاد له نۆسەد كەس له یەك كەشتیدا و له بارودۆخێكی زۆر خراپ و پڕ ئازار و پیسی و ناتەندروست لەگەڵ نەبوونی خواردن و ئاوی پێویست.

له شوباتی/ ٢٠٠١ كەشتیەكی كامبۆدی دەریای ڕۆژهەڵات به نزیك فرەنسادا ٩١٢ كوردی هەڵگرتووە، كه زیاد له ٣٠٠ منداڵی خوار تەمەنی ١٠ ساڵان بوون. دوای یەك ساڵ له مارتی ٢٠٠٢ دا ٩٢٨ پەنابەر، كه زۆربەیان كوردبوون له كەشتی تۆنگادا بینراون، كه به مۆنیكا تۆماركراوە و نەیانتوانیوە له ئیتالیا بپەڕنەوە.

هەرچەندە له كاتی خۆیدا وا ڕاگەیەنرا، كه پەنابەرانی كەشتیی دەریای ڕۆژهەڵات، كوردی عێراق بوون، بەڵام دواتر ئاشكرا بوو، كه زۆربەی هەرە زۆریان كوردی سووریا بوون.

هەروەها له لایەن قاچاخچییەكانەوە هەڕەشەیان لێكرابوو، كه به پۆلیس و ئۆفیسی كۆچبەران بڵێن، كه كەشتیەكه له توركیاوە هاتووە و كوردی عێراقین، ئەگینا له كەشتییەكەوە فڕێدەدرێنه دەرەوە و هەروەها بڕوایان وا بووە ئەگەر پەیڕەوی ئەو فەرمانه بكەن ئەوا سەرنجی زیاتر له بەزەیی ڕۆژئاوایی به دەست دەهێنن، ئەویش به تێڕوانینی بارودۆخی عێراق لەسەر ئاستی دەركەوتنی نێودەوڵەتی و بەم شێوەیه زۆربەی پەنابەرەكان ملكەچ بوون.

---

[٢٥٤] داودی.ن.د. Khrp ٢٠٠٢: ١٣.

[٢٥٥] دێر سپیگل ١/٤/٢٠٠٤

لە ئەنجامدا بارودۆخی دژواری کۆردی سووریا نەیتوانی سەرنجی میدیاکان و بایەخپێدانی نێودەوڵەتی بە دەست بهێنێت.

بڕی تێچوو ٣٠٠٠-٤٠٠٠ دۆلاری ئەمەریکی بۆ گەورە و ١٧٠٠-٢٠٠٠ دۆلاری ئەمەریکی بۆ منداڵ، قاچاخیکردنی بە دەربازکرنی خەڵکەوە داهاتێکی زۆری هەبوو.

ئەگەر نەتوانرایە نرخەکە بە یەکجار بدرێت، کوردەکان وا ناسرابوون، کە موڵکی خۆیان لە بری پارەکە دەبەخشی. دەڵێن، کە مەجید بیرك توانا و دەسەلاتێکی زۆری هەبووە لە حەسەکە و قامیشلی و خاوەنی زیاد لە ٢٠٠٠ خانووبەرەیە لەناوەوە و دەوروبەری ئەو شارانەدا.

بەپێی زانیارییەکانی لێکۆڵەرەوەی پۆلیسی ئەڵمانیا، مەجید بیرك پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ موخابەراتی سووریا و حیزبوواللە لە لوبناندا هەبووە. لە ٢٣/نیسان/٢٠٠٣دا لە لوبنان لە کاتێکدا خەریکی رێکخستنی کەشتییەك بوو بۆ ئەورووپا دەستگیرکرا، کە لایەنی کەم ٧٠٠ کەسی هەڵدەگرت و بەڵام مەجید بیرك دوای شەش مانگ لە زیندان ئازادکرا. بە پێی راپۆرتی دەزگای زانیاری ئەڵمانیا، دیمەشق پەیوەندی هەبووە بەو ئازادکردنەیەوە.[٢٥٦]

لە هەمان کاتدا بەرپرسە سوورییاییەکان بە بەرتیل رێگەیان دەدا بە تاکی کورد و تەنانەت ئەوانەشی، کە لە لایەن رژێمەوە داواکراو بوون، کە بە فرۆکە وڵات جێبهێڵن. هەر یەکەیان نزیکەی بە بڕی پێنج هەزار دۆلاری ئەمریکایی لە سووریا دەرباز دەبوون.

لە ١٩٩٠ەوە پاسپۆرتی کاتی بۆ کوردە بێگانە و مەکتومینەکان دەردەکرا، بە شێوەیەکی رەسمی بۆ چارەسەری پزیشکی لە دەرەوەی وڵاتی سووریا، ئەوەش، کە بابەتی بەرتیل بوو.

کوردە بێ وڵاتەکان دەیانتوانی ئەو پاسپۆرتە کاتیە بەدەست بهێنن، بۆ ماوەی شەش مانگ یان ساڵێك سەفەر بکەن، کە دەبوو بڕی ١٥٠٠-٣٠٠٠ دۆلاری ئەمەریکی و ئەستۆپاکی ئاسایشیان بە شێوەیەکی ئیجباری پێبێت.[٢٥٧] دەڵێن: رەنگە

---

[٢٥٦] بێرکۆ ٢٠٠٤

[٢٥٧] هەمان سەرچاوە، دێر سپیگڵ ٢٠٠٤/١

گروپەکان و قاچاخچییەکان پەیوەندییان هەبوویێت بە حیزبی ئەمەلی لوبنانی و حیزبی بەعسی لوبنانی و گروپی ئەلئەسەدەوە،[٢٥٨]، کە پێکەوە لە رێگەی لوبنانەوە گەشتەکانیان بۆ ئەورووپا رێك دەخست. هەروەها دەڵێن: لوبنان ریشەیەکی زۆر بەهێزی هەبووە لە ناردنە دەرەوە بە رێگەی نایاسایی لە سووریاوە، ئەو کەسانەی ئەو رێگەیەیان بەکاردەهێنا زۆربەیان کورد بوون بە مەبەستی رزگاربوونیان لەو توندوتیژیانەی ناو سووریا، هەروەها بەڵگەکان ئەوە دەردەخەن، کە حکومەتی سووریا و بەشی ئاسایش، ئاگاداری ئەو قاچاخیکردنە نایاساییانەی خەڵك بوون لە رێگەی لوبنانەوە و بە رێژەیەکی کەمیش لە رێگەی فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی سووریاوە و لیستی ناوەکانی ئەو قاچاخچییانەشیان هەیە.[٢٥٩] لەسەرو ئەوەشەوە بازاڕی رەش سودێکی باشی هەبووە بۆ دەوڵەتی سووریا بۆ جۆشدانی ئابووری و ئاسانکاری کردن بۆ کۆچبەرە کوردە سوورياییەکان لە لایەن موخابەرات و بەرپرسەکانی دیکەی دەوڵەتەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە لەوانەیە مەبەستی کەمکردنەوەی کورد لە سووریا لە پشتی ئەوەوە بێت.

## کولتوور

بە پێی بیردۆزە باوەڕپێکراوەکان، کولتوور و زمان، مێژووی هاوبەش و نیشتمانی نەتەوەیی بە بنەما سەرەکییەکانی وەك نەژاد و نەتەوەیی دادەنرێن.[٢٦٠] ئەم سیفەتە هاوبەشانە، خەڵك و کۆمەڵگە بە پێناسنامەیەکەوە گری دەدەن، کە بنەمای نەتەوایەتیبوونە. بایەخی پاراستنی کولتوور، زمان و هەروەها پیادەکردنی ئاین لە نێو گروپە کەمە نەتەوایەتییەکانی دەوڵەتێك لە لایەن کۆمەڵگەی یاسایی نێودەوڵەتییەوە ناسێنراوە، وەك کۆمەڵگەی جیهانی لەبارەی مافە کولتووری و سیاسییەکان ICCPR و جاڕنامەی جیهانی نەتەوە یەکگرتووەکان لەبارەی مافەکانی مرۆڤـەوە UDHR ماددەی ٢٧ی بەندێکی ICCPR"

[٢٥٨] چاوپێکەوتنێك لەگەڵ خێزانێکی کوردی بێگانە لە ناوچەی جەزیرە، ئۆگۆستی ٢٠٠٢، چاوپێکەوتنێك لەگەڵ نووسەرێکی کورد، دیمەشق، ٢٠٠٢، چاوپێکەوتنێك لەگەڵ پارێزەرێك، دیمەشق، ٢٠٠٢، زانیارییەکان لەلایەن wkaکۆمەڵەی رۆژئاوای کوردستانەوە بە دەست هاتوون، لەندەن، ٢٧/ئۆکتۆبەر/٢٠٠٣

[٢٥٩] بێرکۆ ٢٠٠٤، دێر سپیگڵ ١/٢٠٠٤

[٢٦٠] هەمان سەرچاوە

"لەو دەوڵەتانەی کەمە نەتەوایەتی نەژادی، ئاین یان زمان هەیە، ئەو کەسانەی، کە سەر بەو کەمە نەتەوایەتییەن نابێت مافەکانیان پێشێل بکرێت لەو کۆمەڵگەیەی، کە ئەندامەکانی تری گروپەکەی تێدایە، پێویستە خۆشی لە کولتووری خۆیان ببینن، بانگەشەی ئاینی خۆیان بکەن، یان زمانی خۆیان بەکار بهێنن."

نەتەوەی کوردیش یەکێکە لەو گروپانەی، کە کەمە نەتەوایەتییەکی نەژادی و زمانی هەیە لە سووریا و عێراق و ئێران و تورکیا و لە کۆماری سۆڤیەتی یەکگرتووی پێشوودا، کە بەهۆی دابوونەریتی کولتووری و زمانێکی زاڵ و ژمارەیەك دیالێکتی نزیك لە یەکەوە و مێژوویەکی هاوبەش، کە بە هۆی هەڵکەوتنە جیۆگرافیاییەکەوە لە ناوچەی کوردستان دەناسرێتەوە.

سەرەڕای ئەوەش لە لایەن عەرەب و فارس و ئیمپراتۆریای عوسمانییەوە بە هەڵە لێکدراوەتەوە. لە میانەی بە عەرەبکردنی ناوچە کوردییەکان و خەڵکەکەی، رژێمی سووریا ژمارەیەك رێگر و بەربەستی لە بەردەم چەند دەربڕینێکی پێناسنامەی کولتووریی کوردیدا بە زۆر دانا، لەوانە پێشێلکردنی زمانی کوردی و ڤیستیڤاڵ و دابوونەریت.

سەرچاوە مێژووییە کوردییەکانی تایبەت بە بوونی کورد لە سووریادا لابراون، یان بە عەرەبکراون. ئامانجە سیاسییەکانی، بە زۆر ناساندن و تێکەڵکردنی کوردە بە نەژاد و کولتوور و پێناسنامەی نەتەوایەتی عەرەب.

سووریا بە شێوەیەکی یاسایی ناچارکرا لە ژێر سایەی پەیوەندی و رێکەوتنە نێودەوڵەتییە جۆراوجۆرەکاندا، کە پارێزگاری لە نەژاد و گروپی کەمە نەتەوایەتییەکان و کولتوورییان بکات.[261]

لەگەڵ ئەوەشدا پێشێلکردنی پێناسنامەی کولتووری کوردی لە سووریا بەردەوام لە زیادبووندا بوو، هیچ ئاسانکارییەك بۆ پەیڕەوکردنی کولتوور و داب و نەریتی کوردی نە لە دەستوور و نە لە یاسای سزاداندا دابین نەکراوە.

ئەو بەربەستانەی لە بەردەم پەیڕەوکردنی کولتوورە کوردییەکان لە خوارەوە ئاماژەیان پێدراوە، بنەڕەتیترین بنەمای گروپە کەمە نەتەوایەتییەکان و مافە

---

[261] بۆ نموونە گەلنەر ١٩٨٣ و ئەندرسن ١٩٩١.

کۆلتوورییەکانە لە جاڕنامەی جیهانیی مافی مرۆڤی نەتەوەیەکگرتووەکان UDHR و کۆبوونەوەی نێودەوڵەتی لەبارەی ئابووری و کۆمەڵایەتی مافە کولتوورییەکان ICESCR هاتووە و سووریاش بە هەموو ئەوانە قایل بووە.

## زمان

لەبەرئەوەی زمان خەسڵەتێکی بنەڕەتی و گرنگی نەتەوەیە، وابەستەیی و قەدەغەکردنی زمان بۆ نەتەوەیەك یان ڕەگەزێك و خەڵکەکەی سنووردار بکرێ لەگەڵ زمانێکی هاوبەشدا، ئەوە کار لە ناوەڕۆکی پێناسنامەکەیان دەکات.

. لە ساڵی ۱۹٦۳ لە لایەن محەمەد تەڵەب هیلالەوە پێشبینی ئەوە دەکرا، کە ئەو لەو بڕوایەدایە زمانی کوردی هەڕەشەیەك بێت بۆ دروستبوونی دەوڵەتی سەربەخۆی کورد.

لە لێکۆڵینەوەکەیدا ئەوەی روون کردەوە، کە چۆن قسەکەرێکی عەرەب لە توانایدا نییە لە زمانی قسەکەرێکی کورد تێبگات، لەمەشەوە هەوڵی جێبەجێکردنی پیلانەکانیان دەدا.[٢٦٢] ئاشکرای کرد، کە کاتێ کوردەکان واپێشان دەدەن گوایە بۆ رژێم دڵسۆزن، ئەوە بەکارهێنانی کوردایەتییە بۆ وەدەرنانی عەرەبەکان و ڕێ پێدانیان بۆ بەکارهێنانی نەتەوەی کورد وەك چەکێك دژی عەرەبەکان و پلانگێڕانێکە بۆ دامەزراندنی نیشتمانێکی نەتەوەیی کوردی. کاتێك هیلال زمانی بە سەرەکیترین هۆ دانا وەك هەڕەشەیەکی کوردی، لەو باوەڕەدا بوو تەنها لە رێی رۆشنبیرییەوە بە عەرەبکردن بەس نییە بۆ ئەژماردکردنی گومان لە پلانە کوردییەکان بۆ ئازاردانی نەتەوەی عەرەب لە رێی بنیاتنانی دەوڵەتی کوردییەوە[٢٦٣].

لە سووریا زمانی کوردی (کرمانجی) وەك زمانێکی رەسمی نەناسراوە، لەوەش زیاتر، بە هەموو شێوەیەك فێربوون، یان فێرکردنی زمانی کوردی لە خوێندنگا و

---

[٢٦٢] هەمان سیاسەت لە تورکیاش پیادە کراوە، کوردەکان وەك تورك دەناسێنن و رەگەز و نەژاد و پێناسەی نەتەوایەتییان پێشێل کراوە. لە ئێران، لە شۆڕشی ئیسلامیی ۱۹۷۹ەوە، سیاسەتەکەیان هاوتا کردووە و هاوڵاتیبوون لەژێر ئاڵای ئاییندایە نەك نەژادێکدا.

[٢٦٣] هیلال ۱۹٦۳: ٢٦-٢٨.

تەنانەت بە شێوەیەکی تایبەتیش لە کوردەکان قەدەغەکراوە.٭ ئەم چالاکییانە وەك تاوانێکی پیاوکوژی و نایاسایین. سەرەڕای ئەوەی زمانی کوردی، بۆ زۆرینەی کوردی سووریا زمانی دایکە، ئەوان بە شێوەیەکی گشتی هەتاکو تەمەنیان دەبێتە شەش ساڵ زمانی عەرەبی فێر نابن.

کورد وا راهاتبوون، کە لە ٩٠٪ی رۆژەکانی ژیانیان لە هەرێمە کوردییەکان بەسەر بەرن. سیاسەتی سووریا بەرامبەر بە زمانی کوردی چەندین ناکۆکی و دژایەتییەکی تێدایە بە بەراورد لەگەڵ سیاسەتی ئەو وڵاتە بەرامبەر گروپە کەمایەتییە نەژادییەکان و زمانە بیانییەکانی تر. ئەرمەنی و ئاشووری و جولەکەکان رێگەیان پێدراوە زمانی خۆیان فێربن و هەروەها بە کولتوور و داب و نەریتەکانیان و لە قوتابخانە تایبەتییەکانیان و لە یانە و کۆمەڵە کولتوورییەکان ئاشنا بن. لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی زۆر قوتابخانە و پەیمانگای تایبەتی فەرەنسی و بریتانی و روسی و چەندین زمانی تری ئەوروپی هەن و خوێندن تیایاندا بە خۆڕاییە.
قەدەغەکردنی فێرکردن و فێربوونی کوردی لە هەموو ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان بەسەردا درێژبۆتەوە، مانای ئەوە دەگەیەنێت، کە زمانی کوردی بە شێوەیەکی رەسمی ستاندار نەکراوە و زۆربەی کوردەکان شارەزای زمانی دایکی خۆیان نین.
لەگەڵ ئەوەشدا فێرکردنی کوردی بە شێوەیەکی نهێنی و هەندێك جاریش لە لایەن حیزبە کوردییەکانەوە رێك دەخرێت بەڵام چالاکییەکانی نایاساین. وانەکان لە ماڵەکاندا بە شێوەیەکی نهێنی دەوترێنەوە و کەم کەس بۆ فێرکردنی زمانی کوردی خۆی تەرخان دەکات چونکە زمانی کوردی لە سووریا نایاساییە و بە پێی دەوڵەت فێرکردن و فێربوونی زمانی کوردی ئیهانەیەکی سیاسییە و وەك هەڕەشەیەك لە یەکگرتویی دەوڵەت دادەنرێت.
لە ساڵی ١٩٨٦ بە پێی بڕیاری ١٠١٢/س/٢٥ بەکارهێنانی زمانی کوردی لە کارگە و شوێنە گشتییەکان و سینەماو کافێکاندا قەدەغە کرابوو.[٢٦٤] پاشان لە ساڵی

---

[٢٦٤] هەمان سەرچاوە

١٩٨٩ گۆرانی جیاواز لە عەرەبی بۆ نموونە کوردی لە ئاهەنگ و ڤیستیڤاڵەکاندا بە پێی بڕیاری ژمارە ١٨٦٥/س/٢س/١٢، ١٩٨٩ قەدەغە کرا.[٢٦٥] پاشان هەوڵی زیاتر درا بۆ قەدەغەکردن و ڕێگرتن لە بەکارهێنانی زمانی کوردی لە ئاخاوتندا بە شێوەیەکی ئاشکراو گفتوگۆکردن و جگە لە زمانی عەرەبی لە کاتی دەوامی ئیشکردندا ڕێپێنەدراو بوو. یەکێك لەو زنجیرانە، زنجیرە بڕیاری H/٧٠١٤/ ی ٣/١٠/١٩٩٦، کە دەگەڕێتەوە بۆ بڕیارێکی تری ساڵی١٩٨٩ و مەبەستی زیاتر بەهێزکردنی ڕێگرتن و کۆنترۆلکردنی بەکارنەهێنانی زمانی بەدەر لە عەرەبی لە پارێزگای حەسەکە لە شوێنە گشتییەکان و کارگەکاندا. ئەم زنجیرە بڕیارە تەنها لە پارێزگا کوردییەکاندا جێبەجێ کرا، کە زۆرینەی کوردن، ئەمەش ئەوەی دەرخست، کە زمانی کوردی زمانێکە ئەم فەرمانە بەدوای قەدەغەکردنیەوەیەتی.

لە ئایاری ٢٠٠٠ بڕیاری ٧٦٨، فەرمانی دا هەموو ئەو دوکانانەی، کە شریت و ڤیدیۆیان بە زمانی کوردی و لەبارەی کۆبوونەوە نهێنی و ڤیستیڤاڵەکانەوە تێدا دەفرۆشرێت داخرێت. ڕێکخستنی هەر کۆبوونەوەیەکی نهێنی و ئاشکرا و ئاهەنگ و ڤیستیڤاڵ گێڕان پێویستی بە ئەستۆپاکی و مۆڵەتی ئاسایشی سیاسی هەیە.

ئەستۆپاکی تەنها بە مەرجێك دەبەخشرێت، کە گۆرانی کوردیی تێدا نەوترێت. لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٤ وا ڕاگەیەنراوە لە کۆتایی ڕێکخستنی ئاهەنگی شەوی سەری ساڵ لە کوبانی، کە دەیویست بە شێوەیەکی ئاشکرا گۆرانی جیاواز لە عەرەبی لەو کۆبوونەوانەدا نەوترێت، کە مۆڵەتی ئاهەنگ گێڕانەکەیان لە لایەن بەشی سیاسی ئاسایشی حەڵەبەوە پێدراوە. هەروەها گۆرانی بێژە کوردییەکانی وەك ڕەشید سۆفی دەبووایە واژۆیان بکردایە، کە گۆرانی بە کوردی نەڵێن. ڕەشید سۆفی گۆرانی نەدەوت. بەڵام کاتێك ڕەشد سۆفی مایکەکەی وەرگرت، کە لەوانە بوو بڵێت یەکێك لە پیاوانی ئاسایش لە نێو بینەردا خۆی حەشارداوە و ئەوەش ڕێی لێگرت گۆرانی نەڵێت. بەمەش شەڕ لە نێو ژمارەیەك لە پیاوانی ئاسایش و بینەراندا بەرپابوو.[٢٦٦]

---

[٢٦٥] ماندۆراڵ ١٩٩٨: ٤٧.

[٢٦٦] دام ١٩٩٦: ١٧٢، تێبینی ١١.

## ناوی شوێنەکان

لە سەرانسەری سووریادا ناوی شوێن و ناوچەکان بەعەرەبی یا بە ئیسلامی کراون، بۆ نموونە جەبەل ئەلدروز شاخی دروز لە باشووری سووریا ناوەکەی گۆڕا بە جبل العرب و لەبەرئەوەی، کە ناوەکەشی نزیك بووە لە زیۆن، قەڵات سەهیون نزیك لەتەکیە گۆڕاوە بە قەڵای سەلاحەدین، هەروەها بوونی قەڵا هیچ پەیوەندییەکی مێژوویی بە ناوی ئەم شۆڕشگێڕە کوردەوە نییە، کە دژی خاچپەرستەکان جەنگاوە. هەرچەندە بڕوا وایە، کە کراك دی چەڤالیەرس لە رۆژئاوای سووریا شورایەکی بەهێزی کورد بووە، کە لە سەدەی دوانزەیەمدا لە لایەن گروپە بەکرێگیراوەکانی کوردەوە بنیات نراوە، کە لە دژی سەلاحەدینی ئەیوبی دەجەنگان و ئەو شورایەیان بە دەوری دیمەشقدا دروستکرد.

فرەنسیەکان لەکاتی مانەوەیان لەو ناوچانەدا بەپێی ئەو فەرمانەی کۆمەڵەی میللەتان پێی دابوون، ناوی کراکیان لە شووراکە نا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ناوە فرەنسییە و هیچ مانایەکی نییە، بەڵام باوەڕ وایە لە کۆی وشەی کوردوە وەرگیرابێت، کە بە عەرەبی (اکراد)ە.

وەك بەشێك لە بەعەرەبکردنی ناوچە کوردییەکان، حکومەت چەند بڕیارێکی دەرکرد، کە فەرمانی دابوو بە گۆڕینی ناوە کوردییەکانی شار و لادێ و گوندەکانی جەزیرە و کوبانی و ناوچەی کورداخ بۆ ناوی عەرەبی.

تەنها لە پارێزگای حەسەکە زیاد لە ٣٢١ گوندو ٧٢ کێڵگە بە پێی ئەو بڕیارە ناوەکانیان گۆڕاوە.[٢٦٧] لە ١٥/شوباتی/١٩٧٨ حوکومەت ناوی ٣٢١ گوندی حەسەکەی گۆڕیبوو، بەڵام ئەم سیاسەتە لێرەدا کۆتایی پێ نەهات.

لە ٦/ کانونی دووەم/ ١٩٨٨ بڕیارێك درا،[٢٦٨] بە پێی بڕیاری ١٤٨٧٥ ناوی ٥٥ گوند و ٤٩ کێڵگە لە سەرێ کانیێ (رأس العين) و قەزای دەربەسیەی پارێزگای حەسەکە لە کوردییەوە گۆڕدراوە بە عەرەبی.[٢٦٩]

پاشان ٥/ئاياری/١٩٨٨ بە پێی بڕیاری ژمارە ن٢١٢٣ فەرمانلدرا ناوی زیاد لە ٩٧ گوندو ٢٣ کێڵگەی پارێزگای حەسەکە بکرێ بە ناوی عەرەبی.[٢٧٠] لە کورداغ و

---

[٢٦٧] لە ماڵپەڕی کوردی قامیشلۆوە Qamishlo.com لە ٨/ جەنیوەری/ ٢٠٠٤دا راپۆرتی لەبارەی دراوە.

[٢٦٨] ئەحمەد ٢٠٠١: ٨٢

[٢٦٩] ئەحمەد ٢٠٠١: ٨٣-٨٦، ماکدزوڵ ١٩٩٨: ٤٩.

[٢٧٠] ئەحمەد ٢٠٠١: ٨٢.

ناوچەکانی کوبانی، بە پێی بڕیاری ژمارە ٥٨٠ی[٢٧١] وەزارەت یان لەوانەیە ژمارە١٥٨٠١ی[٢٧٢] ١٨/ئایار/١٩٧٧ ناوی گوندەکان و قەڵا کوردییەکان گۆڕدران بۆ عەرەبی. لە ژێر سایەی ئەم بڕیارە ١٥١ گوند لە کورداغ و ١٦١ گوندی کوبانی عین العرب لە لیستێکی ٨ لاپەڕەییدا تۆمارکران بۆ ئەوەی بڕیارەکەیان بە سەردا جێبەجێ بکرێت.[٢٧٣]

نموونەی بە عەرەبکردنی شوێنەکان وەك: لە پارێزگای حەسەکە ناوەکانی دێرێك کرا بە مەلیکییە و عامودێ گوڕا بە (ئەدنیە) و سەرێ کانیێ گۆڕا بە (رأس العین) و دەربەسیە گۆڕا بە خەسانیە و تیلکوچیك گۆڕا بە یعروبیە. لە کورداغ، عەفرین بوو بە عروبە و کوبانی بوو بە عین العرب.

زۆربەی کوردەکان بەردەوام ناوی شارو گوندو کێڵگەکانیان هەر بە ناوە کوردییەکەوە ناو دەبرد، بەڵام ئەم نیشانە سروشتی و مێژووییە لە رەوشتی بەسەرچووی کورد ەوەیە.

ئەم بڕیارە بەسەر هەموو ناوچە کوردییەکانی سووریادا کاریگەری هەبوو، بەشێکی تری ئەم پڕۆژەیە بە عەرەبکردنی ناوچە کوردییەکان و لابردن و دیاریکردنەوەی پێناسنامە و پاشماوەی مێژووی کوردە.

بە عەرەبکردنی ناوی شوێنەکان، پاکردنەوەی پێناسنامە و مێژووی کورد بوو لەو ناوچانەدا و هەروەها نەهێشتنی ئەو هۆکارانەی، کە کورد بانگەشە بۆ خاکەکەی بکات.

بە چەشنێك دەوڵەت توانی سووربێت لەسەر ئەو هێڵە رەسمییەی کەوا کورد دانیشتوانێکی کۆچەرین و لە تورکیا و عێراقەوە هاتوون و لە سووریا جێگیر بوون. پاشان دەوڵەت سوور بوو لەسەر ئەوەی، کە کورد هیچ بنچینەیەکی ناسینەوەی نەتەوایەتی و مافی نەماوە.

---

[٢٧١] هەمان سەرچاوە

[٢٧٢] هەمان سەرچاوە

[٢٧٣] ماکدۆوەڵ ١٩٩٨: ٤٩، ١٩٩٦: ٥١، چاودێری مافەکانی مرۆڤ، ئۆکتۆبەری ١٩٩٦: باشکۆی نی.

## ناوی منداڵان

لە ساڵی ١٩٩٢ بە پێی ڕێنمایی وەزیری ناوخۆ، بڕیارێك دەرکرا کەوا ئەو دایك و باوکانەی ئارەزوویانە ناوی منداڵەکانیان بە ناوێکی جیاواز لە عەرەبی بنێن، ئەوا پێویستە بەڵگەی بەشی ئاسایشی ناوخۆیان هەبێت.[٢٧٤]

ئەم فەرمانە بە شێوەیەکی زۆر نێگەتیڤانە کاریگەری هەبوو بۆ کوردەکانی سووریا.

بە هەمان شێوەی هۆی قەدەغەکردنی زمانی کوردی لە تورکیا بەو بیانوەی، کە ئەم فەرمانە لەسەر بناغەی ئەو ڕاستییەیە، کە ئەلفوبێی عەرەبی ئەو پیت و دەنگانەی وەك پ.ڤ.چ..ۆ ی تێدانییە.

لە ڕوانگەی ئەو ڕاستییەوە کەوا هەندێك ناوی کوردی ڕێپێدراوە ئەوە تەنیا ئەو ناوانەن، کە ئەو پیتانەی سەرەوەیان تێدا نییە بۆیە دەتوانرێت منداڵێك ئەو ناوەی لێبنرێت، لە کاتێکدا هەمان ناو نابێت لە یەکێکی تریش بنرێت، ئاشکرایە، کە تۆمارکردنی ناوی کوردی منداڵ، لە دەسەڵاتی دەزگاکانی ئاسایشدایە.

وەك هەموو کاروبارە فەرمییەکانی تر لە سووریا، ئەم مەسەلەیەش دەتوانرێت بە بەرتیل چارەسەر بکرێت.

## ناوی بازرگانی

لە ساڵانی ١٩٩٠دا فەرمان درا زۆربەی ناوە بازرگانییە کوردییەکان بۆ ناوی عەرەبی بگۆڕێن. لە شوباتی ١٩٩٤ سوبحی حەرب، پارێزگاری حەسەکە ڕایگەیاند، کە ناوە بازرگانییە ناعەرەبییەکان ماوەی یەك هەفتە مۆڵەتیان هەیە تا بگۆڕێن بۆ ناوی عەرەبی یان لە عەرەبییەوە نزیك بن.

---

[٢٧٤] ئەحمەد ٢٠٠١: ٨٢، چاودێری مافەکانی مرۆڤ، ئۆکتۆبەری ١٩٩٦: پاشکۆی نی.

هاوشێوەی ئەم بڕیارە بە هەمان یاسا بەسەر هەموو سووریادا جێبەجێ کرا. بە بیانووی ئەوەی، کە لە بنەماوە ئەلفوبێ بەسەر هەموو ناوە بازرگانییە بیانییەکاندا جێبەجێ بکرێت. بەڵام ئەم بڕیارە بەسەر ناوە بازرگانییە ئینگلیزی و فرەنسی و ئەرمەنییەکاندا جێبەجێ نەکرا.

تەنانەت ستۆدیۆیەکی وێنەگرتن لە کورداغ، کە ناوی ستۆدیۆی ٢١ بوو، بەڵام فەرماندرا بە گۆڕینی ناوەکەی. ئەم ناوە دەگەڕایەوە بۆ نەورۆزی کورد، کە ساڵانە لە ٣/٢١ دا یادی دەکرێتەوە، لەبەر نزیکیان لە یەکەوە ناوی ستۆدیۆکە گۆڕدرا بە ستۆدیۆی ٢٣ و هیچ ڕەخنەیەکی لە سەر نەبوو.[٢٧٥] لە ڕاستیدا ڕەخنە لەسەر ژمارە ٢١ هەبوو، نەك لەسەر وشەی ستۆدیۆ، پێشنیارێکە لە دژی ناوە بازرگانییە کوردییەکەیە نەك لەبەر ئەوەی وشەیەکی بیانی یان بە نووسینی بیانی وەك ستۆدیۆ بەکارهاتووە.

هەرچەندە ئەمڕۆ چەند ناوێکی بازرگانیی کوردی هەن زۆربەیان هەر بە نووسینی کوردی دەنووسرێن بەڵام نایاسایین.

## ڕاگەیاندن و چاپەمەنی و بڵاوکردنەوە

ئازادیی ڕاگەیاندن لە لایەن دەوڵەتەوە لە سووریا بە توندی سنووردار کراوەو کۆنترۆڵ دەکرێت. سەرەڕای ئەو زەحمەت و کێشە گشتییانەی شوناسی عەرەبی و دەوڵەتی و قەدەغەکردنی بەکارهێنانی زمانی کوردی، مانای ئەوەیە، کە ئەم کۆت و بەندانە بە شێوەیەکی بەرچاو کاردەکەنە سەر دانیشتوانی کوردی سووریا.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەدیب شیشەکلی١٩٥١-١٩٥٤دا چاپەمەنی و بڵاوکراوە کوردییەکان بە شێوەیەکی فەرمی قەدەغە کراون و بە هەمان شێوەش لە سەردەمی ساڵانی کۆماری یەکگرتووی عەرەبی ١٩٥٨-١٩٦١ بڵاوکراوە کوردییەکان قەدەغە بوون. هەردوو ڕژێم هەڵمەتی دەوڵەتییان لە دژی کورد ئەنجام داوە، کە تێیدا بڵاوکراوە کوردییەکان دەستیان بەسەردا گیراوە و لەناوبراون. حیزبی

[٢٧٥] ناسراوە بە بڕیاری ژمارە ١٢٢، ئەش لە قەزای حەسەکەدا بەکارهلت، بەدرەدین ١٩٩٩: ١٢٩.

بەعسیش قەدەغەکردنی بڵاوکراوەی کوردیی زیاد کرد، ئیتر بڵاوکراوەکان کتێب بوونایە یان ڕۆژنامە و گۆڤار و نامیلکە. نووسەرە کوردەکان و حیزبە سیاسییە کوردییەکان ناچاربوون کتێب و بەرهەمەکانیان لە وڵاتانی دراوسێی وەك لوبنان، چاپ و بڵاو بکەنەوە، کە بە نرخێکی زۆر گرانتر و دواتریش بە قاچاغ دەیانهێنانەوە بۆ سووریا و خۆیان دابەشیان دەکردن. تەنانەت لە سایەی فەرمانڕەوایی بەشار ئەسەددا، کۆت و بەند لەسەر چاپەمەنی و ڕاگەیاندن زۆرتر بووە.

لە سێپتەمبەری/ ٢٠٠١دا حوکومەتی سووریا یاسای گشتی ١٩٤٩ی لەبارەی چاپەمەنییەوە گۆڕی و فەرمانی ژمارە ٥٠ جێگەی گرتەوە، کە بۆ بڵاوکەرەوە، چاپخانە، گۆڤار و ڕۆژنامەنووس، نووسەر و خاوەنی دوکانی کتێبفرۆشی بەکار دەهێنرا، فەرمانەکە لە ٥٠ بەند پێکهاتبوو، کە سنووری بۆ بڵاوکراوەکان دانابوو لەگەڵ فراوانکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت بەسەریاندا، لە کاتێکدا لە لایەن ڕژێمەوە وا بڵاودەکرایەوە، کە ڕاگەیاندن و چاپەمەنی و میدیاکان سەربەستن و ڕێ پێدراون، لەگەڵ مۆڵەتدان بە ژمارەیەك ڕۆژنامەفرۆشانی ئازاد و ئۆرگانی حیزبە سیاسییەکان لەنێو بەرەی نیشتمانی پێشکەوتوخوازدا. ڕژێمی سووریا لە لایەن هەوادارانی مافی مرۆڤەوە سەرزەنشت کراوە، کە میدیای سووریایان لە دەوری بەرددا هێشتۆتەوە. ئەوانەی پێچەوانەی فەرمانەکە کار بکەن، بەند دەکرێن و سزا دەدرێن، بەڵام بەو شێوە هەڵوێست و کردەوانە نەیانتوانی، سووریا بخەنە ئاستی ئەو ئازادی و سەربەستییەی، کە ICCPR باسی لێوە دەکات و بە تایبەتی لە بەندەکانی ١٩،٢٧دا پیادەی کردووە.

بەندەکانی بڕیاری ژمارە ٥٠ دابەشکراوە بەسەر چوار بەشدا:

١. ئەوانەی، کە داوا پێشکەش دەکەن بۆ مۆڵەت، خاوەنداری و بەگەڕخستنی چاپ و بڵاوکراوەکان.
٢. ئەوانەی لەم چوارچێوەیەدان، کە بڵاوکەرەوەکان و چاپخانەکانن، دەبێت ڕۆژانە زانیاری بدەن بە حوکومەت.
٣. ئەوانەی سنووری بۆ دیاری کراوە و یان قەدەغەن، بابەتێکی دیاریکراو یان ئاوازێك لە بڵاوکراوەکاندا...
٤. ئەوانەی بە پێی بڕیاری ژمارە ٥٠ سزا دەدرێن لەبەر سەرپێچی کردنیان.

یاسا دەسەڵاتی داوە بە سەرەك وەزیران بۆ لێسەندنەوەی مۆڵەتی بڵاوكراوە و چاپخانە بەو هۆیانەوە، کە ئەو بڕوای وایە پەیوەندی بە بەرژەوەندی خەڵکەوە هەیە.[٢٧٦] بەو شێوەیە دەسەڵاتەکە دراوە بە لقی جێبەجێکردنی دەوڵەت بۆ چاودێریکردنی تەواوی هەموو بڵاوکراوەکان. بەندی ٦و٧ ی فەرمانەکە ئەوە روون دەکاتەوە، کە دەبێ کۆمپانیا دابەشکار و چاپەمەنییەکان ژمارەی سپاردنی هەموو چاپکراوێ تۆماربکەن و بیپارێزن و کۆپی هەموو بڵاوکراوەیەك لە هەمان رۆژدا بدەن بە وەزیری راگەیاندن لەگەڵ زانیاریی لەبارەی ژمارەی کۆپییەکانی چاپکراوەکە. هەموو بابەتە بڵاوکراوەکان، لەوانە کتێب، نامیلکە، مۆزیك یان تابلۆ و وێنە، دەبێ ژمارەی سپاردنی لە تۆمارگەی کۆمپانیەکەدا لەگەڵ رۆژی چاپکردنی پێوە بێت بەندی ٨. سەرباری ئەوەش بەندی ٩ فرۆشیارەکان و دابەشکارانی بابەتە بێگانەکانی وابەستە کردووە، کە کۆپییەك لە هەر بابەتێك پێشکەشی وەزیری راگەیاندن بکەن بەر لەوەی بابەتەکە بخرێتە بازاڕەوە. هەروەها بەندی ژمارە ١٠ دەسەڵاتی داوە بە وەزارەتەکان بۆ رێگرتن لە هاتنە ناوەوەی ئەو شتانەی ئەگەر، بزانرێ، کە کاریگەری ناجۆریان هەیە لەبارەی سەروەریی نەتەوە و ئاسایش یان تاوان و کردەوەی ناپەسەند هەیە.[٢٧٧] هەروەها رێگرتن لە وتە و زمانی ناجۆر و بڵاوکردنەوەی ئەو شتانەی کار دەکەنە سەر بیرو بۆچوونی خەڵکی و هانیان دەدەن بۆ تاوان کردن، بۆ ئەو مەبەستەش فەرمان دەرکراوە بە سزادانی ئەوانەی ئەو جۆرە کارانە دەکەن.[٢٧٨] هەروەها ئەوانەی درۆدەکەن و راپۆرتی هەڵبەستراو پێشکەش دەکەن، یان شتێك، کە زیان بە بەرژەوەندیی گشتی، یان "ئاسایشی نەتەوەیی " یان "یەکێتیی نیشتمانی" دەگەیەنێت.[٢٧٩] نەبوونی پێناسەیەك بۆ ئەم زاراوانە بەرپرسیارێتی ئەوانی زیاتر کردووە و لە ئاکامیشدا بۆتە هۆی ئەوەی دەزگاکانی بڵاوکردنەوە و چاپەمەنی و نووسەر و رۆژنامەنووس و دابەشکاران پابەند بن بەو مەرجانەوە. لە ئەنجامی ئەوەشدا بە تاوانکردنی دەربڕین بەو جۆرە بوواری دادگایکردنی بە تۆمەتی تاوانی سیاسی فراوانتر بووە. ئەم یاسایە بە گرنگییەوە سانسۆری چڕتر

---

[٢٧٦] ئەم زانیاریە لە لایەن کۆمەڵەی رۆژئاوای کوردستانەوە دراوە، لەندەن، ٢٧/ئۆکتۆبەر/٢٠٠٣.

[٢٧٧] چاودێری مافی مرۆڤ٢٠٠٢/١/٣١: ١.

[٢٧٨] چاودێری مافی مرۆڤ ٢٠٠٢/١/٣١: ٧.

[٢٧٩] چاودێری مافی مرۆڤ ٢٠٠٢/١/٣١: ٥.

کردووەتەوە، کە حاڵی حازر خاسیەتی کۆمەڵگەی سووریا بووە و ئەرکی چاودێریی بەسەر دەزگاکانی پەخش و چاپەمەنی و نووسەرو دابەشکاراندا زیاتر کردووە.

بەندی۲۷ و ۲۸ ی بڕیارەکە داوا لە رۆژنامەنووس و توێژەر و وەرگێڕان دەکات، کە کار لە بواری راگەیاندندا دەکەن ببنە ئەندامی یەکێتیی رۆژنامەنووسان، کە لە لایەن حیزبی بەعسەوە کۆنترۆڵ کراوە. خۆ ئەگەر ئەندامی ئەو یەکێتیەش نەبن، ئەوا کارتی رۆژنامەنووسییان لە لایەن وەزارەتی راگەیاندنەوە بۆ دەرناکرێ.[280] دروستیی سەرچاوە لە سووریا وجودی نییە. رۆژنامەنووسان داوایان لی دەکرێت، کە زانیاری لە بارەی سەرچاوەکانەوە دابین بکەن ئەگەر حکومەت بیەوێت. سەرچاوەی زانیارییەکان پێویستە وەك "بەرپرس" بناسرێن و رەتکردنەوەی شاردنەوەی ناوی سەرچاوەکان دەکرێت ببێتە هۆی ئەوەی رۆژنامەنووسەکە کارتەکەی لی بسەنرێتەوە[281].

بڵاوکردنەوەی بەرهەم بە زمانی کوردی وەك ئەوە وایە هەوڵی گۆڕینی دەستوور بدرێت یان هەڕەشە بێت بۆ سەر یەکێتیی دەوڵەت بە پەیوەندی لەگەڵ داواکارانی کورد تا لە رووی نەتەوەییەوە دانیان پێدا بنرێت و هەروەك دەوڵەتیش بە شێوەیەکی گشتی وەسفی چالاکییە کولتوورییەکانی کورد بە کاری سیاسی دەکات. ژمارەیەکی زۆر لە هاووڵاتیی کورد بە هۆی نووسینی یان دابەشکردنی بەرهەمی نووسراوی کوردی دەسگیر دەکرێن. نموونەیەکی ئەوە، ئیبراهیم نەسانی نووسەری کوردە، کە لەبەر دابەشکردنی بابەتی کولتووری و پەروەردەیی کوردی لە سەرەتای ساڵی ۲۰۰۲ دا دەستگیر کرا.[282]

بەندی ۱٦، بڕیاری ژمارە ٥٠، تەنیا رێگەدەدات بە هاوڵاتییانی عەرەب بۆ خاوەنداری و بەرێوەبردنی خانەکانی بڵاوکردنەوە و چاپەمەنی،[283] لەبەر ئەوە کوردی سووریا رێگەیان پێنادرێت، کە رۆژنامە یان خانەی بڵاوکردنەوەیان هەبێت، یان پۆستی باڵایان لەنێو ئەو رۆژنامە و بڵاوکراوانەدا هەبێت. یاساکە ئاماژەی بە بەکارهێنانی زمانی ناعەرەبی نەداوە، بۆیە ئاشکرا نییە ئایا یاساکە رێگە دەدات بڵاوبکرێنەوە،

---

[280] چاودێری مافی مرۆڤ ۲۰۰۲/۱/۳۱: ۱.

[281] چاودێری مافی مرۆڤ ۲۰۰۲/۱/۳۱: ۸-۹.

[282] چاودێری مافی مرۆڤ ۲۰۰۲/۱/۳۱: ۹.

[283] کۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە سووریا، نۆڤەمبەری/۲۰۰۳: ۱٥.

بەڵام خانەکانی پەخش و چاپەمەنی لە ترسی ئەوەی نەوەك مۆڵەتەکانیان لی بسێنرێتەوە و تاوانی قورس بدرێتە پاڵیان و تەنانەت بە هۆی بڵاوکردنەوەی شتێکەوە حوکمی زیندانی بدرێن، کە ناتەبایە لەگەڵ بڕیارەکەدا، بڵاوکردنەوەی بەرهەمە کوردییەکان رەت دەکەنەوە.

بڵاوکراوە کوردییەکان لە هەندێك لە کتێبخانە گەورەکانی دیمەشق لە سووریا هەن، چەند کتێبێکی چیرۆك، کە بە زمانی کوردی نووسراون، لە دەستە چاودێرییەکانی سەر بە وەزارەتی راگەیاندن دەرچوون و توانراوە پێش بڕیاری ژمارە ٥٠ لە سووریا چاپ بکرێن.

یەکێك لەو کتێبانە ١٨ مانگی ویستووە تا رەزامەندیی بەدەست هێناوە[٢٨٤]. هەرچەندە هیچ کام لەو کتێبانە ئاماژەیەکییان بە کوردی سووریا نەداوە، بە شێوەیەکی گشتی چیرۆکن یان باسی مێژووی کولتووری کورد دەکەن، خۆ ئەگەر لە بارەی بابەتی سیاسیی کوردییەوە نووسرابن، ئەوا باسی کوردی دەوڵەتانی تر دەکەن.[٢٨٥] لە ئێستادا باسی ئەوە دەکرێت چەند خانەیەکی چاپ بە دەگمەن بەرهەمی کوردی چاپ دەکەن، هەروەك ترسی دادگاییکردنی بە تۆمەتی سەرپێچیکردن لە پابەندبوونەکانی بڕیارەکە و رووبەڕووبوونەوەی سزای توند رەنگە ئاکامەکانی بێت. لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٣دا، نووسەری کوردی پیر رۆستەم ناچارکرا دوو رۆمان، کە بە کوردیی نووسرابوون، بباتە تورکیا تا لەوی بڵاو بکرێنەوە.[٢٨٦]

بە هەمان شێوە، بە هۆی دابەشکردنی بڵاوکراوە کوردییەکانەوە، کتێبخانەکان لە لایەن دەزگاکانی ئاسایشەوە دادەخرێن، لە ساڵی٢٠٠١دا، کتێبخانەی بەدرخان لەحەڵەب داخرا و محەمەد حەمۆی خاوەنی دەسگیرکرا.

ئێستا ئەو لە تاراوگە و لە کوردستانی عێراق دەژی.[٢٨٧] یاسایەکی تر، کە کاری کردووەتە سەر ئازادیی رۆژنامەگەری و بڵاوکردنەوە و دابەشکردن، یاسای پاراستنی

---

[٢٨٤] چاودێری مافی مرۆڤ ٢٠٠٢/١/٣١: ٨.

[٢٨٥] عیزەدین مەلا، من الاساطیر الکردیة، بە عەرەبی، لە ئەفسانەی کوردیەوە دیمشق ٢٠٠٢.

[٢٨٦] نموونەی ئەو کتێبانەی، کە داستان نین و لە کتێب فرۆشییەکانی دیمەشقدان: الاتحاد الوطنی الکردستانی، أراء العربیة حول القضیة الکردیة دیمشق ١٩٩٣ و جواد مەلا، کوردستان والکورد. بیروت ١٩٩٠

[٢٨٧] فزگور پۆلیتیکا، ١٧/ نۆڤەمبەر/٢٠٠٣.

شۆڕش ژمارە/٦، ١٩٦٥/١/٧، کە ئاماژە بەوە دەکات لەکەدارکردنی وەك سەرپێچیکردنی سیستمی دەوڵەتی سۆشیالیستی دەبینرێت و قابیلی سزادانە.

لەکەدارکردنی ئەم جۆرە تەنیا کار ناگرێتەوە، بەڵکو وشەی سەرزار و نووسین و هەر جۆرێکی تری دەربڕین یان بڵاوکردنەوە دەگرێتەوە.[288]

بە درێژایی ساڵانی ٢٠٠٣ و ٢٠٠٤، چەندان کەس بە هۆی بە کارهێنانی ئینتەرنێتەوە دەستگیرکراون. کوڕێکی کوردیش، کە ناوی مەسعود حەمید بوو لە ٢٤/تەمووزی/٢٠٠٣ دا لە کاتی تاقیکردنەوەدا لە زانکۆی دیمەشق دەستگیر کرا.

گرتنەکەش پەیوەندی بە بڵاوکردنەوەی وێنەکانەوە بوو سەبارەت بە خۆپیشاندانی ئاشتییانەی کورد لە دیمەشق لە ٢٥/حوزەیران/٢٠٠٣ و ڕۆژی جیهانی منداڵان لە ماڵپەڕی کوردی Amude.com دا هەبوو.[289]

مەسعود حەمید لە زیندانی عەدرە بە تەنیا هێڵرایەوە. لە ١٠/ ئۆکتۆبەر/ ٢٠٠٤ لە لایەن دادگای ئاسایشی دەوڵەتەوە لە دیمەشق دادگایی کراو بە پێنج ساڵ زیندانی حوکم درا. پاشان حوکمەکەی بۆ سی ساڵ کەم کرایەوە ئەویش لە جیاتی ئەو کاتەی، کە حاڵی حازر لە زینداندا بەسەری بردبوو.[290] ئەو کەسانەی تریش، کە لە ماڵپەڕەکانی ئینتەرنێتدا نووسینیان بڵاو دەکردەوە، بە تۆمەتی" بڵاوکردنەوەی زانیاریی ناڕاست لە دەرەوەی سووریا" تاوانبار دەکران.[291] بە هەمان شێوەی تەرخانکردنی چوارچێوەی یاسایی بۆ گوشاری توندی ئازادی رادەربڕین و چالاکی سیاسی، ئەم یاسایانەی پەیوەندییان بە راگەیاندن و دەربڕینی گشتییەوەیە، کاریگەرییان لەسەر دانیشتوانی کورد لە سووریا بە شێوەیەکی بەرچاو هەیە، ئەویش لەبەر بارودۆخی سیاسیی زمان و کولتووری کوردی.

---

[288] چاوپێکەوتنێك لەگەڵ خێزانێکی کورد لە کوبانی، سووریا، ئۆگۆستی ٢٠٠٢.

[289] کۆمیتەی مافەکانی مرۆڤ – سووری ٢٠/نۆڤەمبەری/٢٠٠١.

[290] لێبووردنی گشتی جیهانی، ١٧/حوزەیران/٢٠٠٤.

[291] Bureau kurde de Liaison et d' Information ١٧June ٢٠٠٤

## داب ونەریت... نەورۆز

کورد یادی نەورۆز دەکاتەوە، ئاهەنگی ساڵی نوێی کورد لە ٢١/ ئازاردایە، هەروەك سەرەتای بەهارە و ڕۆژی بەسەرچوونی زستانە و هاتنی وەرزی بەهار، هەروەها یادی سەرکەوتنی ئەم گەلە ژێردەستەیە بەسەر زۆرداریێکدا دەکاتەوە. بە پێی ئەفسانەیەك ٢٥٠٠ ساڵ لەمەوبەر گەلی کورد لەلایەن زوحاك پاشاوە فەرمانڕەوایی کراوە. ڕۆژێك پاشا نەخۆش دەکەوێت و دوومار لە شانەکانیەوە دەردەچن. بۆ ئەوەی ئەو مارانە مێشکی خۆی نەخۆن، هەموو ڕۆژێك پاشا مێشکی دوو منالی دەرخواردی مارەکان دەدا.

کاوە، کە ئاسنگەرێکی ئازا بوو، پاشا چەند منداڵێکی ئەوی لەناو بردبوو، سەرکردایەتی ڕاپەڕینێکی لە دژی زوحاك کرد، بۆ ئەوەی خەڵك پەیوەندی پێوە بکەن تا پاشای زۆردار لەناو بەرن، ئاگرێکی لەسەر لوتکەی گردێك کردەوە، کاوە، زوحاکی لەناوبرد و خەڵکیش لە سایەی ئازادییە نوێکەیانەوە گەشانەوە.

بە شێوەیەکی گشتی نەورۆز لە دەرەوە و لەسەر گردەکان یاد دەکرێتەوە، ئاگری زۆر دەکرێتەوە و خەڵك ئەو بەرگانە دەپۆشن، کە ڕەنگی نەتەوەیی کوردن، وەك سور، سەوز، زەرد، سپی گۆرانی دەڵێن و سەما دەکەن، کورد یادی نەورۆز دەکاتەوە وەك هێمایەك بۆ تێپەڕاندنی وەرزی زستان و هاتنی ساڵی نوێ، هەروەك سومبوولی ئازادی و ژیان و شۆڕشیشە. ئەم یادە لە سووریا ساڵانە دەبێتە هۆی بارگرژی و پشێوی.

ئاهەنگی ساڵی نوێی کوردی لە سووریا قەدەغە دەکرێت و هەمیشە بووەتە بابەتی کۆت و بەند. کوردەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە پۆلیس و ئاسایشی سووریا بە وردی چاودێری ناوچە کوردییەکان دەکەن و کورد بە بەردەوامی ڕێگەی ئەوەیان لێگیراوە بە مەبەستی ئاهەنگ گێڕان سەردان و هاتووچۆ بکەن و ئەو بەرگانە بپۆشن، کە ڕەنگی نەتەوەیی کوردن.[٢٩٢] بۆئەوەی ئەو ئاهەنگانە ڕێگەیان پێ بدرێت، بە تەواوی

---

[٢٩٢] لێبووردنی گشتی جیهانی، ١٧/حوزەیران/٢٠٠٤.

بەندە بە کەشی سیاسیی ناوخۆی سووریا و دەسەڵات و توانای پارێزگاو دەزگاکانی ئاسایشەوە.

لەساڵی ١٩٨٧دا، نەورۆز چەندین خۆپیشاندانی کوردی گەورەی بەخۆوە بینی، کە تیایدا هەزاران کورد لە بەردەم تەلاری سەرۆکایەتی لە دیمەشق و عەفرین لە کورداخ کۆبوونەوە و داوای ئەوەیان دەکرد، کە بە ئازادی یادی نەورۆز بکەنەوە. کاتێك پۆلیس بەسەر خەڵکەکەدا تەقەیان کرد، کوڕێکی گەنج بە ناوی سولیمان حەماد ئەمین لە دیمەشق کوژرا. لە عەفرینیش لە باکووری ڕۆژئاوای سووریا، کاتێك پۆلیس هەوڵی دا خۆپیشاندەر و ئاهەنگ گێڕان بڵاوە پێبکات، سی هاووڵاتی کورد کوژران و زیاتر لە هەشتا کەس دەستگیر کران.[٢٩٣] دواتر و لە هەمان ساڵدا و لە ئەنجامی بەرزبوونەوەی هەستی نەتەوایەتیی کورد لەو ڕۆژەدا و ئەو پشێویەی قەدەغەکردنی یادکردنەوەی نەورۆز دروستی کردبوو، بە هەمان شێوەش کوشتن و دەستگیرکردنی ژمارەیەك لاوی کوردی لێکەوتەوە، حافز ئەسەد بڕیارێکی دەرکرد و ئەوەی ئاشکراکرد، کە ٢١/ئازار جەژنێکی نیشتمانیی ساڵانەیە بۆ یادکردنەوەی ڕۆژی دایك. باوەڕ وایە، کە ئەوە هەوڵێك بوو بێت بۆ کەمکردنەوەی پشێوی لە کاتی بۆنەو ئاهەنگەکاندا و لە گرنگی کەمکردنەوەی ئەو ڕۆژە بە هۆی کردنی بە جەژنێکی نیشتمانیی عەرەب. سەرەڕای ئەوەش پشێوی هەر هەیەو سەرکوتکردنی ئاهەنگەکانی نەورۆز بەردەوامە.

لە ساڵی ١٩٩٥دا یادکردنەوەی نەورۆز لە کورد قەدەغە کراوە بە بیانووی ئەوەی ساڵی پێشوو کوڕی حافز ئەسەد، کە وەك جێگرەوەی دەبینرا لە ڕووداوێکی ئۆتۆمبیلدا کوژراوە. لەسەر ئەم بنەمایانە دەسەڵاتی سووریا چاودێری ناوچە کوردەکانی سووریای کرد بۆ ئەوەی قەدەغەکردنێکی گشتی یادکردنەوەکان بسەپێنێت. لە ٢١/ماس/١٩٩٥دا کاتێك کورد بە نیازی ئاهەنگ گێڕان کۆبووبوونەوە نزیکەی شەست هاووڵاتیی کورد دەستگیر کران. دووبارە و لە ساڵی ١٩٩٧دا لەسەر بنەمای ئەوەی کاسێت و گۆرانی نەتەوەیی کوردییان بڵاو کردۆتەوە، ژمارەیەکی زیاتری هاووڵاتی کورد دەستگیرکران.

---

[٢٩٣] ماکدۆوەل ١٩٩٨: ٥٠-٥١.

نەورۆزی ساڵی ۲۰۰۳ بێدەنگ و کەم رووداو بوو، ئەویش بەهۆی جەنگی چاوەڕوانکراوی عێراقەوە، لە مارسی ۲۰۰٤دا، نەورۆز لە سایەی بوونی سوپای سووریا لە ناوچە کوردییەکاندا بەڕێوە چوو، دوای ئەوەی لە هەفتەیەك پشێوی و بارگرژیدا چەند هاووڵاتییەکی کورد کوژران. حیزبە سیاسییە کوردییەکان داوای ئەوەیان کرد هیچ بۆنە و ئاهەنگێك نەگێڕدرێت وەك رێزێك بۆ ئەوانەی لە گرژییەکانی هەفتەی پێشوودا کوژرابوون یان بریندار بوون یان دەستگیر کرابوون.

## مۆسیقا و گۆرانی

مۆسیقا بەشێکی ناوەندی کولتووری کوردییە، لە ساڵانی ۱۹٥۰وە مۆسیقای کوردی بووەتە ئامانجی دەوڵەت. شان بە شانی بڵاوکراوە کوردییەکان تۆماری مۆسیقا کوردییەکانیش دەستی بەسەردا گیراوە و خاوەنەکانیان لە هەڵمەت و کاردانەوە توندەکانی دژ بە کورددا و دوابەدوای رووخانی ئەدیب شیشەکلی لە ساڵی ۱۹٥٤دا زیندانی کران.[۲۹٤] بە هەمان شێوەش لە ساڵانی ۱۹۹۰دا و هەتا ئێستاش کورد بە تۆمەتی فرۆشتن یان بڵاوکردنەوەی مۆسیقای کوردی دەستگیر دەکرێن. کۆت و بەند خستنەسەر بەکارهێنانی زمانی کوردی ئاکامەکانی کاریان کردۆتە سەر قەدەغە بوون و توانای وتنی مۆسیقا و گۆرانی کوردی.

ساڵی ۱۹۸۷ نەجات ئەلعەتاری وەزیری رۆشنبیری بڕیارێکی دەرکرد، کە گوێگرتن لە مۆسیقای کوردی و بڵاوکردنەوەی کاسێت و ڤیدیۆ کاسێتی کوردی قەدەغەیە. لە کاتی دەرچوونی ئەو بڕیارەوە، ئەم سیاسەتە ناوبەناو توندی و نەرمی بەخۆوە دەبینێت. لە ئێستادا مۆسیقا و گۆرانی بە ئازادی لە سووریا دەست دەکەوێت. تۆمارگای گۆرانی و مۆسیقا لە شارە کوردییەکان و ناوچە کوردییەکانی دیمەشق پڕن لە کاسێتی گۆرانی کوردی، تەنانەت لەسەر شەقامەکانی دیمەشق، هەندێك شوێن بە ئاشکرا گۆرانی کوردی دەفرۆشن یان گوێی لێدەگرن. هەرچەندە لە هەمان کاتدا

---

[۲۹٤] ڤانلی ۱۹۹۲: ۱٦۳.

مۆسیقا و گۆرانی سیاسیی ناسیۆنالیستیی کوردی ڕێگەیان پێنادرێت، کە ئەوەش لە لایەن گۆرانبێژە دیارەکانی کوردەوە قبوولکراوە.[٢٩٥]

کۆبوونەوە و ئاهەنگ و بۆنەکان لە ناوچە کوردییەکاندا بەرلەوەی ڕووبدەن پێویستی بەوە هەیە ڕەزامەندی دەزگاکانی ئاسایشیان بۆ وەربگیرێت. ئەوە ڕاگەیەنراوە، کە زۆرجار ڕێکخەر و ئامادەبووانی ئەو بۆنانە پێویستە ئیمزای ئەوە بکەن، کە گۆرانی کوردی لە بۆنەکاندا نەگوترێت.[٢٩٦] هەروەك بە پێی ڕاگەیاندنەکان و بەوەی زۆر کەس لەناو کوردی سووریادا باوەڕیان وایە، کە بۆنە گشتییە کوردییەکانی وەك نەورۆز و ئاهەنگی ژنهێنان لە لایەن پۆلیس و موخابەراتەوە چاودێری دەکرێن بە مەبەستی بەئاگابوون لە دەربڕینی شوناس و ئارەزووی سیاسی نەتەوەی کوردی.[٢٩٧] نموونەی یادی ساڵی نوی لە کوبانی، کە لە سەرەوە باسکرا، ئەوە دەگەیەنێ، کە چۆن دەزگاکانی ئاسایش ڕێگە لە وتنی گۆرانی بە زمانی کوردی لەو جۆرە بۆنانەدا دەگرن، دیسانەوە کۆت و بەند دانان لەسەر گۆرانی و مۆسیقای کوردی یان چاوپۆشی لێکردنی وا دەردەکەوێت، کە کەشی سیاسی لە سووریا و ناوچەکە کاری تێبکات. لە ئەنجامی جەنگی عێراق لە ساڵی ٢٠٠٣دا کۆت و بەندی زیاتر بەسەر پراکتیزەکردنی نەریتی کولتووری کوردیدا سەپێنرا.

ڕووداوەکان گەواهی ئەوە دەدەن، کە گۆرانی وتن بە زمانی کوردی بە بەردەوامی کۆت و بەندی لەسەرە و زۆرجاریش قەدەغە دەکرێت، هەروەها ئەو یاسایانەشی، کە هەن وەك فەرمانێك بۆ چارەسەری ئەوە لەکەدارکردنی سیاسی دەستەبەر دەکەن.

---

[٢٩٥] ماکدۆوەڵ ١٩٩٨: ١٧.

[٢٩٦] چاوپێکەوتنێك لەگەڵ کوردێکی مۆسیقا فرۆش لە دیمەشق، ئۆگۆستی ٢٠٠٢. ناوەکەی لە لایەن نووسەرەوە پارێزراوە.

[٢٩٧] لە ماڵپەڕێکی کوردیەوە لە ٨/جانوەری/ ٢٠٠٤دا ڕاپۆرتی لەبارەی دراوە، Qamishlo.com

## مێژوو

محەممەد تەڵەب هیلال لە لێکۆڵینەوەکەیدا لەبارەی جەزیرەوە، کورد وەک خەڵکێکی شاخاوی دڕندە وەسف دەکات، کە نە مێژووی هەیە و نە شارستانی و زمان و نەژاد.[٢٩٨] کورد وەک "عەرەبی کورد" یان "کوردی عەرەب" لە لایەن بەرپرسانی سووریاوە تا ساڵی ٢٠٠٤یش وەسف کراوە.[٢٩٩] بە هەمان شێوە دەوڵەتی تورکیاش کوردی وەک "تورکی شاخاوی" وەسف کردووە. نکوڵی کردن لە جیاوازیی نەژادی و نەتەوەی کورد پشتبەستە بە دووبارە نووسینەوەی مێژوو بە شێوەیەکی رەسمی و دەرهێنانی دەنگی کورد لە مێژووی ئەو ناوچەیە و ئەو دەوڵەتانەشی لێی دەژین. دووبارە نووسینەوەی مێژوو ستراتیژێکی هاوبەشە و لە لایەن ئەو کەسانەوە بەکار دەهێنرێت، کە دەسەڵاتی نووسینەوەی ئەو مێژووەیان هەیە لە دژی ئەو کەسانەی، کە ئەمان بە هەڕەشەیان دادەنێن و دەیانەوێت بێدەنگ و نادیاریان بکەن.

دوابەدوای پشێوی ناوچە کوردییەکانی سووریا لە ئازاری ٢٠٠٤دا بۆ یەکەم جار لە لایەن دەسەڵاتدارانی سووریاوە، کورد وەک بەشێکی دەوڵەتی سووریا باسی لێوەکرا.

سەرۆک بەشار ئەسەد بۆ خۆی لە بارەی نەتەوەی کوردەوە دوا و کوردی بە بەشێکی بنچینەی کۆمەڵگەی سووریا و مێژووەکەی وەسف کرد، هەروەها وتی: کورد بە تەواوی تێکەڵی دەوڵەت بووە و لەم کۆمەڵگەیەدا تواوەتەوە.[٣٠٠]

بەڵام هێشتا دەوڵەتی سووریا بە شێوەیەکی رەسمی نکوڵی لەوە دەکات کورد گروپێکی نەتەوەیی رەسەن بن لە سووریا. ئەوان ئەوە دووپات دەکەنەوە، کە کوردەکانی سووریا کۆچەری تورکیا و عێراقن. کورد وەک پێکهێنەر تەنانەت وەک گروپیش دانی پێدا نانرێت، ئەو بۆچوونەش پشت بەوە دەبەستێ، کە کورد خەڵکێکن بە وڵاتەکەدا بڵاوبوونەتەوە و بە زۆریش تێکەڵی کولتووری عەرەب بوون.[٣٠١]

---

[٢٩٨] هیلال ١٩٦٣: ٤-٥.

[٢٩٩] ئەحمەد حاجی عەلی، وەزیری راگەیاندنی سووریا، لە سایتی Serhildanaqamishlo.com لە ١٥/مارتی/ ٢٠٠٤دا بڵاوکراوەتەوە.

[٣٠٠] چاوپێکەوتن لەگەڵ کەناڵی ئاسمانی جەزیرەدا، ٢٦/٥ /٢٠٠٤:

[٣٠١] نەتەوە یەکگرتووەکان، CERD، ٢٦/١٠/١٩٩٨، پەرەگرافی ١٠.

هەرچەندە ئەو راستییەی لە سووریا و تۆماری مێژوویی دانیشتوانی کوردی باکووری سووریایە، کە لە لایەن نووسەرانی وەك Minorsky ساڵی ١٩٦٨ و Nikitine ساڵی ١٩٥٦ خراونەتەڕوو، دژی ئەو هێڵە فەرمیەن.

کورد رۆڵێکی گرنگیان لە مێژووی دەوڵەمەند و دێرینی سووریادا گێڕاوە. کەسایەتییە کوردییەکان پۆستی گرنگیان لە حوکومەتی سووریا و هێزە چەکدارەکان و بووارە پیشەییەکاندا هەبووە و بەشداربوون لە پێشکەوتنی کۆمەڵگەی سووریا و سەرچاوە مرۆییەکان. سەرقاڵی و بەشداری کورد لە گەشەسەندنی سووریا و بزووتنەوەی سەربەخۆی سووریا نکولی لێناکرێت. ئاماژەدان بە ناوی ئەو کوردانەی پێگەی گرنگیان لە دەوڵەتی سووریادا هەبووە زۆرجار هەوڵێك بووە بۆ نکولیکردن لە سەرکوتکردنی کورد. سەرەڕای ئەو نکۆڵیکردنانە و قبوولکردنی ئەم دواییەی بەشداری کورد لە دەوڵەت و کۆمەڵگەدا، مێژووەکەیان لە کتێبە مێژوویەکان و دیمەنە سروشتیەکانی سروشتی سووریاوە وەرگرتووە، ئەویش بە هۆی سیاسەتی بەعەرەبکردنەوە بووە. بە هەمان شێوەی عێراق و تورکیا مێژووی فەرمی دەوڵەت و بەرنامەی نیشتمانیی سووریا هیچ ئاماژەیەك بۆ کورد ناکات.

گۆڕانی تۆماری مێژوویی و بەعەرەبکردن سیاسەتێك بوون، کە مێژوویان بەرێوە بردووە و مێژووی کوردیان لە مێژووی سووریا دوورخستۆتەوە. ئەوە سیاسەتێکە، کە شوێنەوار و یادەوەری دیار و ئاشکرای بوون و بنەچەی کوردی لەو ناوچانە گۆڕیوە یان دوورخستۆتەوە، کە بەشێکی نەگۆڕی جیۆگرافیای کوردستان پێکدەهێنن. بەعەرەبکردنی ناوچە کوردییەکان و هەوڵدان بۆ بە زۆر تێکەڵکردن و توانەوەی خەڵکی کورد لەناو کولتوور و ژیانی عەرەبدا هەوڵێکە بۆ بنیاتنانی ئەو راستییەی، کە لەگەڵ وەسف و لێدوانە رەسمییەکاندا یەکدەگرنەوە، کە دەڵێن: کورد خەڵکێکی نارەسەنی رەوەندە.

# باسی پێنجەم
# سەرکوتکاریی ئابووری

لە کاتێکدا، کە ناوچە کوردییەکانی سووریا لە رووی ئابوورییەوە لە هەرە ناوچە گرنگەکانی وڵاتەکە دەژمێردرێ ، کەچی خۆیان لە رووی ئابوورییەوە بەشخوراو و دابڕاون .

سەرەڕای بەرهەم هێنانی گەنم، لۆکە، زەیتون و رۆنی زەیتون، توتن، میوەی هەمەجۆر، سەوزە و بەرهەمە کێڵگەییەکانی تر، ناوچەکە زۆرترین بیرە نەوت و سەرچاوە ئاوییەکانی ئەو وڵاتەی تێدایە. بۆیە ترسی لە دەستدانی ئەم ناوچەیە و کۆنترۆلکردنی لە لایەن دەوڵەتێکی دراوسێ یان دەوڵەتێکی کوردی بەهێز لە داهاتوودا، شتێکەو رژێمەکە بە گرنگییەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکات.

ئاکامی سیاسەتی بەعەرەبکردن لە لایەن دەوڵەتی سووریاوە (لە نێویدا رووداوی سەرژمێری حەسەکە و هێنانی عەرەب و نیشتەجێکردنیان لە ناوچە کوردییەکان، کە لە بەشی پێشوودا باسکرا) هەموو ئەمانە پێکەوە کاریگەری گرنگیان لەسەر پتەوی ئابووری کۆمەڵگای کوردی لە سووریادا هەیە. سەرکوتکاری ئابووری لە دژی کورد و ناوچە کوردییەکان هانی کۆچی ئابووری لەم ناوچەیەوە داوەو رێگەی لە کورد گرتووە کۆنترۆڵی ئابووریی بەسەر ئەم ناوچانەدا هەبێت.

ئابووری سووریا شێوەیەکی بەرچاوی مەرکەزی هەیەو کۆنترۆڵی کەرتی گشتی بەسەر کشتوکاڵدا زۆر بەهێزە.[٣٠٢] حکومەت دەست وەردەداتە کاروبارەکانی نرخدانان، بەخشینی قەرزی پێشینە، گەیاندنی خزمەتگوزاری و قەرزو دارایی، ئەمەش بە تایبەتی لەو ناوچانەی کە کێڵگەکانی لۆکە و دانەوێڵەی تێدایە، پارێزگای حەسەکەی زۆرینە کورد پێی بەناوبانگە.[٣٠٣] نرخی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان زۆر کەمن پێشینە و

---

[٣٠٢] بانکی جیهانی ٢٠٠١: ٣.
[٣٠٣] هەمان سەرچاوە

قەرزی کشتوکاڵی بۆ جوتیارانی کورد پێویستیان بە پشتگیری و ڕەچاوکردنی ئاسایش هەیە، سەرکوتکاری دژی کورد، لایەنەکانی قەرز و پێدانی مۆڵەت بۆ مەبەستی کشتوکاڵی یان بازرگانی دەگرێتەوە. پێشکەشکردنی داوا بۆ ئەو مەبەستانە بە پرۆسەیەکی رۆتینیدا دەڕوات و زۆرجاریش ڕەتدەکرێتەوە. دامەزراندن لە کەرتی گشتیدا بە شێوەیەکی فراوان پشت بە واسیتە دەبەستێت. لەبەرئەوەی کورد کەمایەتییەکی ناعەرەبە، هەمیشە ڕووبەڕووی کێشەی زیاتر دەبێتەوە بۆ پەیداکردنی واسیتە لە بەراوردا لەگەڵ عەرەبەکان.

پەیوەندیکردن بە حکومەتی بەعسەوە یەکێکە لە سەرچاوەکانی واسیتە، هەرچەندە بۆ کوردێك سازشکردن و قبولکردنی ئایدۆلۆژیای ناسیۆنالیستی عەرەبی بەعسی بە واتای نکولیکردنی نەژادەکەیان دێت، بە هەمان شێوەی کەرتی گشتی دامەزراندن لە کەرتی تایبەتدا و دابینکردنی کارو خزمەتگوزاری بە شێوەیەکی بەرچاو کاریگەری واسیتەی لەسەرە، بە گوێرەی ئەو چاوپێکەوتنانەی لە لایەن نووسەرەوە ئەنجامدراون، دەزگا ئەمنییەکان زۆرجار ڕێگە بە دامەزراندنی کورد لە کەرتی گشتیدا نادەن، ئەویش بە بیانوی بەشدارییان لە چالاکییە سیاسییە کوردییەکان. لەوەش زیاتر ئەو کوردانەی بەشداری لە چالاکی سیاسی نایاساییدا دەکەن، دەزگای ئاسایش دەیانخاتە لیستی ڕەشەوە، ئیدی ئەگەر بە سیاسەتەوە خەریك بن یان نا.

هەر کاتێکیش کەسێك بخرێتە لیستی ڕەشەوە، ئەوا بە هەموو شێوەیەك دامەزراندنی لە دەزگا دەوڵەتییەکان قەدەغە دەکرێت، بێگوێدانە ئەوەی خاوەنی چ بڕوانامەیەکە و لێهاتوویی چەندە. وەك نموونەیەك بۆ ئەمە، مامۆستایەکی کوردی خاوەن ئەزمون و لێهاتوو لە ناوچەی کورداخ بە تۆمەتی بەشداریکردن لەگەڵ حیزبێکی سیاسی کوردیدا، تاوانبار کراو بە فەرمانی دەزگاکانی ئاسایشی ناوخۆ لەسەر کاری مامۆستاییەکەی لابرا. کاتێك داوای پێشکەشکرد بۆ ئەوەی لە کەرتی ئاو دابمەزرێت، داوای پشتگیری ئەستۆپاکیان لە لای دەزگای ئاسایشەوە لێکرد، ئەوەی پێنەبەخشرا، پاشان داواکەی ڕەتکرایەوە، ئیدی ئەو داوایە و هەر داوایەکی تری بۆ مەبەستی دامەزراندن ڕەتکرانەوە، هەر بۆیە ئەو پیاوە بۆ پشتگیریکردنی خۆی و خێزانەکەی ڕووی کردە ئەوەی شتومەکی جۆراوجۆر لەسەر شەقامێکی نایاسایی لە

حەڵەب بفرۆشێت.[٣٠٤] دواتر دەرکەوت کە ئەو مامۆستایە هیچ لایەنگیر و پەیوەندی بە چالاکی سیاسی کوردی لە سووریادا نەبووە و هەموو ئەو شتانەی بەرامبەری کراوە بە شێوەیەکی سەرەکی بەرهەمی رق بوون. بە هەڵە پیشاندانی ئەندامبوون لە حیزبێکدا کارێکی مەحاڵە بەوەی کە حیزبە سیاسییە کوردییەکان هەر لە بنچینەدا بە نایاسایی دەبینرێن.

ئەو نموونەیە ئەوە دەردەخات کە تاوانبارکردنی، کە تۆمەتی ئەندامێتی لە حیزبێکی کوردیدا یان بەشداریکردن لە چالاکی سیاسیدا کاریگەری نێگەتیڤی لەسەر هەلە ئابوورییەکانە و ئەو شێوازەش کە ئەندامبوون لە حیزبی سیاسیدا وەك ئامرازێك لە دژی کورد دەبێت.

کورد وەك (مەکتومین) و (ئەجنەبی)ی دەوڵەت لەبەرئەو حاڵەتەی تێیدایە رێگەی پێنادرێت لە دامەزراوە حکومییەکاندا کاربکات. دەسەڵاتی دەوڵەت لە سووریا لە زۆربەی ناوچەکاندا پرۆسەی دامەزراندنی لە پەلوپۆ خستووە. کەرتی دەوڵەت بەلای زۆرەوە گەورەترین خاوەنکارە لە سووریادا، لە چەند ساڵی رابردوودا وردە وردە کەرتی تایبەت دەستی بە فراوانبوون کردووە (مەکتومین) و(ئەجانب)ی کورد بە شێوەیەکی سەرەکی بە کاری پڕ مەترسی و موچەی کەمەوە خەریکن، مناڵانیش بەو پێیەی لە خوێندنگە دەوڵەتییەکاندا هەلی خوێندنی یەکسانیان بۆ نەڕەخساوە، بە شێوەیەکی فراوان لەم جۆرە ناوچانەدا بۆ کارکردن دەنێردرێن، زۆرجار کرێی رۆژانەیان ٥ لیرەی سورییە کە دەکاتە نزیکەی (١٠ سەنتی یۆرۆ) ئەویش لە بری کارێکی ناخۆش و سەخت دۆزینەوەی کاری کەناسی و شەقام و دوکان پاکردنەوە بۆ کوردی (مەکتومین) و(ئەجانب) لە شارەکاندا ئاسان و بەربڵاوە. سەرەڕای ئەو داهاتە کەمەی خاوەن دوکان و دەستگێڕەکانی ئەو ناوچانە پەیدای دەکەن، زۆرجار داوایان لێدەکرێت بەخشیش بدەن بە کارمەندانی ئاسایشی ناوخۆی ئەو ناوچەیە بۆ ئەوەی رێگەیان پێبدەن لەوێ کاربکەن.[٣٠٥]

---

[٣٠٤] چاوپێکەوتن لەگەڵ هەندێ کورد لە سووریا، ٢٠٠٢ و لە ئەورووپا ٢٠٠٢، ٢٠٠٣ ( ناوەکان لەلایەن نووسەرەوە پارێزراون.)

[٣٠٥] زانیاریەکە لە لایەن کۆمەڵەی کوردەکانی رۆژئاواوە لە لەندەن دراوە، هەروەها بڕوانە ماکدوواڵ ١٩٩٨: ٣١.

بۆ کرپینی زەوی لە ناوچە کوردییەکاندا، پشتگیری ئاسایش پێویستە، دەزگاکانی ئاسایش دەخوازن زیاتر عەرەبەکان ئەو زەوییانە بکرنەوە، بەمەش کورد وردە وردە لە چالاکیە ئابووری و نەریتییەکانی خۆیان دەردەکرێن. هەروەك لە سالانی نەوەدەکانی سەدەی رابردوودا هەولی بە ئەنقەست هەبووە بۆ خاپورکردنی کشتوکال و دانەویلەی کورد. لە یەکێك لەو حالەتانەدا کە سالی ١٩٩٢ روویداوە، هەزاران درەختی زەیتون لە ناوچەی کورداخ لەناوچوو، کاتێك جوتیاران کە ئەو دەرمانی دژە مێرووە نوێیەی دەولەت پێیدابوون تا بە درەختەکانیاندا بیپرژێنن، کەچی دوابەدوای ئەوە چەندین درەخت توشی جۆرە کرم و ئافاتێك بوون، کە بوونە هۆی لەناوچوونی هەزاران درەختی بەهێز و پتەو. جوتیاران رێگەی ئەوەشیان پێنەدرا تا درەختی نوێ لە جێگەی درەختە فەوتاوەکان بروێننەوە. لە دەستدانی درەختی زەیتون و بەرهەمەکانی و پاشانیش ئەو بژێوییەی لەسەریان بوو بۆ پەروەردە و فێرکردن کاریگەری گرنگیان لەسەر ئابووری هەیە.[٣٠٦] هەوالی ئەوە لە ئارادایە کە مامۆستا کوردەکان بە شێوەیەکی رۆتینی لە پەیمانگاکانی پێگەیاندنی مامۆستایان دەردەکرێن. لەوەش زیاتر ئەو مامۆستا کوردانەی خاوەن بروانامە و لێهاتوون، هەمیشە لە دەرەوەی ناوچە کوردییەکان دادەمەزرێندرێن.[٣٠٧] ئەو راپۆرتانەی باس لە دەرکردنی خوێندکارە کوردەکان لە زانکۆ دەکات زۆرو زەوەندەن. لە کات و دوای راپەرینی کورد لە ئازاری ٢٠٠٤ دا، ژمارەیەکی زۆری کوردەکان لە زانکۆکانی سەرانسەری سووریادا دوورخرانەوە. تەنها لە زانکۆی دیمەشقدا کۆمسیۆنێکی لێکۆلینەوە پێکهێنراو زیاتر لە ٢٠ خوێندکاری کورد لە ١٨/ ئازاری/ ٢٠٠٤ و بە بیانوی بەشداریان لە خۆپیشاندانە ئاشتیانەکاندا، دەرکران. لەوەش زیاتر ٢٨ خوێندکاری تر بە تۆمەتی بلاوکردنەوەی بانگەواز و ئاگاداری قەدەغەکراو بۆ لێکۆلینەوە بانگکراون.[٣٠٨]

هەموو هاوولاتییەکی رەگەز نێری سووریایی پێویستە بۆ دوو سال و نیو لە سوپادا خزمەت بکات.[٣٠٩] هەژاری و کەمی هەلی کارکردن وای کردووە ژمارەیەك لاوی کورد بەردەوام بن لە خزمەتکردن لەناو ریزی هێزەکانی سوپادا.[٣١٠] بە شێوەیەکی

---

[٣٠٦] لە لایەن نووسەرەوە لە دیمەشق تێبینی کراوە.

[٣٠٧] زانیاریەکە لە لایەن کۆمەلەی کوردەکانی رۆژئاواوە لە لەندەن دراوە، هەروەها بروانە ماکدووال ١٩٩٨: ٣١.

[٣٠٨] چارپێکەوتن لەگەل کورد لە ئەورووپا ٢٠٠٣ و ٢٠٠٤( ناوەکان لەلایەن نووسەرەوە پارێزراون.)

[٣٠٩] کۆمەلەی مافی مرۆڤ لە سووریا ، نیسان ٢٠٠٤: ٩

کورد بەردەوام بن لە خزمەتکردن لەناو ریزی هێزەکانی سوپادا. [310] بە شێوەیەکی لاقرتێیی بەڵام باو و بەربڵاو لە نێو گروپە کەمایەتییەکانی ژێردەستی رژێمە زۆردارەکاندا بووەتە هۆی ئەم شێوازی دامەزراندنە دەوڵەتییە، کە هەر خۆی دڵسۆزی لە رژێمەکەوە دەردەهێنێت، بە لای زۆربەی کوردەکانەوە تەنها کوردەکانی سووریا لە کاتی جەنگ وململانێ جیاوازەکاندا لە بەرەکانی پێشەوە جێگیر دەکرێن، هەروەك رووداوەکانی سەرکوتکاری راپەڕینی (حەما) لە ساڵی ١٩٨٢ دا، جولان لە ساڵی ١٩٧٣ دا لوبنان لە ساڵی ١٩٧٨دا.

کوردەکان سکاڵای ئەوە دەکەن کە هەلێکی کەمیان لە بەردەمدایە بۆ پێشکەوتن لە ریزی هێزەکانی سوپادا، هیچ کوردێکیش لە ژێر حوکمی رژێمی بەعسدا نەگەیشتۆتە پلەی ئەفسەر. کورد لە هێزی ئاسمانی جێگیر ناکرێت و دانامەزرێت، بۆ هەموو بەشە هەستیارەکانی تریش هەمان سیاسەت پەیڕەو دەکرێت و هەرگیز رێگەشیان پێنادرێت بەشداری لە ئەکادیمیای سەربازی یان پۆلیسدا بکەن. [311] هەرچەندە بەرهەم هێنانی سەلماندنێك بۆ سەرکوتکاری ئابووری کارێکی سەختە، بەڵام کورد بەردەوامە لە گەیاندنی ئەو سەرکوتکارییانە لە شوێنی کار و پەیداکردنی کارو خزمەتگوزاریەکانی لە سووریادا. پەراوێزخستنی ئابووری، کوردی لە پێگەیەکی لاواز و نەداریدا جێهێشتووە. ئەوان لە هەموو بوار و چالاکیەکی ئابووریدا رووبەڕووی ئاستەنگ و جیاکاری دەبنەوە، ئەویش تەنها لەسەر بنەمای ناسنامەی نەتەوەییان .

ئەمە وا دەردەکەوێت کە رێ وشوێنێکی بە ئەنقەست بێت و ئامانج لێی پەراوێزخستنی کۆمەڵگە کوردییەکان بێت و هاندانی کۆچکردن بێت لە دەرەوەی ناوچە کوردییەکان بە مەبەستی رەخساندنی زەمینە بۆ تێکەڵکردن.

---

[310] خزمەتی سەربازی لە جانوەری ٢٠٠٥دا بۆ دوو ساڵ کەم کرایەوە

[311] چاوپێکەوتن لەگەڵ چەند کوردێکدا لە سووریا ٢٠٠٢. (ناوەکان لەلایەن نووسەرەوە پارێزراون.)

## بەشی شەشەم
## قەدەغەکردنی چالاکی سیاسی

بە جۆرێ لە جۆرەکان، هەموو کوردێ لە سووریا، کە پەیڕەویی کولتوور و زمانی خۆیان دەکەن، بە چالاکی سیاسییەکانەوە سەرقاڵ دەبن، ئەمەش لەبەرئەوەی بوونی هەوڵەکانی حکومەت بۆ بەعەرەبکردنی دانیشتوان و خاکی کورد لە سووریا، ناسنامەی کورد خۆی لەخۆیدا بۆتە دیاردەیەکی سیاسی. کوردێکی زۆر راستەوخۆ بەشدارن لە حیزبە سیاسییە کوردیە نافەرمییەکاندا. لە هەردوو حاڵەتەکەدا کورد لە سیاسەتی دەوڵەت و ئازادی رادەربڕین و سادەترین ماف و چالاکی سیاسی بێبەشن و بە توندی سەرکوت دەکرێن.

ئازادی رادەربڕین لە بەندی ١٩ لە (Iccpr) (پەیمانی جیهانیی مافەکانی سیڤیل و سیاسی) بەم شێوەیەی خوارەوە دابین دەکرێت:

- هەموو کەس مافی دەربڕینی راو بۆچوونی هەیە بەبێ هیچ دەستێوەردانێك.
- هەموو کەس مافی رادەربڕینی هەیە، ئەم مافە هەریەك لە گەڕان بە دوای ئازادی و پێگەیشتن و بەشداریکردنی زانیاری و هەموو جۆرە ئایدیاکانی دەگرێتەوە، ئەمە سەرەڕای سنوورەکان، ئیدی ئەگەر زارەکی یان بە شێوەی نووسراو و چاپکراوبن لە فۆڕمی هونەر یان هەر شێوازێکی تری میدیا بە ویستی خۆیان.

بەندی ٢٥ (١) لە هەمان نووسراو گەرەنتی ماف و هەل دەدات بۆ "بەشداریکردن لە ئەنجامدانی کاروبارە گشتییەکان بە شێوەیەکی راستەوخۆ یان لە رێگەی نوێنەرەکانیان، کە ئازادانە هەڵیان بژاردوون". لە دەستووری کۆماری عەرەبی سووریادا هاتووە:

"هەموو هاوولاتییەك مافی دەربڕینی بۆچوونی خۆی بە ئاشكراو بە ئازادی لە شێوەی ئاخاوتن، نووسین یان شێوازەكانی تری دەربڕیندا هەیە. هەروەك مافی بەشداریكردن لە كارو دەربڕینی رەخنەی دروستكەر بە ئامانجی دڵنیابوون لە سەلامەتی یان پێكهاتەی نیشتمان و نەتەوە و باشكردنی رژێمی سۆسیالیستی" (بەندی ٣٨) .

"هاوولاتیان مافی كۆبوونەوە و خۆپیشاندانی ئاشتیانە، یان لە چوارچێوەی بنەماكانی دەستووردا هەیە و یاسا ئەو مافە رێكدەخات" (بەندی ٣٩)

ئەم مافانە كوردەكانی سووریا ناگرێتەوە .

## چەوساندنەوەی كورد لەبەر هۆكاری بەشداریی سیاسی

لە دوای ئەوەی كە حیزبی بەعس لە ساڵی ١٩٦٣ دەسەڵاتی گرتەدەست، سووریا بە شێوەیەكی كاریگەر بووەتە دەوڵەتێكی تاكە حیزبی. بوونی حەوت حیزبی سیاسی یاسایی كە بەرەی نیشتمانیی پێشكەوتوخواز پێكدەهێنن هیچ جۆرە جیاوازییەك بۆ ئەو ناساندنە دروست ناكات. ئەمەش لەبەرئەوەی كێبڕكێی دەسەلات لە نێوانیاندا روونادات. لە دەرەوەی ئەو بەرەیە هەموو حیزبە سیاسییەكانی تر نایاسایین. هیچ یاسایەك نیە دامەزراندن و رەفتاری حیزبە سیاسییەكان لە سووریا رێكبخات.

ئەندامبوون لە حیزبێكی سیاسی یان لە دەرەوەی بەرەی نیشتمانیی پێشكەوتوخواز بە كارێكی نایاسایی دادەنرێت و پێشكەوتن لەنێو سیستمی ئابووری و كۆمەڵایەتی و سیاسی سووریادا گران دەكات، هەرچەندە رژێمی سووریا لە چەند بۆنەیەكدا باسی هەندێك یاسای نوێ بۆ رێگەپێدانی حیزبی سیاسی تر لە نێو بەرەی نیشتمانیی پێشكەوتوخواز دەكات،[٣١٢] بەلاّم ئەوانە هێشتا پێویستیان بەوەیە ماتریالیزە بكرێن و گومانیش هەیە، كە گۆڕانێك لە پێكهاتەی بنچینەیی ئەو بەرەیە، پەرلەمان و حكومەت یان خودی حیزبە سیاسییەكەدا بكات، بەڵكو بە فراوانبوونی

[٣١٢] پێرزس١٩٩٥: ١٦٥.هەواڵی عەرەبی، ٢٠٠٢/٩/٣٠

پەرلەمان لە ساڵی ١٩٩٠ دا لە ژێر کۆنترۆڵی حیزبی بەعسدا هەوڵی زیاتر بۆ هێنانە کایەی هێزی کۆمەڵایەتی نوێ و ڕێکخستنی ئەوانەی کە هەن درا.[٣١٣]

فراوانبوونی پەرلەمان لە ساڵی١٩٩٠دا ژمارەی کورسی بۆ وەزیرە سەربەخۆکان زیادکرد٠هەرلەو ساڵەدا ژمارەیەك کورد وەك سەربەخۆ بۆ پەرلەمان هەڵبژێردران. هەندێك لەوانەی هەڵبژێردران لە ئەندامانی سەرکردایەتی حیزبە سیاسییە کوردیەکانی سووریا بوون.[٣١٤] هەرچەندە کاندیدە کوردە سەربەخۆکان نەیاندەتوانی بە شێوەیەکی ڕەسمی نوێنەرایەتی بەرژەوەندییەکانی کورد بکەن و کاندیدە سەربەخۆکان بە شێوەیەکی گشتی دەبووایە پابەندی بنەما سەرەکییەکانی بەعسیزم بن، بۆ ئەوەی بتوانن بەرلەوەی ڕێگەیان پێبدرێت بەشداری هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان بکەن پشتگیری ئاسایش بە دەست بهێنن.[٣١٥]

ئایدۆلۆژیای عەرەبی حیزبی بەعس و ئەو پابەندبوونە عەرەبییەی کە لە دەستووردا هەیە نکوڵی لە پلاتفۆرمێکی سیاسی لەوەی بۆ هاوولاتیانی عەرەب تەرخانکراوە بۆ کورد دەکات، تەنها کێشەیەك کە پەرلەمانتارانی کورد دەتوانن باسی لێوە بکەن ئەو مەسەلانەیە کە پەیوەندییان بە دابەشکردنی سەرچاوەی پارێزگاکانەوە هەیە.

چالاکی سیاسی لەسەر پلاتفۆرمی کوردی لە سووریا کارێکی نایاساییە. سەرەڕای ئەوە، حاڵی حازر سیازدە حیزبی سیاسی کوردی لە سووریادا هەن[٣١٦] و لە هەوڵدان بۆ بەرەوپێشبردنی داواکارییەکانی کورد و نوێنەرایەتی ئەم چینە پەراوێزخراو و سەرکوتکراوەی کۆمەڵگەی سووری بکەن وەك حیزب و ڕێکخراوە بەرهەڵستکارە سوریەکانی تر، ئەم حیزبە سیاسییە کوردانە نەرمییان لەگەڵ دەنوێنرێت و ڕێگەی بوونیان پێدەدرێت، بەڵام بە شێوەیەك چەند هێڵێکی سووری نەنووسراو نەبەزێنن. بۆ نموونە مادام پشتگیرییان بۆ دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی بە هەر فۆرمێك بێت، یان شۆڕش لە ناوخۆی سووریا و گۆڕینی ڕژێم، یان پێکهێنانی بەرەیەکی سیاسی یەکگرتوو

---

[٣١٣] پێرزس١٩٩٥: ١٣٩.

[٣١٤] لەگەڵ فوراد ئەلیکو و عەبدولحەمید حاجی دەروێش.

[٣١٥] پێرزس١٩٩٥: ١٦٧.

[٣١٦] بڕوانە پاشکۆی دووەم.

دەرنابڕن، لەبەرئەوە نەرمییان لەگەڵ دەنوێنرێت. هەرچەندە چالاکیەکانیان سەرکوت دەکرێن و ئەندامەکانیشیان بە بەردەوامی دەستگیر دەکرێن. لەگەڵ ئەوەی حیزبە سیاسییە کوردەکان لە سووریا نایاساین، لە ٢/٦/ ٢٠٠٤ دا هەواڵگری سەربازی سووریا ئەو حیزبانەی بانگهێشت کرد بۆ کۆبوونەوەیەك کە تیایدا فەرمانیان پێدرابوو کۆتایی بە چالاکییە سیاسییەکانیان بهێنن. هەروەك پێشیان ڕاگەیەندراوە کە حیزبەکانیان نایاساین و مۆڵەتی کارکردنیان نییە و پێویستە لە کاربخرێن، بەڵام دەتوانن داوا پێشکەش بکەن بۆ ئەوەی وەك کۆمەڵەی کولتووری مۆڵەتیان پێببەخشرێت.[٣١٧]

لە ڕۆژانی دواتردا حیزبە سیاسییە کوردییەکان بە کۆی دەنگ بڕیاریاندا کە لەسەر چالاکییەکانیان بەردەوام بن، سەرەڕای ئاگادارکردنەوەکانی دەسەڵاتەکانی سووریاش.[٣١٨]

بە هۆی ئەو سنوورە ئاشکرایانەی کە لەسەر چالاکی حیزبەکان دانرابوو، سیاسەتی کوردی توشی پەرتبوون بوو. هەموو حیزبە سیاسییەکانی ئێستا جگە لە دوانیان مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ کاتی دامەزراندنی یەکەم حیزبی سیاسی کوردی لە ساڵی ١٩٥٧ لە سووریا کە ئەویش حیزبی دیموکراتی کوردستانی سوورییایە.

لە ساڵی ١٩٦٥ دا ئەم حیزبە بوو بە دوو بەشەوە، یەکێکیان بووە بەرەیەکی چەپی سیاسی و ناوی حیزبی دیموکراتی کوردی لە سووریا (چەپ) ی لە خۆی نا، ئەویتریشیان چووە ڕیزی ڕاستەوە و بە حیزبی دیموکراتی کوردی لە سووریا (ڕاست) ناسرا.[٣١٩] ئەو دوو حیزبە لە لایەن عوسمان سەبری و حەمید حاجی دەروێش بە جیا سەرکردایەتی دەکرێت، دواتر هەر ئەو دوو حیزبە بوون بە یازدە بەشەوە. حیزبی یەکێتی دیموکرات و حیزبی ویفاقی دیموکراتی کوردی سووری بەوە دەناسرێن کە هاوسۆزن بۆ کۆنگرەی گەلی کوردستان، پێشتر حیزبی کرێکارانی کوردستان (پەکەکە)

---

[٣١٧] لە ٢٠٠٤/٦/٢ لەلایەن serhildanqamislo.com و ڕۆیتەرەوە ڕاپۆرت دراوە، بەیروت serhildanqamislo.com لە ٢٠٠٤/٦/٣دا بەبەرهەم هاتەوە

[٣١٨] serhildanqamislo.com لە ٢٠٠٤/٦/١٦

[٣١٩] ئەم حیزبییە لە ١٩٩٦دا ناوەکەی گۆڕا بە حیزبییە دیمۆکراتە پێشڕەڤە کوردی لە سووریا.

ی تورکیا بوو.[٣٢٠] چەندین هۆکار بوونەتە هۆی دابەشبوونی حیزبەکان، یەکێك لەوانە جیاوازی ئایدۆلۆجی و ئەندامانی سەرکردایەتییەکان. بە هەمان شێوە رێژەی ئاشکرایی چالاکییە سیاسییەکان هۆکارێکی تری کێشە و ناکۆکی نێو حیزبەکانە. لەوەش زیاتر دزەکردنی دەسەڵاتی سووری بۆ ناو حیزبەکان هۆکارێکی تری ئەو پەرتبوونەیە. هەروەك سیاسەتی کوردانی عێراق و تورکیا کاریگەرییان لەسەر سیاسەتی کوردی لە سووریا دروستکردووە .

سەرکردایەتی بەهێز و چەسپیووی وەك حیزبی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە عێراق و پەکەکەی پێشوو لە تورکیا و خەباتی چەکدارییان زۆرجار سەرنج و پشتیوانی کوردانی سووریای راکێشاوە، کە ژمارەی دانیشتوانیان کەمتر و پەرتەوازەترن، حکومەتی سووریا بە شێوەیەکی چالاك هانی ئەم پشتیوانییە دەرەکییە دەدات و سەرنجەکانیشی پێچەوانە دەکاتەوە بە رێگەپێدانی ئەم حیزبە سیاسیانە تا لە سووریا کاربکەن، یەکێك لە دەرەنجامەکانی ئەمەش ئەوەیە، کە سیاسەتی حیزبە کوردیەکانی عێراق و تورکیا و بەشەکانیان لە سیاسەتی کوردی سووریادا رەنگ دەداتەوە، هەرچەندە پەیوەندییەکی رەسمی لە نێوانیاندا نیە.

ئامانجی حیزبەکان بە شێوەیەکی گشتی وەك یەکە و بە زۆری گرنگی بە کاروباری کولتووری و کۆتایی هێنان بە سەرکوتکردنی کورد لە سووریا و مافی نەتەوەیی و مرۆیی بۆ کورد و پێویستی دەزگایەکی سەربەخۆی تەشریعی لە سووریا و لابردنی بارودۆخی نائاسایی لەو وڵاتە.

هەروەك دەنگە بیستراوەکانی تر لە سووریا، ئەمانیش داوای دیموکراتیزەبوونی پێکهاتە و سیستمی سیاسی دەکەن، نەك بەرپابوونی شۆڕش.[٣٢١]

---

[٣٢٠] چەند چاوپێکەوتنێك لەگەڵ حیزبە سیاسییە کوردییەکان وکوردانی بیّ لایەن لە ئەورووپا، مایس- حوزەیران ٢٠٠٤

[٣٢١] چاوپێکەوتنەکان لە ئەڵمانیا لەگەڵ ئەو تێبینییە نووسراوانەی لە لایەن نوێنەرانی حیزبییە هەڤگرتنە گەلی کورد لە سووریا، حیزبییە یەکێتییە دیموکراتە کوردی لە سووریا، حیزبییە یەکێتییە کوردی لە سووریا، حیزبییە دیموکراتە کوردی لە سووریا(ئەلحیزبیە) حیزبییە چەپە کوردی لە سووریا (مەوراد) حیزبییە چەپە کوردی لە سووریا (موحەممەد) و حیزبییە دیموکراتە کوردی لە سووریا(ئەلسڤوری) دیسەمبەری ٢٠٠٢، رۆژنامەی حیزب و پرۆگرامەکانی حیزبە سوورییەکان.

هەر بۆیە، چارەسەری پرسی کورد لە سووریا بە تەواوی پەیوەستە بە چاکسازی بارودۆخە سیاسییەکان لە سووریا و هەوڵ و کاری سیاسی دەستە جەمعی کوردیش بەرەو چەند ئامانجێکی دیاریکراو بۆ کورد.

سروشتی ئەو چاکسازییە لە چوارچێوەی زانیاری و چالاکی حیزبی بەعسدایە و لەبەرئەوە پێویستە هیچ هەڕەشەیەك بۆ رژێمی سووریا دروست نەکات.

وەك نەتەوەی دووەم و دانپیانەنراوی سووریا، هەندێك حیزبی کوردی بە دوای دانپیانانی نەتەوەی دەستووری بۆ کورد و نوێنەرایەتی سیاسی دەگەڕێن. هەندێکی تریان تەنیا داوای مافی کەمایەتی بۆ کورد لە سووریا دەکەن، نموونەی ئەوە (حیزبیا دیموکراتا پێشڤەروا لە سووریا)ی حەمید حاجی دەروێشە .

هیچ کامیان داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی ناکەن. لە نێو هەموو حیزبە کوردیەکاندا ئەوەی تۆزێ لەو ئامانجە نزیك دەبێتەوە (حیزبیا هەڤگرتنا گەلێ کورد لە سووریا)یە کە داوای مافی چارەی خۆنووسین لە سووریادا دەکات. هەروەك کەم وکورتیان لە داوای کوردستانێکی سەربەخۆ لە نێو کوردستاندا هەیە یان دیاریکردنی وردەکاریی مافی چارەی خۆنووسین هەمان شت دەبینرێت. جیاوازییەکی ئاشکرا لە نێوان لایەنە کولتووری و سیاسییەکان لە مامەڵەی دەوڵەتی سووریادا بۆ چالاکی کولتووری و چالاکی حیزبە سیاسییە کوردییەکان نابینرێت. دەوڵەتی سووری بۆ خۆی دوور لە یاسا، چالاکیە کولتوورییەکانی کورد بە سیاسی پێناسە دەکات و مامەڵە لەگەڵ کورد و دەربڕینی ناسنامەیان بە شێوەیەکی سیاسی دەکات. هەر ئەمەش سیاسەتی کوردی ئاڵۆزکردووە لەوەی بە تەواوی ببێتە دیاردەیەکی سیاسی و لە لایەکی تریش کولتووری کورد وەك دیاردەیەکی کولتووری ببینرێت.

هەروەك وەڵامی دەوڵەتیشی بۆ چالاکی سیاسی کورد ئاڵۆز کردووە، چونکە چالاکییە کولتوورییەکان وەك چالاکییەکی سیاسی لە لایەن دەوڵەتەوە لە قەڵەم دەدرێن و هەر ئەوەش لە لایەن حیزبە سیاسییەکانەوە پەیڕەو دەکرێت، لەبەرئەوەی ئەو کارە قەدەغەکراوە.

حیزبە سیاسییەکان وەك هەموو حیزبە نایاساییەکان بە شێوەیەکی سەرەکی لە ناوچە نهێنییەکاندا کاردەکەن کە بە گشتی و لە دەوڵەتە دیموکراتییەکاندا شوێنی چالاکی حیزبە سیاسییەکان نییە، هەر بۆیە کاری سیاسییان لەو رووداوانە سنووردارە، کە وا دەکات وەك حیزبێکی سیاسی رەفتاریان پێناسە بکەن و بگۆڕن. بەرنامەی کاری ئەم حیزبانە تا رادەیەکی زۆر لە لایەن ئەرکی کولتووری و پەروەردەییەوە دەستیان بەسەردا گیراوە، ئەوەش بە هۆی دوورکەوتنەوەیان لە شوێنە گشتیەکان و بەشداربوونیان لە کاروباری گشتیدا و ئەو نکوڵییەی بۆ دەربڕینی کولتووری کورد لە سووریا هەیە.

لە سەرەتای هەستانەوەی نەتەوەیی لە سووریا و دامەزراندنی یەکەمین حیزبی سیاسی لەساڵی ١٩٥٧ بە ناوی (حیزبیا دیموکراتیا کوردستان- سووریا)، پەروەردە و بەرەوپێش چوونی نەتەوەی کورد لە سووریا وەك ستراتیجێك بۆ رووبەڕووبوونەوەی رژێمەکە و دامەزراندنی کورد وەك چڤاتێك کە ناتوانرێت بەعەرەبکرێن یان سیاسیانە رەفتار دەکەن لە رووی ئابووری و کۆمەڵایەتیەوە چاودێری بکرێن.

حیزبە سیاسییەکان بەشدارن لە فێرکردنی زمان و مێژووی کورد، رێکخستنی فیستیڤاڵە کوردیەکان، ژن و ژنخوازی و بۆنە کولتوورییەکانی تر، رێکخستنی رووداو یانە وەرزشییەکاندا کە لە رێی هەموویانەوە رۆڵیان لە دووبارە بەرهەم هێنانی کولتووری کوردیدا هەیە. لەوەش زیاتر نوێنەرانی حیزبە سیاسییەکان بانگەشەی ئەوەش دەکەن کە حیزبەکان رۆڵی کۆمەڵایەتی گرنگیان هەیە لە دابینکردنی پشتیوانی بۆ پیر و پەکەوتەکان، نەخۆش و ئەوانەی لەسەر خەڵکی تر دەژین، هەروەك رۆڵی ناوبژیوان لە نێوان ئەو کەس و لایەنانەدا دەبینن کە ململانێیان لە نێو حیزبەکە یان چڤاتە ناوخۆییەکاندا هەیە.[٣٢٢]

هەندێك لە نوێنەری حیزبەکان دەڵێن، کە ئەندامەکانیان خەریکی وتنەوە و فێرکردنی زمانی کوردین بە شێوەیەکی نهێنی و لەو ماڵە کوردیانەی ئەو شارۆچکانەدا

[٣٢٢] چاوپێکەوتنەکان لەگەڵ نوێنەرانی حیزبیە دیمۆکراتە کوردی لە سووریا(ئەلحیزبیە)، حیزبیە یەکێتییە دیمۆکراتە کوردی لە سووریا، حیزبیە یەکێتییە کوردی لە سووریا و حیزبیە هەڤگرتنە گەلی کورد لە سووریا، ئەڵمانیا، دیسەمبەری ٢٠٠٢،

که کورده‌کان لێی ده‌ژین و له‌و گوندانه‌شدا که ئه‌ندامی به‌شکردوو هه‌یه بۆ په‌یداکردنی مامۆستای تایبه‌ت. بڵاوکردنه‌وه و دابه‌شکردنی ئه‌ده‌ب و فۆلکلۆری کوردی و به‌رهه‌می سیاسی له چالاکیه ستانداره‌کانی حیزبه کوردییه‌کانی سووریان.[٣٢٣]

به‌ڵام هێشتا به هۆی بڕیاری ژماره (٥٠) وه، سانسۆری ده‌وڵه‌ت له‌سه‌ر به‌رهه‌می چاپکراو، نایاسایی بوونی حیزبه سیاسییه کوردییه‌کان و دوورخستنه‌وه‌ی کورد له مێژووی سووریا و نووسینه حیزبیه‌کان و بڵاوکراوه کوردییه‌کان له ده‌ره‌وه‌ی سووریا به تایبه‌تی له لوبنان چاپ ده‌کرێت. هاندان و پێشخستنی پرۆگرامه‌کانی حیزب و بڵاوکردنه‌وه‌ی به‌یاننامه‌ی حیزبی و چالاکیه‌کان له‌سه‌ر کاروباره کولتوورییه‌کان و به‌ره‌و پێشچوونه‌کان له ناوچه کوردیه‌کانی سووریا قسه ده‌که‌ن، له ئاستی نێوده‌وڵه‌تیشدا ئه‌و مه‌سه‌لانه ده‌خرێنه‌ڕوو، که په‌یوه‌ندیان به بارودۆخی کورده‌وه هه‌یه.[٣٢٤] هه‌روه‌ها مێزگرد و کۆبوونه‌وه بۆ گفتوگۆی سیاسی رێکده‌خه‌ن.

چالاکی سیاسی که به شێوه‌یه‌کی راسته‌وخۆ په‌یوه‌ندی به خه‌ڵکه‌وه هه‌بێت زۆر سنووردار و ده‌گمه‌نه، ئه‌مه‌ش له ترسی بوونی ده‌زگاکانی ئاسایش و ترسی گرتن له پای ئه‌و چالاکیانه‌دا. چالاکیه سه‌ره‌کییه‌کانی ئه‌و حیزبه سیاسییانه کاری لۆبیکردن و خۆپیشاندانه، وه‌ك نووسینی نامه بۆ سه‌رۆك بۆ ده‌ربڕینی خه‌مه‌کانیان و ناڕه‌زایی پیشاندان له به‌رامبه‌ر سیاسه‌تی گرتنی تاکه‌کاندا. هتد.. هه‌تا ئازاری ٢٠٠٤ کاتێك کورد، وه‌ك وه‌ڵامێك بۆ رووداوی ئه‌و حه‌وت کورده‌ی له یاریگای قامیشلی کوژران، سه‌رشه‌قامه‌کانیان گرت خۆپیشاندانه‌کان که‌م و بچوك بوون، کاری له‌و جۆره به گشتی په‌یوه‌ندییان به هه‌ندێك بۆنه‌ی تایبه‌ته‌وه هه‌بووه، وه‌ك رۆژی سه‌ربه‌خۆیی سووریا، یان بۆنه نیشتمانییه عه‌ره‌بی و کوردیه‌کان، یان یاده‌کانی وه‌ك رووداوی (سه‌رژمێری حه‌سه‌که) کاتێك چه‌ند گروپێکی کوردی له دیمه‌شق له ده‌ره‌وه‌ی په‌رله‌مانی سووریا خۆپیشاندانیان سازکردو داوای گه‌ڕانه‌وه‌ی مافی هاووڵاتیبوونیان بۆ نزیکه‌ی

[٣٢٣] چاوپێکه‌وتنه‌کان له‌گه‌ڵ نوێنه‌رانی (ئه‌لحیزبیه)، حیزبیه دیمۆکراته کوردی له سووریا، حیزبیه یه‌کێتییه دیمۆکراته کوردی له سووریا، حیزبیه یه‌کێتییه کوردی له سووریا و حیزبیه هه‌ڤگرتنه گه‌لی کورد له سووریا، ئه‌ڵمانیا، دیسه‌مبه‌ری ٢٠٠٢،

[٣٢٤] هه‌ندێ نموونه له رۆژنامه‌ی ئه‌و حیزبانه وه‌ك: یه‌کێتی، اتحاد الشعب، صوت الاكراد، طريق الوحدة.

٢٥٠,٠٠٠ کورد کە بێدەوڵەت بوون لە سووریا دەکرد، لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی ساردو دوابەدوای جەنگی کەنداو لە دژی عێراق لە ساڵی ١٩٩٠ و جەنگی کۆسۆڤۆ لە ساڵی ١٩٩٩و بوونی ناتەبایی لە گوتاری مافەکانی مرۆڤدا، حیزبە سیاسییە کوردییەکان جۆرێك لە دڵنیاییان بەدەستهێنا و دەنگیان بیسترابوو هەتا ساڵانی نەوەدەکان، خۆپیشاندانی کوردەکان نادیارو نەزانراو بووە و بە شێوەی جۆراوجۆری سەرکوتکراوی دەوڵەت وەڵام دراونەتەوە، لە ئازاری ١٩٩٠دا، دوابەدوای هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان، کە تیایدا ٣٠ هاووڵاتی کورد وەك پەرلەمانتارانی سەربەخۆ هەڵبژێردران، کورد بەم پێشکەوتنانە هاندران و خۆپیشاندانێکیان لە دژی نکوڵیکردن لە مافی هاووڵاتیبوونی کوردانی (ئەجانیب) و (مەکتومین) ڕێکخست، بەڵام خۆپیشاندانەکە سەرکوتکرا، کاتێك خۆپیشاندەران هەوڵیاندا لیستێکی داواکاری پێشکەش بە سەرۆك بکەن.[٣٢٥]

لە ماوەی دوو ساڵی ڕابردوودا ژمارەی خۆپیشاندان و کۆبوونەوە گشتیەکان بە شێوەیەکی بەرچاو زیادیکردووە. خۆپیشاندانەکان کە بە شێوەیەکی ئاسایی لە ١٠٠-٣٠٠ کەس پێکدێن بە گرتن و بڵاوەپێکردنی بە زۆر کۆتاییان پێدێت. دەستێوەردانی هاوپەیمانان لە عێراق لە ئازاری ٢٠٠٣داو ئەو دەستکەوتانەی کوردەکانی کوردستانی عێراق بە دەستیان هێنا بە شێوەیەکی گرنگ کاریگەری لەسەر ویست و توانای کورد لە سووریا هەبووە و لە باوەڕبەخۆبوونێکی سیاسی گشتیدا لە نێوان کوردەکانی سووریادا بەشداربووە. ڕووخانی ڕژێمی بەعس لە عێراق و لە نیسانی ٢٠٠٣داو دانپیانانی کورد وەك گروپێکی نەتەوەیی لە عێراق و بوونی زمانی کوردی وەك زمانێکی ڕەسمی و مافە کولتووریەکانیان لە سەرەتای ئازاری (٢٠٠٤)ەوە دەکرێت وەك هاندانێك بۆ ڕاپەڕینەکانی کوردەکانی سووریا لە هەمان مانگدا ببینرێت لە کوردستانی سووریادا.

---

[٣٢٥] چەلیەند ١٩٩٣: ٨٧.

## خۆپیشاندان

مافی کۆبوونەوە و خۆپیشاندان لە بەندی ٢١/(ICCPR)دا بەم شێوەیەی باسکراوە: "مافی کۆبوونەوەی ئاشتیانە دانپیانراوە. هیچ کۆت و بەندێك بۆ جێبەجێکردنی ئەم مافە دانانرێت، جگە لەوانەی یاسا فەرزی دەکات و ئەوانەش کە لە کۆمەڵگە دیموکراتیەکاندا بۆ ئاسایشی نەتەوەیی، یان سەلامەتی گشتی و رێکخستنی گشتی و پاراستنی تەندروستی، یان مۆراڵی گشتی و پاراستنی ماف و ئازادی ئەوانی تردا هەیە"، بە هەمان شێوە دەستووری سووریا لە بەندی ٣٩دا دەڵێت: "هاووڵاتیان مافی کۆبوونەوە و خۆپیشاندانی ئاشتیانەیان لە چوارچێوەی بنەماکانی دەستووردا هەیە. یاسا چۆنیەتی جێبەجێکردنی ئەو مافە رێکدەخات" لەبەرئەوەی یاسای ناوخۆی سووریا لە چاو یاسای ناکاودا گرنگی کەمترە، ئەو یاسایەی کە (جێبەجێکردنی مافەکان رێکدەخات) یاسای ناکاوە. ئەم کەمییەی کە لە یاسای ناوخۆدا هەیە رێگە بە دروستکردنی کۆت و بەند لەسەر ئازادی خەڵك بۆ کۆبوونەوە دەدات. ئەو ژمارە کەمەی بە شێوەیەکی گشتی روودەکەنە خۆپیشاندان تووشی سزای توند دەبن، ئەویش لە ئەنجامدانی ئەو کارە سیاسییانەیە کە رووبەڕووی دەوڵەت یان رژێمەکە دەبنەوە. لەوەش زیاتر ئەوەی لە دەستووری سویادا هاتووە کە ئاماژە بە بنەماکانی دەستوور دەکات بە شێوەیەکی کاریگەر مەبەستی ئەوەیە، کە خۆپیشاندانە کوردییەکان ئەوانەی داوای دانپیانان بە مافی نەتەوایەتی کورد لە سووریادا دەکەن، دەتوانرێت تاوانبار بکرێن و بەشداربووانیش لەسەر ئەو بنەمایەی پێکۆڵی (تەحەدا)ی کاراکتەری عەرەبی دەکەن و هانی خەباتی خێڵەکی دەدەن و دەبنە هەڕەشە بۆ یەکێتی دەوڵەت، دەستگیر بکرێن. بۆ حیزبە سیاسییە کوردیەکان لە سووریا ئەم خۆپیشاندانانە بەشێکە لە پرۆسەی فراوانی لۆبیکردن. گەڕانەوەی مافی هاووڵاتیبوون بۆ کوردە بێدەوڵەتەکان و دانپیانان بە کورد وەك نەتەوەی دووەم لە سووریا و بە زمانی کوردی وەك زمانێکی دەوڵەتی و رێگەپێدانی لە خوێندنی قوتابخانەی ناوچە کوردیەکاندا و پێکهێنانی یانەی وەرزشی و کولتووریی و کۆمەڵەکان بەشێکن لەو داواکارییانەی، کە حیزبە سیاسییە کوردییەکان کاری بۆ دەکەن.[٣٢٦] بەڵام هێشتا ژمارەیەکی زۆری خۆپیشاندانە

---

[٣٢٦] چاوپێکەوتن لەگەڵ نوێنەرانی حیزبە کوردییەکان ، ئەڵمانیا، دیسەمبەری ٢٠٠٢

کوردیەکان تووشی بڵاوەپێکردنی بە زۆر و توندوتیژی و دەستگیرکردن دەبنەوە.لە ساڵی ٢٠٠٢دا و لە رۆژی جیهانی مافەکانی مرۆڤدا، نزیکەی ١٥٠ ئەندامی (حیزبی یەکێتی کورد لە سووریا) لە دەرەوەی پەرلەمان خۆپیشاندنیان سازکردو دروشم و بانگەشەی وەك (مافی هاوڵاتیبوون بۆ کورد) و( با سووریا ببێتە نیشتمانی هەموو رۆڵەکانی : عەرەب و کورد و کەمایەتییەکانی تر) و (بڕوخێ قەدەغەکردنی زمان و کولتووری کوردی) و (رێزی مافی مرۆڤ لە سووریا بگرن).[٣٢٧] دوو ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی (مەروان عوسمان) و (حەسەن ساڵح) بەیاننامەیەکیان پێشکەش بە (عەبدول قادر قادورە) ی سەرۆکی پەرلەمان کرد کە تێیدا داوای مافی یەکسانییان بۆ کورد لە سووریا کرد. هەروەك راگەیەندرا لە کاتی کۆبوونەوەکەدا قادورە نکوڵی لە بوونی نەتەوەی کورد لە سووریا کردووە و وتوویەتی کە کێشەی کورد لە سووریا بوونی نییە.[٣٢٨] دوای پێنج رۆژ و لە ١٥/دیسەمبەردا ئەو دوو سەرکردەیە بانگێشت کرانەوە بۆ دیمەشق و لە بەشە کوردییەکەیدا کۆبوونەوەیەك لەگەڵ وەزیری ناوخۆدا (عەلی حەمود) رێکخرا بۆ گفتوگۆکردن لە بارەی مەسەلەکانی کوردەوە. بە گەیشتنیان لە لایەن هێزەکانی ئاسایشەوە دەستگیرکران.[٣٢٩]

نوێنەرانی ئەو دوو حیزبە لە زینداندا مانەوە و بە توندی ئەشکەنجەدران، پاشان لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٤ داو لە لایەن دادگای باڵای ئاسایشی دەوڵەتەوە دادگایکران، ئەوەی لە دادگایکردنەکەدا روویداوە لە لایەن رێکخراوی لێبووردنی نێودەوڵەتییەوە مەحکوم کراوە بەوەی ناحەقی زۆری تیاکراوە. یەکەم جار بە تۆمەتی ئەندامبوون لە رێکخراوی نایاسایدا و هاندانی ململانێ تایفەکان تاوانبارکران. لە ئۆکتۆبەری/ ٢٠٠٣دا ئەو تۆمەتانەی رووبەڕوویان کرانەوە هەوڵدان بووە بۆ لەتکردنی ناوچە سوورییەکان و لکاندنی بە دەوڵەتێکی بێگانەوە. لە ٢٠٠٤/٢/٢٢ دا هەردووکیان لە زیندان ئازادکران. دەستگیرکردن و ئەشکەنجەدانی (مەروان عوسمان) و

[٣٢٧] بەیانگای لێکۆڵینەوەی راگەیاندنی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ١٦/دیسەمبەر/٢٠٠٢

[٣٢٨] ئەو ئامارانەی لە دەمەتەقێی نێوان حەسەن ساڵح و مەروان عوسمان و قادر قەدورەی قسەکەری پەرلەماندا دوو سەعات پێش دەست پێکردنی خۆپیشاندانەکە لە دیمەشق نووسراوە، ١٠/دیسەمبەر/٢٠٠٢

[٣٢٩] کۆمیتەی سووری مافەکانی مرۆڤ١٧/١٢/٢٠٠٢، حیزبیە یەکێتییە کوردی لە سووریا و ئەوەی لە نێوان حەسەن ساڵح و مەروان عوسمان و قسەکەری پەرلەماندا نووسراوە، قادر قەدورە، دوو سەعات بەر لە دەستپێکردنی خۆپیشاندانەکە لە دەرەوەی پەرلەمان لە دیمەشق ، ٢٠٠٢/١٢/١٠

(حەسەن ساڵح) و دادگایکردنەکەیان بە هۆی چالاکی سیاسی ئاشتیانە لە سووریا و دەرەوەی ئەو وڵاتەش بە پێشێلکاری مافەکانی ئازادی رادەربڕین و کۆبوونەوە دادەنرێت و ئەمەش لە بەندەکانی (٣٨) و(٣٩) ی دەستووری سووریاو بەندی (١٩) و(٢١) ی (ICCPR) دا دڵنیاکراونەتەوە. لە یادی داهاتووی رۆژی جیهانی مافەکانی مرۆڤدا حیزبە کوردیەکان رێکخراوەکانی مافی مرۆڤ لە سووریا بەشدارییان لە خۆپیشاندانێکدا کرد کە داوای رێزیان بۆ ستانداردی مافی مرۆڤی جیهانی بۆ هاووڵاتیانی سووریا دەکرد. لە بەردەم پەرلەمانی سووریادا ٣٠٠-١٢٠٠ کەس لە سەعات ١١ی بەیانیدا کۆبوونەوە.[٣٣٠]

لە هەڵگێڕانەوەی ئەو سیاسەتەی کە لە خۆپیشاندانەکانی ئەم دواییەدا پەیڕەودەکران (ناجی ئەلعوتاری) سەرۆك وەزیران ئەوەی رەتکردەوە کە ئەو سکاڵایەی لە لایەن چالاکیەکانی بواری دیموکراسی کورد و عەرەبەکان و داکۆکیکاران و نوێنەرانی حیزبە سیاسییەکان ئیمزا کرابوو پەسەند بکات.

نموونەی زیاتری پەلامار و توندوتیژی پۆلیس بەرامبەر بە کورد ئەو خۆپیشاندانانەن کە لە رۆژی جیهانی منداڵاندا ساڵی ٢٠٠٣ لە دیمەشق ئەنجامدران. لە ٢٥/حوزەیرانی/ ٢٠٠٣دا نزیکەی ٣٨٠ منداڵ رێپێوانێکی هێمنانەیان بۆ بەردەم بارەگای یونیسێف لە دیمەشق رێکخست. بەر لە گەیشتنیان بۆ جێگەی مەبەست بە گوڵ و بەیداخەوە داوای ئازادی دەربڕینی کولتوور و زمان و مافی مرۆڤیان دەکرد، بەڵام رێپێوانەکە ٤٠٠ کەس لە هێزەکانی ئاسایش چاودێرییان دەکرد و دواتریش بە زۆر بڵاوەیان بە رێپێوانەکە کرد. حەوت لاو دەستگیرکران و ئەوەش راگەیەندرا کە منداڵەکان لە لایەن پۆلیسەوە لێیان دراوە و هەندێکیشیان برینداربوون. ئەو حەوت کەسەی لە رێپێوانەکەدا دەستگیرکران لە رۆژی ٢٧/حوزەیران/ ٢٠٠٤ لە (SSSC) دادگایکران، بە تۆمەتی ئەندامبوون لە رێکخراوێکی نهێنیدا و هەوڵدان بۆ دابەشکردنی خاکی سووریا و لکاندنی بە دەوڵەتێکی بێگانەوە تاوانبارکران. دادگایکردنەکە لە لایەن رێکخراوی لێبووردنی نێودەوڵەتییەوە بە نادادپەروەر مەحکوم کرا، سیان لە تۆمەتبارەکان بە پێنج ساڵ زیندانی حوکم دران، کە دوایی کەمکرایەوە

---

[٣٣٠] ژمارەکان تا ئاستێکی زۆر جیاوازیان هەیە.

بۆ دوو ساڵ، چوارەکەی تر بۆ پێنج ساڵ حوکم دران، کە دواتر کەمکرایەوە بۆ یەک ساڵ. ئەمانەی دواییان لە دوای تەواوکردنی کاتەکەیان ئازادکران.[٣٣١] گرتن و ئەشکەنجەدان و لێپرسینەوە ئەو کەسانە پێشێلکاری مافەکانی ئازادی رادەربڕین و کۆبوونەوەیە. بە هەمان شێوە، ئەو هێزەی دەسەڵاتی دەوڵەت لە ئازاری/ ٢٠٠٤دا بۆ روبەڕووبوونەوەی کوردەکان بەکاریهێنا بە زیاد لە پێویست و نامەنتیق مەحکوم کرا.[٣٣٢] هەزاران کورد وەك نارەزاییەك لە بەرامبەر کوشتنی ئەو حەوت هاوولاتییە کوردەی رۆژی ١٢/ئازار لە یاریگای قامیشلی رویدا و کۆتایهێنان بە زەبر و زەنگی حوکمی چل ساڵەی رژێمی بەعس لە سووریا، شەقامەکانیان گرت و خۆپیشاندانیان ئەنجامدا. خۆپیشاندانەکان بە بەکارهێنانی هێزی سەربازی وەڵام درانەوە. سوپا بەرەو قوڵایی شارۆچکە کوردیەکانی شوێنی راپەڕینەکان رۆیشتن. دوای هەفتەیەك بێدەنگی باڵی بەسەر ناوچە کوردیەکاندا کێشا. لە ١٨/ئازاری/٢٠٠٤دا سەرچاوەیەکی رەسمی سووری رایگەیاند کە ژمارەی کوژراوان (٢٥) کەس بووە.[٣٣٣] لە هەمان کۆنگرەی رۆژنامەنووسیدا (عەلی حەمود)ی وەزیری ناوخۆی سووریا رایگەیاند کە دەسەڵات ناچارکراوە هێز بەکاربهێنێت و ژمارەیەکی دیاریکراو (ئاژاوەگێڕ) دەستگیر بکات.[٣٣٤] بەڵام سەرچاوە کوردیەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ژمارەی کوژراوان زیاترە و دەگاتە چل کەس و سەدان بریندار و هەزاران بەندکراو هەبووە.[٣٣٥] عەبدول حەلیم خەدام جێگری سەرۆکی سووریا راگەیاند و لۆمەی ئەوەی کرد کە ئەم کێشانە لە لایەن حیزبە بێگانەکانەوە قۆرغ کراون، بەوەی ژمارەیەکی نەزانراوی حیزبی بێگانە لەم رووداوانە وەردەگرن.[٣٣٦] سەرکوتکردنی خۆپیشاندانەکان بە شێوەیەکی ئاسایی شەرعیەتی پێدەدرێت، ئەویش بە بیانووی پاراستنی یەکێتی خاکی سووریا.[٣٣٧] بەشار ئەسەد نکوڵی لەوە دەکات کە خۆپیشاندانەکان لە لایەن هێزی دەرەکییەوە هاندرابن، بەوەی

---

[٣٣١] رێکخراوی لێبوردەیی نێودەوڵەتی ، ٢٩/٦/٢٠٠٤

[٣٣٢] کۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە سووریا نیسانی ٢٠٠٤

[٣٣٣] یاسین ٢٠٠٤

[٣٣٤] Serhildanaqamislo.com, ١٦/٦/٢٠٠٤

[٣٣٥] خەددام لە مەبەردیییەوە وەرگیراوە ٢٠٠٤

[٣٣٦] لە لایەن سایتی (دۆزە مە)وە لە ١٩/٣/٢٠٠٤ راپۆرتی لەبارەوە دراوە.

[٣٣٧] چاوپێکەوتنێك لەلایەن کەناڵی تەلەفزیۆنی جەزیرە لە ١/٥/٢٠٠٤

ئەو گرژییەی لەو هەفتەیەدا روویداوە ئاژاوەیەکی وەرزشی بووە و لە فۆڕمی نەتەوەیدا روویداوە.[٣٣٨]

باسکردنی رووداوەکانی ئەو هەفتەیە هەر چۆنێك بێت، پۆلیس و هێزەکانی ئاسایشی سوپا هێزی لە رادەبەدەریان بەکارهێناوە بۆ کپکردنی خۆپیشاندانەکان بە بەکارهێنانی چەك و گوللە بە شێوەیەکی راستەوخۆ. سەدان کورد بە گوللە بریندارکران و بەشێکی زۆریان بە ناتەواوی چارەسەرکران، ئەویش لەبەرئەوەی بەبێ چارەسەر دەستگیرکراون، یان بە هۆی دواکەوتنی هێزەکانی ئاسایش و سوربوونیان لەسەر ئەوەی کە ئەوانە دەبێت لە نەخۆشخانەی دەوڵەت چارەسەر بکرێن، یان بەهۆی کەمی خزمەتگوزاری بۆ ئەو ژمارە بریندارانە لەم جۆرە نەخۆشخانانەدا.[٣٣٩] لە راپەڕینەکەی ئازاری/٢٠٠٤، کوردانی سووریا شێوازی تر بۆ سەرنج راکێشانی کێشەکانیان پەیڕەو دەکەن و هەوڵی ئەوە دەدەن، کە جۆرێك تەنازول لە رژێمەکەوە وەربگرن. وەك کارێکی دەگمەنی سیاسیش لە سووریا، بەندییە کوردەکانی زیندانی (کادرە) لە دیمەشق، مانگرتنێکیان دەستپێکرد و وازیان لە خواردن و خواردنەوە هێنا. مانگرتنەکە وەك نارەزاییەك لە بەرامبەر بارودۆخی خراپی زیندانییەکان و مامەڵەی نامرۆڤانە لەگەڵیان لە لایەك، لە لایەکی تریش ئەو رق و ستەمکارییەی لە دژی خۆیان و خێزانەکانیان ئەنجام دەدرێن، تەنها لەبەر ناسنامەی کوردیان.[٣٤٠] خۆپیشاندانەکان کۆتاییان پێهات، نەك لە رێگەی گفتوگۆ لەگەڵ زیندانییەکاندا کە لە بنەڕەتدا ئەوە راگەیەندرابوو،[٣٤١] بەڵکو بەهۆی ئەشکەنجەدانی زیندانییەکانەوە بوو.[٣٤٢] مەروان عوسمان، نووسەری کورد و ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی (حیزبی یەکێتی) لە سەرەتای ساڵی (٢٠٠٥)دا سەرۆکایەتی مانگرتنێکی کرد، ئامانجی مانگرتنەکە نارەزایی بوو لە بەرامبەر زوڵمی سەرکوتکردنی کورد لە سووریا و هەوڵدان بوو بۆ گەیاندنی کێشەی سووریا – کورد بە ئەورووپا.[٣٤٣]

---

[٣٣٨] کۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە سووریا نیسانی ٢٠٠٤، چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو کوردانەی لە بریتانیا نیشتەجێن، ٢١-٢٠٠٤/٦/٣٠(ناوەکانیان لەلایەن نووسەرەوە پارێزراوە.)

[٣٣٩] مانگرتنێك لەم دواییەدا ٤-٢٠٠٥/١٢/١١، تەلەفزیۆنی knn، ١٣و٢٠٠٤/١٢/١٤

[٣٤٠] تەلەفزیۆنی knn، ٢٠٠٤/١٢/١٣

[٣٤١] تەلەفزیۆنی knn، ٢٠٠٤/١٢/١٦

[٣٤٢] بڕوانە kurdishMedia.com، ٢٠٠٤/١/٢٤

[٣٤٣] بڕوانە kurdishmedia.com، ٢٠٠٤/١/٢٤

## زیندانییان و بیروباوەڕی سیاسی

هەرچەندە لە ئێستادا خەڵك بەو ڕێژەیەی ساڵانی هەشتاكان تووشی ((دیارنەمان)) نابێتەوە و گیراوە سیاسییەكان بە بەراورد بە ئەو كاتە روو لە كەمبوونە، بەڵام هێشتا زیندانییەكان بە ئاگاوە هەست بە ژێرزەمینی زیندانییەكانی سووریا دەكەن، هەروەك لە دوای گرژیەكەی ئازاری/٢٠٠٤ چەندین هاوولاتی كورد بێ سەرو شوێن بوون و هیچ زانیارییان لە بارەوە نەدراوە. زیاتر لە ١٠٠٠ زیندانی سیاسی كە بەبێ دادگایكردن زیندانی كراون، هەروەك ژمارەیان لە ماوەی چوار ساڵی یەكەمی فەرمانڕەوایی بەشار ئەسەددا زیادی كردووە.[٣٤٤]

سەركوتكردنی (بەهاری دیمەشق) و دەستگیركردنی چالاكییەكانی بواری كۆمەڵی مەدەنی مافی مرۆڤ لە ساڵی ٢٠٠١دا، دەستگیركردنی ئەو كەسانەی پەیوەندییان بە (ئیخوای موسلمینی سووری) قەدەغەكراوەوە هەیە، گرتنی كورد لە دوای گرژیەكانی ئازاری/ ٢٠٠٤و هاوكات لەگەڵ جەنگی عێراق، هەموو ئەمانە ژمارەی گیراوانی بە بیانووی بۆچوونی سیاسییەوە زیاتر كردووە.

زیاتر لە ٢٠٠٠ هاوولاتی كورد لە ماوەی چەند هەفتەیەكی دوای ڕووداوەكانی ئازاری/ ٢٠٠٤ دەستگیركراون، ڕاپۆرتەكان ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە زیندانییە كوردەكان بە بەردەوامی ڕووبەڕووی ئەشكەنجە دەبنەوە چەندین كەس دەستگیر دەكرێن، ئەشكەنجە دەدرێن و دواترش ئازاد دەكرێن بەبێ بوونی هیچ تۆمەتێك، ئەمەش بە بیانووی ئەوەی دەستگیركردنەكان ڕێ وشوێنێكن و بە نیازی سزادان ئەنجام دراون. كوردەكان بە تۆمەتی پەیوەندییان بە ڕاپەڕینەكانەوە دەستگیر

---

[٣٤٤] چاوپێكەوتنێك لەگەڵ نوێنەری ماڵپەڕی (اخبار الشرق)، لەندەن، ٢٠٠٤/١/٢٧. ژمارەكە لەلایەن كۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە سووریا تەخمین كراوە بە ١٠٠٠ لە هاوینی ٢٠٠٢( چاوپێكەوتن لەگەڵ ژمارەیەك لە خەڵكانی كۆمەڵگەی مەدەنی لە سووریا، دیمەشق، ئۆگۆستی ٢٠٠٢) . بەرزبوونەوەی ژمارەكە ئەوە روون دەكاتەوە كە هەستێكی ڕەسمی بەرامبەر كەسانی ئیسلام لە سووریا هەیە، كە سەر بە ئیخوانی موسلیمینی قەدەغەكراوی سووریان.

دەکرێت، کە لە شوباتی/٢٠٠٥دا دەستیان پێکرد و لە لایەن (sssc) وە حوکم دەدرێن.[٣٤٥]

تۆمەتەکان جیاوازن، وەك پەیوەندی بەو گروپانەوە، کە کار بۆ لاوازکردنی هۆشیاری نەتەوەیی لە سووریا دەکەن، یان وروژاندنی ململانێی تایفی، یان نانەوەی ئاژاوە بە مەبەستی هاندانی جەنگی ناوخۆ و تایفی، هەروەها ئەندامبوون لە کۆمەڵەی نهێنی و هەوڵدان بۆ دابەشکردنی ناوچەکانی سووریا و لکاندنیان بە دەوڵەتێکی بێگانەوە.[٣٤٦]

سزای مردن گەورەترین حوکمە کە بەسەر ئەو تاوانانەدا بسەپێت.[٣٤٧] زۆربەی کوردەکان هەرگیز رووبەڕووی دادگایکردن نابنەوە و لە زیندان و گرتووخانەکانی سووریادا بەبێ تۆمەت زیندانی دەکرێن. ژمارەیەکی بەرچاوی ئەو کوردانەی بە تۆمەتی پەیوەندی بە راپەڕینەکانی ئازاری/٢٠٠٤ دەستگیرکرابوون، راستەوخۆ لە ژێر ئەشکەنجە یان بەهۆی برینی ئەشکەنجەکانیانەوە گیانیان لە دەستداوە.[٣٤٨]

ئەشکەنجەدان لە زیندانەکانی سووریادا بووەتە کارێکی رۆتین، تەکنیکەکانی ئەشکەنجەدانیش بریتیین لە (کورسی ئەڵمانی)، هەڵواسینی سەر بەرەو خوار بۆ ماوەی چەند رۆژێك، کارەبا لێدان، بەکارهێنانی کەیبلی ئاسن بۆ لێدان، ئازار و ئەشکەنجەدانی ئەندامەکانی زاوزێ و چەندینی تر، لەوەش زیاتر، چەندین هاووڵاتی کورد لە کات و لە دوای راپەڕینەکانەوە دەستگیرکراون و هیچ روونکردنەوەیەك لە بارەیانەوە نەزانراوە. دوابەدوای راپەڕینەکانی مانگی ئازاریش، چەند راپۆرتێك ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە (٢٨) منداڵی کورد لە نێوان تەمەنی ١١-١٧ ساڵان دەستگیرکراون کە بەشێکیان لە شوێنی رووداوەکە نەبوون، هەندێکیشیان لە ماوەی زیندانیکردنیاندا رووبەڕووی ئەشکەنجە و ئازاردان بوونەتەوە.[٣٤٩]

---

[٣٤٥] لە ٢٠٠٥/٢/١٥دا پانزە کورد لەلایەن (سسس) زیندانی کران، بە گشتی لە ئەنجامی کارێکی نایاساییدا، چوار پیاویان سێ ساڵ بەندکران، لە کاتێکدا پانزەکەی تر دوو ساڵ زیندان کران، رێکخراوی لێبوردەیی نێودەوڵەتی ، ٢٠٠٥/٢/١٨

[٣٤٦] رێکخراوی لێبوردەیی نێودەوڵەتی ، ٢٠٠٥/١/١٩

[٣٤٧] هەمان سەرچاوە.

[٣٤٨] بۆ نموونە بڕوانە تەلەفزیۆنی knn، ٣و٢٠٠٤/٨/٦

[٣٤٩] لە لایەن رێکخراوی لێبوردەیی نێودەوڵەتیەوە لە ٢٠٠٤/٦/٢٩ راپۆرت دراوە، کۆمەڵەی مافی مرۆڤ سووریا نیسان ٢٠٠٤

کورد بە شێوەیەکی ڕۆتینی لە سووریا بە هۆی چالاکی سیاسی و کولتوورییەوە دەستگیر دەکرێن. چالاکییەکانی نووسین و بلاوکردنەوە، تەنانەت خوێندنەوەی ئەو زانیاریانەی لە بارەی کولتوور و مێژووی کوردەوەیە بە کارێکی سیاسی دادەنرێت و گرتنی لێدەکەوێتەوە.[٣٥٠] ئەو کوردانەش بەم تۆمەتانە دەستگیر دەکرێن، ڕووبەڕووی ئەشکەنجە و ئازاردان دەبنەوە. ئەندامی خێزانی ئەو کەسانەی چالاکی سیاسییان هەیە لە سووریا و لە مەنفاش تووشی تۆقاندن و دەستگیرکردن دەبنەوە. تاکتیکی لەم جۆرە مەترسی تێوەگلانی لە چالاکی سیاسیدا زیادیکردووە بەهۆی تۆقاندن و کاری لەم جۆرەوە.

کاتێك مەڕوان عوسمان سەردانی ئەوروپای کرد لە ئایاری/٢٠٠٤دا ڕایگەیاند کە موخابەرات چەند جارێك سەردانی خێزانەکەیانی کردووە و پرسیاریان لە بارەی چالاکییەکانی ئەو لە ئەوروپا کردووە. براکەی سێ جار سەردانی کراوە و هاوسەرەکەشی لە یەك کاتدا بۆ ماوەی سێ سەعات لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کراوە، هەروەك سێ جاری تر لە لایەن پیاوانی ئاسایش و سەربازی و سیاسییەوە سەردانی کراوە.[٣٥١]

لە ٢٠٠٣/٨/٨دا خەلیل مستەفا بەهۆی بیروباوەڕی سیاسییەوە دەستگیرکراو لە ماوەی زیندانیکردنیدا ڕووبەڕووی ئەشکەنجەدانی توند بۆتەوە،[٣٥٢] هەر لە زیندانی ڕۆژی ١٠ی هەمان مانگ گیانی لەدەستدا. ڕاپۆرتە پزیشکییەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە مردنەکەی بەهۆی برینی سەختەوە بووە لە جەستەیدا.[٣٥٣] پاشان ئەوە ڕاگەیەندرا کە جەستەکەی دلڕەقانە بریندار و شێوێندراوە، چاوی چەپی دەرهێندراوە، لوت و دەست و قاچەکانی لە چەند جێگەیەکدا شکێندراون و ئەندامی زاوزێشی بڕاوە.

---

[٢٥٠] ئیبراهیم نەعسان کوڕی عەبدو، لە ٢٠٠٢/١/٨ دەستگیر کرا لەبەر ئەوەی حەزی لە بابەتی کولتووری کوردی هەیەبووە. لە ٢٠٠٢/٥/٧ موسەیلەم شێخ حەسەن سەرۆکی ژمارەیەك لە حیزبییە یەکێتییە دیمۆکراتە کوردی لە سووریا، لە عەین ئەلعەرەب بدەستگیر کرا، بە تۆمەتی حەزکرد بە بلاوکردنەوەی وتاری سیاسی کوردی.

[٣٥١] چاوپێکەوتنێ لە فەرەنسا، ٢٠٠٤/٥/٢٩

[٣٥٢] ڕێکخراوی لێبوردەیی نێودەوڵەتی ، ٢٠٠٣/٩/٤

[٣٥٣] HRAS تشرینی دووەم ٢٠٠٣:٩

[354] تەرمەکەی تەسلیم بە خێزانەکەی کرایەوە بەڵام لە لایەن موخابەراتەوە ڕێگەیان پێنەدرا لە گوندەکەی خۆیان بینێژن، خێزانەکەی زۆریان لێکرا کە تەرمەکە لە حەڵەب بنێژن کە بووبووە شتێکی عادەتی.[355]

لە ۲۰۰۳/۱۰/۱۸دا حەسەن مستەفای برای خەلیل مستەفا دەستگیرکرا دوای ئەوەی ئاسایشی سیاسی پرسیاریان لە خزمەکانیان کرد لە بارەی براکەیەوە کاتێك لە ئەلجزیرە و کەناڵەکانی تری ڕاگەیاندن زانیاری لەبارەی مردن و دەستگیرکردنەکەی بڵاوکرایەوە. لە جێگەیەکی نەزانراو دوور لە بینین و چاوپێکەوتن زیندانی کرابوو.[356] باوەڕ وابوو کە لە مەترسی ئەشکەنجە و مامەڵەی خراپدا لە ساڵی ۲۰۰۳ و ۲۰۰٤دا کاتێك زیندانیە سیاسییەکان و کورد و ئەوانی تر دادگای دەکران، چەند خۆپیشاندانێك لە دەرەوەی هۆڵی دادگاکان ئەنجامدران، ژمارەی خۆپیشاندەران لە نێوان (۱۰۰-۳۵۰) کەسدا دەبوون لە دەرەوەی دادگا بوون و لە نێو دادگاشدا وەفدی پارێزەران و نوێنەرانی کونسوڵی ئەورووپا سەرنجی دانیشتنەکانی دادگایان دەدا باوەڕ وابوو کە ئازادکردنی مەروان عوسمان و حەسەن ساڵح لە ۲۰۰٤/۲/۲۲ دا بە هەوڵی ڕێکخراوە ناحکومیە نێودەوڵەتییەکان لە نێویاندا ڕێکخراوی لێبووردنی نێودەوڵەتی و (Pcn)ی کوردی و نوێنەری حکومەتە ئەورووپییەکان بووە.

لە کاتێکدا گوشاری نێودەوڵەتی بۆ سەر سووریا ڕێژەیەك شەفافیەتی لە دانیشتنە دادگاییەکانی چەند کەسێکی گرنگی وەك ئەمانە دروستکردووە، دەستگیرکردنی درێژخایەنی کوردەکان بەبێ گوشار و پشتیوانی ناوخۆو نێودەوڵەتی بە ڕانەگەیەنراوی ڕوودەدەن، شتێکی بڵاوە کە کەسێك بە تۆمەتی بوونی نووسینێکی کوردی کە سروشتێکی سیاسی هەبێت دەستگیربکرێت و بۆ ماوەی پێنج ساڵ لە زینداندا بمێنێتەوە. تەنانەت کاتێك چاودێرانی نێودەوڵەتی لە دادگا ئامادەبوون، هیچ گەرەنتییەك نییە بۆ ئەوەی کە دانیشتنەکان بە شێوەیەکی دادپەروەرانە بەڕێوە بچن.

لە ۲۰۰٤/٥/۲۳دا بەشار ئەسەد دادگایکردنی حەوت کوردی کارای دواخست دوای ئەوەی کە چەند دیبلۆماتێك لە یەکێتی ئەورووپاوە بۆ ئامادەبوون و سەرنجدانی

---

[354] SHRC ۲۰۰۳/۸/۲۱

[355] ڕاپۆرتێك لەلایەن kurdishmedia.com، ۲۰۰۳/۸/۳۰

[356] ڕێکخراوی لێبوردەیی نێودەوڵەتی، ۲۰۰۳/۱۱/۱۱

دادگایکردنەکە گەیشتبوونە دادگا.[357] دیبلۆماتەکان لە لایەن پۆلیسەوە دوورخرانەوە، چەند رۆژێك دوای ئەوەش کەسێکی کارای سووری لە بواری مافی مرۆڤدا دەستی بەسەرداگیرا پێش ئەوەی بە مەبەستی بەشداربوون لە دانیشتنێکی پەرلەمانیدا کە لە دانیمارك رێکخرابوو، سەفەربکات.[358]

ئەو رووداوانەی کە لە سەرەوە باسکران ئاماژە بە دلڕەقی رژێمەکە دەکەن لە بەرامبەر داوای کوردەکاندا، ئەگەر بە شێوەیەکی نەرم و ئاشتیخوازانەش دەربېڕدرێن، سێ بەشی پێشووتری ئەم کتێبە ئەو رێگایانەیان پێشاندا کە کورد لە رووی کولتووری و ئابووری و سیاسییەوە سەرکوت دەکرێن دورخستنەوەی کورد لە هەر جۆرە فۆرمێکی نوێنەرایەتی لە سووریا کە هیچ سازشێکی نەژادی و شووناسی نەتەوەییانی تێدا نەبێت نکوڵی لە بوونی ئەم نەتەوەیە لە سووریاو هەموو کەناڵێکی شەرعی دەربڕینی بیر و بۆچوون و کولتووریان دەکات، کورد هەر بەردەوامە لە هەوڵەکانی بۆ پاراستن و هێشتنەوە و دووبارە بەرهەمێنانی کولتوور و شوناسیان لە سووریا ئەویش لە رێگەی ئامرازی ئاشکرای سیاسی و زیاتر کولتووری و پەروەردەیی، بەڵام هەموو ئەم چالاکییانە دواجار بوونەتە ئامانجی سەرکوتکاری دەوڵەت.

---

[357] کامبل ٢٠٠٤

[358] هەمان سەرچاوە.

# باسی حەوتەم
# پەیوەندییە هەرێمییەکان

پەیوەندییە هەرێمی‌و نێودەوڵەتییەکان ئاکامی گرنگیان بۆ کوردی سووریا و دەوڵەتەکانی تریش هەیە. ئەم کتێبە تا ئێستا تیشکی خستووەتە سەر بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی سووریاو روونکردنەوەی مامەڵەی حکومەت لەگەڵ دانیشتووانە کوردەکەیدا.

کێبڕکێ ناوچەییەکان لە نێوان دەوڵەتەکان و هاریکارییان لە بارەی مەسەلەی کورد ئەوە دڵنیا دەکاتەوە، کە تا ئێستا چارەسەرێکی عادیلانە بۆ مەسەلەی کورد بە دەست نەهاتووە. سیاسەتی راستەقینەی دەوڵەت‌و سنوورە نێودەوڵەتییەکان، کوردیان لە نێوان چەند دەوڵەتێکی دیاردا جیاکردووەتەوەو ئەوەش پەیوەندی بە سیاسەتی ناوخۆو دەرەوەی هەموو ئەم دەوڵەتانەوە هەیە، واتە گروپە سیاسیە کوردییەکان هەمیشە هەوڵی قۆرخکردنی کێبڕکێ هەرێمیەکانیان بۆ خزمەتکردنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان داوە. لە ئاکامی ئەمەشدا کورد وەك ئامرازێك لە سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتانی ناوچەکە و ئەمریکاش (بە پێی بەرژەوەندییە جیۆسیاسی و ستراتیجییەکانی) بەکارهێنراوە و خراپیش بەکاردەهێنرێت.

لە ئاستی ناوچەییدا، هەماهەنگی نێوان سووریا و تورکیا و ئێران‌و عێراق بۆ کێشەی کورد وەك یەکەو ئامانجیشی ئەوەیە بزوتنەوەی کورد لە هەموو بەشەکانی کوردستان لاوازبکرێت‌و رێگا لە دامەزراندنی هەر فۆرمێکی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی، یان هەرێمێکی خاوەن ئۆتۆنۆمی بگرن.[٣٥٩] بواری هەماهەنگی ئەم وڵاتانە لە سیاسەت‌و ستراتیجیاندا بەرامبەر بە کورد بۆ چاودێرانی دەرەکی شتێکی نائاشکرایە، چونکە کۆبوونەوە بەردەوامەکانی نێوانیان بە نهێنی ئەنجام دەدرێت. بەڵام بە دڵنیاییەوە لە یەکچوون لە تاکتیکی بە کارهاتووی ئەم دەوڵەتانە لە دژی چالاکی‌و

---

[٣٥٩] لەیزەر ١٩٩٦:١٠٧

ڕێکخراوە کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و سیاسییە کوردییەکاندا هەیە. لە هەموو بەشە کوردییەکاندا، بە مەبەستی گۆڕینی دیمۆگرافی‌و سەپاندنی یاساکانی سەرکوتکردنی کورد، زمان و پەیڕەوکردنی نەریت‌و کولتووری کوردی خۆی لێقەدەغەکراوە. هەریەك لە عێراق‌و سووریاو ئێران‌و تورکیا هەوڵدەدەن جەوهەری شوناسی کوردی وەك بناغەیەکی بنچینەیی ڕێکخراوی سیاسی‌و فاکتەری سەرەکی، کە ئەمانە پێکەوە دەبەستێت، لاواز بکەن، ئەگەرنا بزوتنەوە سیاسییەکان لەیەکتر جیادەبنەوە. ڕەنگە سەیر بێت ئەگەر بزانین ئەم دەوڵەتانە لە هەمان کاتدا پشتیوانی بزوتنەوە کوردییەکانی دەوڵەتانی دراوسێیان دەکەن. هەرچەندە داینامیکی سیاسیی نێودەوڵەتی هێشتا دەستی بەسەر پەیوەندی نێوان ئەم چوار وڵاتەدا گرتووە، بەڵام سووریا خاوەنی مێژوویەکی پڕ پەیوەندی دوژمنانەیە لەگەڵ عێراق‌و تورکیادا. هەروەك زۆرجار کوردانی دەوڵەتێك لەلایەن حکومەتی دەوڵەتێکی دراوسێوە بۆ مەبەستی ستراتیجی بەکار دەهێنرێت.

ئەمە لە مەسەلەی کوردی عێراقدا دیارە، کاتێك پێش ڕێکەوتننامەی جەزائیری (١٩٧٥) پشتگیرییان لە شای ئێران وەردەگرت. هەروەك توانیان پشتیوانی لە سووریاش وەربگرن، چونکە کێبڕکێیەکی مێژووی لە نێوان حیزبی بەعسی سووری‌و حیزبی بەعسی عێراقدا هەیە. ئێران‌و عێراق‌و سووریا هەموویان پشتیوانی پەکەکەیان کردووەو ڕێگەیان پێداوە لە ناوچەکانیاندا دژی تورکیا چالاکیان هەبێت. تورکیا بە بیانووی بەرەنگاربوونەوەی پەکەکە (تیرۆریزم) سەربازەکانی لە باکووری عێراق جێگیر کردووە، کە لە لایەکیشەوە بۆ ڕێگرتنە لە ڕاپەڕینی کوردی لە ناوچەکانی خۆی چونکە ترسی لەوە هەیە ئەم ڕاپەڕینە ببێتە هۆی دەستکەوتی سیاسی بۆ کوردانی عێراق. ئەمەیە گرنگی ستراتیجیی کورد لە پەیوەندییە ناوچەیی‌و نێودەوڵەتیەکانی نێوان ئەم چوار دەوڵەتە بە هێزەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەڵام سیاسەتی کوردی بە هۆی ستراتیج‌و پەیوەندی‌و بەرژەوەندییە دەوڵەتییەکانەوە زیاتر تووشی دابەشبوون‌و ئاڵۆزی بووە. لە لایەکی ترەوە کورد لە هەموو کاتەکاندا توانیویەتی ئەم کێبڕکێ دەوڵەتیانە بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی خەباتی چەکداری‌و سیاسییان قۆرخ بکەن، هەرچەندە هەمیشە کورد لاواز بووە لەوەی گۆڕان لە پەیوەندی‌و بەرژەوەندی‌و ستراتیجی دەوڵەتەکاندا دروست بکات. کاروباری ناوخۆی تورکیاو عێراق وەك دوو دەوڵەتی

دراوسێی سووریا، کە خۆشیان دانیشتوانی کوردیان هەیە، ئەنجامی گرنگیان لە کاروباری ناوخۆی سووریاو کوردی سووریادا هەیە. جەنگی عێراق لە ساڵی ٢٠٠٣دا و نەبوونی ئاسایش لە عێراقو ئەو ترسەی کە رەنگە سەربەخۆیی کوردستان لە باکووری ئەو وڵاتە رابگەیەندرێت ناتەبایی‌و دوژمنکاری نێوان سووریاو تورکیاو ئێرانی سرِیەوە. بێ متمانەیی کورد لەلای ئەم دەوڵەتانە ئەو ترسەی گەورە کرد، کە کورد لە عێراق و جێگەکانی تر لە لایەن ئیسرائیلەوە بۆ خزمەتی بەرژەوەندییەکانی لە رۆژهەڵاتی ناوەراست ئامادەو پشتیوانی دەکرێن، لە ئەنجامی ئەوەشدا سیاسەتی دژە کورد لەم وڵاتانەدا تازە کرایەوە. ئەو چەوساندنەوە زۆرەی کوردەکانی سووریا لە ماوەی سێ ساڵی رابردوودا بینیویانە تەنها لە کۆنتێکستی جەنگی دژە تیرۆرو جەنگی عێراقو ئەو رێگایانەش کە بە هۆیانەوە ئەم دوو هەڵمەتە سووریاو دراوسێکانی‌و پەیوەندیەکانیان بەیەکترەوە بەستوون، قابیلی تێگەیشتننە. ئەم بەشە باسی پەیوەندییەکانی سووریا لەگەڵ تورکیاو عێراق لە سیاقی پرسی کورد لە ئاستێکی هەرێمی‌و جەنگی عێراقدا، دەکات.

## پەیوەندییەکانی سووریا- تورکیاو پەکەکە

ئەوانەی پەیوەندییەکانی سووریا و تورکیا دیاری دەکەن بریتین لە کێشەکانی خاك، ئاو، کورد و ئیسرائیل.

حکومەتی سووریا هێشتا بەردەوامە لەسەر ناکۆکیەکانی دوای بەخشینی نابەدڵی پارێزگای (حەتی) لە لایەن فرەنساوە بە تورکیا لە ساڵی ١٩٣٩دا، ئەو ناوچەیەی کە پێشتر بە (قەزای ئەسکەندەرونە)و (ئەلێکساندرەیت) ناسرابوو. ناوچەکە لە رووبەرێکی کەناری (ئاوی )و چەند دەشتێکی بە پیت لە دیوی رۆژهەڵاتی سووریا و باکووری لوبنان پێکدێت. لە بەرامبەر ئەو خاکەدا، ئەنقەرە رێکەوتننامەی ئاشتیانەی لەگەڵ دەسەڵاتی ئینتیدابدا ئیمزا کرد. سووریا وا دادەنێت کە ئەم ناوچەیەی بە ناحەق لێی زەوتکراوە، لە ئەنجامیشدا ئێستا لای سووریا ئەو ناوچەیە بەشێکە لە سووریا و داگیرکراوە. هەروەها لە هەموو نەخشە رەسمیەکانی سووریادا ئەم ناوچەیە وەك بەشێك لە سووریا دەردەکەوێت و جارو باریش لە پاڵ (بەرزاییەکانی جۆلان) دا ناوی دەهێنرێت بەوەی ناوچەیەکن لە سووریاو پێویستە بگەرێندرێنەوە. ئاو دووەم مەسەلەی سەرەکی

تره کە پەیوەندییەکانی سووریا لەگەڵ تورکیادا دیاری دەکات.[٣٦٠] (پرۆژەی ئەنەتۆلیای باشووری رۆژهەڵات) لە تورکیا وایکردووە حکومەتی تورکیا کۆنترۆڵی بەرچاوی لێشاوی ئاوی رووباری فوراتی بە ناو سووریاو عێراقدا کردووە. بە پێی رێکەوتنی نێوان ئەم وڵاتانە، پێویستە تورکیا لە چرکەیەکدا بڕی ٥٠٠م٣ ئاوی هەبێت، کە ئەوەش بڕی کەمکراوەیە لە تێکڕای ٨٥٠م٣ ئاو لە چرکەیەکدا.

سووریا لە کەموکورتی ئاوو کارەباو کێشە کشتوکاڵیەکاندا بە زۆری لۆمەی تورکیا دەکات، لە کاتێکدا تورکیا شەرم لەو دانپیانانە ناکات کە توانای سیاسی بەهێزی بۆ گرتنەوەی ئاو (یان هەڕەشە کردن بۆ گرتنەوەی ئاو) شتێکە پەیوەستە بە پەیوەندییەکانی لەگەڵ سووریادا. ئاوی فورات وەك چەکێك لە دژی سووریا بەکاردەهێنرێت، ئەمەش هەوڵێکی تورکیایە بۆ ئەوەی وا لە سووریا بکات بە کێشەی داڵدەدانی پەکەکەدا بچێتەوە کە لەلای تورکیا وەك رێکخراوێکی تیرۆریست تەماشا دەکرێت.

لە لایەکی ترەوە تورکیا، سووریا بەوە تاوانبار دەکات کە بڕی ئاوی رووباری (Orontes) بۆ تورکیا کەم دەکاتەوە بە جۆرێك ئەوەی دەگاتە ئەوێ تەنها لە ١٠٪ ی بڕە سروشتییەکەیە.[٣٦١]

بە درێژای ساڵانی شەستەکان و هەفتاکان سووریا مافی پەنابەری بەخشیوەتە چەند کەسێك لە کۆمەڵەی گەریلا ئەرمەنیو کوردەکان کە ئەنقەرە بە گروپی تیرۆریستیان دادەنێت.[٣٦٢]

هەرچەندە ئەوە کێشەی سەرەکی نێوان ئەو دوو وڵاتە بووە، بەڵام هیچ کام لەمانە هێندەی داڵدەدانی پەکەکە کاری لە پەیوەندییەکانی سووریا و تورکیا نەکردووە. لە کۆتایی هەفتاکاندا پەکەکە بە سەرکردایەتی عەبدوڵڵا ئۆجەلان لە تورکیا دامەزرا. ئەم بزوتنەوە سیاسییە لە دژی سەرکوتکاری دەوڵەتی تورکیا کە کوردی کەمینە لە تورکیا بوو بووە ئامانجی، رووبەڕووی هێرشی سەربازی سوپای تورکیا بووەتەوە، کە بەدەر لە

---

[٣٦٠] پرۆژەی وەبرهەم هێنانی ناوچەی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا بریتییە لە دروستکردنی ٢٢ بەنداو.

[٣٦١] ئۆلسن ١٩٩٧:١٧٧

[٣٦٢] ئۆلسن ١٩٩٧:١٦٩

گروپی سیاسی هاوولاتی کوردیشی گرتبووەوە.[363] لە ساڵی ١٩٨٠دا عەبدوللا ئۆجەلان و لەگەڵ خۆشیدا پەکەکە بە هاوکاری کوردی ناوچەکە چوونە ناو سووریاوە. ئۆجەلان و یەکەکانی پەکەکە لە سووریا مانەوە هەتا ئەو کاتەی لە لایەن دەسەلاتی ئەو ولاتەوە لە ساڵی ١٩٩٨دا دەرکران. لەو کاتەدا ئۆفیس و کامپەکانی مەشقکردنی پەکەکە لە دیمەشق و دۆڵی (بیقاع) لە لوبنان دامەزران و بە زۆری وا دەبینرا کە دەسەلاتی سووریاش بە شێوەیەکی نارەسمی هاوکاری حیزبەکەی کردووە. ئەم رێکخراوە زیاتر بەرەو فراوانبوون رۆیشت و بووە رێکخراوێکی پرۆفیشنالتر، هەروەها لە ساڵی ١٩٨٤دا دەستیکرد بەوەی سووریا و لوبنان وەك بنکە بۆ هێرشی چەکداری لە دژی تورکیا بەکاربهێنێت، پاشان بووە بەشێکی گرنگ لە سیاسەتی ناوخۆو دەرەوەی ئەنقەرە.[364]

لەبەر هۆکاری جیۆسیاسیی، سووریا هەوڵی نەداوە کە پەکەکە لە خاکی خۆی دەربکات یان چالاکییەکانی رابگرێت، هەرچەندە نکوڵی لەوە کردووە کە ئۆجەلان لەو ولاتە بوو بێت و بە شێوەیەکی کاتی بۆ لوبنانی ناردبوو.[365] بۆ سووریا، وجودی پەکەکە لە ولاتەکەیدا بوو بووە ئامرازێك تا بتوانێت گوشار بخاتە سەر تورکیا و جۆرێك لە هاوسەنگی لە بەرامبەر کۆنترۆڵی تورکیا بەسەر ئاوی فوراتدا بۆ سووریا دروست بکات. بەهەمان شێوەش کۆنترۆلکردنی ئاوی فورات لە لایەن تورکیاوە وەك گوشار بۆ سەر سووریا بەکاردەهێنرێت چونکە رێگە بە بوونی پەکەکە لە ناوچەکانیدا دەدات.

لایەنی چوارەمی خاڵی ناکۆکی و ململانێی نێوان سووریا و تورکیا، پەیوەندی تورکیایە لەگەڵ ئیسرائیلدا.

هاوکاریکردنی تورکیا و ئیسرائیل و هاوبەشیکردنی زانیارییان لە بارەی پەکەکەو گروپە ناسیۆنالیستە کوردەکانی ترو رێکخراوی ئازادی فەلەستین بۆ ماوەی چەند دەیەیەکە بەردەوامەو لە دوای ساڵی ١٩٩٤ چڕتر بووەتەوە.[366] هەرچەندە لەم دواییانەو لە ساڵی ١٩٩١دا پەیوەندییەکانی نێوان ئەو دوو ولاتە سنووردارو لە ئاستێکی نزمدا بووە.[367]

---

[363] چاوپێکەوتنێك لەگەڵ خێزانێکی کورد لە کوبانی، سووریا ٢٠٠٢ (ناوەکانیان لەلایەن نووسەرەوە پارێزراوە.)

[364] ئۆلسن ١٩٩٧:١٧٠

[365] هەمان سەرچاوە

[366] ئۆلسن ١٩٩٧:١٧٨

[367] رۆبنس ٢٠٠٣: ٢٣٩

یەکەم تەوافوقی دوو لایەنەی ئاشکرا لە بارەی گەشتیارییەوە لە ساڵی ١٩٩٣دا لە نێوان هەردوو وڵاتدا ئیمزا کرا.[٣٦٨] پاشان پەیوەندیەکانییان فراوانو بەهێز بوو، ئەویش لە دوای چەند ڕێکەوتنێکی هەمەلایەنەی ئابووری و سەربازی لە ساڵی ١٩٩٦دا.[٣٦٩] بنچینەی ئەم هاوکاریکردنەش بۆ مەسەلەی ئاسایش، کە لە ساڵی ١٩٩٦دا بەربڵاوبوو، ئەو هەڕەشە تیرۆریستییە بوو کە هەردوو وڵات ڕووبەڕووی ببوونەوە: کورد لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیاو فەلەستینیەکان لە ئیسرائیل[٣٧٠] و بەمەبەستی لەپەلوپۆخستنی سووریا لە پشتگیریکردنی ئەم گروپانە.[٣٧١] لە لایەکی ترەوە هاوکاریکردنی سەربازی ئیسرائیل بۆ تورکیا لە دژی هەڕەشەکانی کورد بۆ سەر ئەو وڵاتە، بەر لە ڕێکەوتنی ساڵی ١٩٩٦، بە لای ئیسرائیلەوە تا ڕادەیەك مەسەلەیەکی کێشەدار بووە.

ئیسرائیل هیچ مەیلێکی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی لە دژی کورد نەبووە بەو پێیەی هیچ کێشەیەکی لەگەڵیاندا نییەو کێشەی کوردی تورکیا بە کێشەیەکی ناوخۆیی دادەنێتو بەلای ئەمەوە پێویستی بە ڕێکەوتنی دوو لایەنە نییە.[٣٧٢] هەروەك چەند ڕاپۆرتێك ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەفسەرە ئیسرائیلیەکان ڕۆڵیان هەبووە لە داڕشتنی پلانو دابینکردنی پشتگیری تەکنیکی بۆ دەستێوەردانی سەربازیی تورکیا لە باکووری عێراق لە ساڵی ١٩٩٥ ئەوەش باسکراوە، کە بەهۆی بوونی ئەم پەیوەندییەوە پێکهاتەی کوردی بە ناچاری ویستی خۆیان بۆ لە قاڵبدانی سووریا و عێراق فراوان کردووە.

ئاو لایەنێکی تربوو کە پەیوەندییەکانی ئیسرائیل و تورکیای پێشخستبوو.[٣٧٣] وەبەرهێنانی کەرتی تایبەتی ئیسرائیل لە (GAP)ی تورکیا بووە هۆی ئەوەی وەزیری بەرگری سووریا ئیسرائیل تاوانبار بکات کە تورکیاو ئاوی فورات وەك چەکێك بۆ گوشارخستنە سەر سووریا بەکاردەهێنێت تا هەندێك تەنازولاتی ناوچەیی بۆ ئیسرائیل

[٣٦٨] ڕۆبنس ٢٠٠٣: ٢٥٠
[٣٦٩] ڕۆبنس ٢٠٠٣: ٢٥٢
[٣٧٠] ڕۆبنس ٢٠٠٣: ٢٥٢-٢٥٣
[٣٧١] نەیکەن ١٩٩٩: ١٧٦
[٣٧٢] ڕۆبنس ٢٠٠٣: ٢٥٥
[٣٧٣] ڕۆبنس ٢٠٠٣: ٢٥٣

بکات. [٣٧٤] پەیوەندییەکانی تورکیا لەگەڵ ئیسرائیل خەمەکانی دیمەشقی زیاتر کرد لەبارەی ئەو هەڕەشانەی لەلایەن دراوسێکانیەوە دەکرێنە سەری، هەروەك ئەمەش چووە سەر پشێویەکانی تری سووریا لە ترسی ئەو هەڕەشە سەربازییە جدیو بەهێزانەی لەسەری بوونو کۆنترۆڵکردنی ئاوی فوراتو چڕکردنەوەی هەوڵەکان بۆ لەقاڵبدانی سووریا لە رێگەی لە بازنەنانی ستراتیجیەوە. هەروەك راگەیاندراوە لەم ساڵانەی دواییدا ئیسرائیل حەزی کردووە، بۆ خزمەتکردنی بەرژەوەندیەکانی خۆی لە ناوچەکەدا، پەیوەندی لەگەڵ کورد دروست بکات. [٣٧٥]

سەرەڕای ئاڵۆزبوونی گرژییەکانی نێوان ئەم دوو وڵاتە، نە تورکیا و نە سووریا نەیانویستووە واز لە دەسەڵاتو کاریگەریان بە سەر یەکتردا بهێنن، تورکیا لە هەڕەشەکردنو سەرقاڵکردنی سووریا بە مەسەلەی ئاو و کەمکردنەوەی لێشاوی ئاوی فورات بۆ ناو سووریا بەردەوام بووە. [٣٧٦] لەلایەن خۆیشییەوە سووریا داوای تورکیای بۆ رەوانەکردنەوەی عەبدوڵڵا ئۆجەلان رەتکردەوە، تەنانەت کاتێکیش کە هەڕەشەی سەربازی لێکرا. بەدەر لەو ماوەیەی کە چەند ئاماژەیەکی دڵخۆشکەرانەی بۆ تورکیا تێدا بوو لە نێوان ساڵانی ١٩٩٣-١٩٩٥ کاتێك سووریا پەکەکەی وەك رێکخراوێکی تیرۆریست [٣٧٧] ناساندو دەسەڵاتدارانی سووریا ئەندامانی پەکەکەیان دەستگیرکردو رەوانەی تورکیایان کردنەوە، بەڵام سووریا رەتی کردەوە کە ئۆجەلان تەسلیم بکاتەوە. هەر بۆیە پەیوەندییەکانی هەردوو وڵات گەیشتە بنبەست. [٣٧٨]

گرژییەکانی نێوان سووریاو تورکیا لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٨دا گەیشتە لوتکە کاتێك سوپای هەردووکیان هەریەك لە لای خۆیەوە لەسەر سنووری تورکیا - سووریا کۆبوونەوە. قەیرانەکان هەڵگەڕانەوە کاتێك دەسەڵاتی سووریا لە ژێر گوشاری ئەمریکادا رازی بوو، [٣٧٩] کە سەرکردەی کورد عەبدوڵڵا ئۆجەلان دەربکاتو رێکەوتنی ئەمنی لە نێوان سووریاو تورکیادا ئیمزا کرا. لە ساڵی ١٩٩٨ لە کاتی ئیمزاکردنی

---

[٣٧٤] داودی ن . د.

[٣٧٥] بۆ نموونە بروانە هەرش ٢٠٠٤

[٣٧٦] ئۆلسن ١٩٩٧:٨

[٣٧٧] ئۆلسن ١٩٩٧:١٧٥

[٣٧٨] ئۆلسن ١٩٩٧:١٧٨

[٣٧٩] ئەیکەن ١٩٩٩: ١٨٦

(ڕێکەوتننامەی ئەدەنە)، کە تێیدا سووریا ڕازی بوو هیچ پەیوەندیەك لەگەڵ پەکەکەدا دروست نەکاتو بە هیچ شێوەیەك ئاسانکاری بۆ چالاکیەکانیان نەکات، گرژی نێوان تورکیا و سووریا ڕەویەوەو هاریکاریکردنیان بۆ مەسەلەی کورد زیادی کرد. جەنگی عێراقی ساڵی ۲۰۰۳ و پرسی داهاتووی کوردستانی عێراق، تورکیا و سووریای خستووەتە سەردەمێکی تازەی هاوکاریکردنەوە. لە مانگی ۱۱/۲۰۰٤دا بەشار ئەسەد یەکەم سەردانی خۆی وەك سەرۆکی دەوڵەتی سووریا بۆ تورکیا ئەنجام دا. هەردوو وڵات ڕازی بوون لە سەر هاوکاریکردن لە دژی تیرۆریزم کە ناردنەوەی کەسە داواکراوەکانیشی گرتەوە، هەروەك بەهۆی ئەو ڕێکەوتنەی نێوان سووریا و تورکیاوە ژمارەیەکی زۆری کورد لە سووریاوە ڕەوانەی تورکیا کرانەوە.[380] ڕاپۆرتی سەرچاوە کوردییەکان لە سووریا ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە تانکی تورکی بە درێژایی سنووری تورکیا لە دیوی قامیشلیەوە لە جموجۆڵدا بوون بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەرینی کوردەکان لە ئازاری/۲۰۰٤ هێزی سەربازی تورکیا لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا لە کاردا بووە بۆ دڵنیابوون لەوەی کە کوردەکانی تورکیا هیچ پشتگیریەك پێشکەش بە بەرهەڵستکارانی کورد ناکەن لە سووریا.[381]

## پەکەکە و دەسەڵاتەکانی سووریا و کوردی سووریا

پەکەکە حیزبێکی سیاسی کوردی بوو کە ئایدۆلۆجیاکەی لە سەر مارکسیزم-لینینزم و بنەما شۆڕشگێڕییەکان بنیاتنرابوو. خەباتی چەکداری وەك ستراتیجیی سیاسی بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی بۆ کوردستان پەیڕەو دەکرد. لە کۆنگرەی هەشتەمی حیزبەکەدا کە نیسانی/۲۰۰۲ بەسترا، پەکەکە ناوی خۆی بۆ (کۆنگرەی ئازادی و دیموکراسی کوردستان، KADEK) گۆڕیو خەباتی چەکداریشی وەك ستراتیجی خۆی ڕاگەیاند. پاشان لە کۆتایی ساڵی/۲۰۰۳دا، حیزبەکە ناوی خۆی بۆ (کۆنگرەی گەلی کوردستان، KGK) گۆڕی. پەکەکەو ڕێکخراوەکانی تری دوای خۆی لە تورکیا نایاساییو لە پرۆسەی ڕەوای سیاسی دوورخرانەتەوەو دەوڵەتی تورکیاش وەك

---

[380] بڕوانە KHRP سەردێری هەواڵەکان ۲۳/۳/۲۰۰۳:۸:۲

[381] ڕاپۆرتێك لەلایەن ماڵپەڕی کوردی: Serhildanaqamishlo.com ، ۱۳/۳/۲۰۰٤، Amude.com

تیرۆریست مامەڵەیان لەگەڵ دەکات، ئەمەش بەشێوەیەکی سەرەکی لە ڕێگەی ستراتیجی ئایدۆلۆجیاو سەربازییەوەیە. غیابی بەرهەڵستکاری سووریا بەرامبەر بوونی پەکەکەو چالاکییەکانی یەکە سەربازییەکانیو بوونی بنکە و کامپی مەشقکردن لە سووریا و لوبنان لە نێوان ساڵانی ١٩٨٠-١٩٩٨، خەباتی ئەم حیزبەی لە دژی دەوڵەتی تورکیا ئاسان کردووە. بوونی پەکەکە لەو وڵاتە کاریگەری هەمەجۆری بۆ کوردەکانی سووریا هەیە. لە سەرەتادا ڕێکخراوەکە پشتگیری فراوانی لە کوردانی سووریاوە پێدەگەیشتو بەزۆری لەلایەن لاوە کوردەکانەوە پەیوەندی پێوەدەکرا. هەرچەندە بە درێژایی نەوەدەکان ڕەخنە لە تاکتیکو ئایدۆلۆجیای پەکەکەو پەیوەندی بە حکومەتی سووریاو چالاکییە ناوخۆییەکانی زیادی کرد. کوردانی سووریا بەشداری لە پێشکەشکردنی خزمەتو پارەو هێزی مرۆیی بە پەکەکە لە دژی تورکیا دەکەن.[٣٨٢] هەروەك ئەم ڕێکخراوە دەستی بەسەر کاری ڕێکخراوەیی سیاسی کوردی سووریادا گرتووە. باسی ئەوەش دەکرێت کە ئەوەندەی چالاکی حیزبە سیاسیو بۆنەو یادەکانی کوردانی سووریا سەرکوتدەکرێن، چالاکیو بۆنە کولتوورییەکانی پەکەکە لەلایەن دەسەڵاتی سووریاوە ئەوەندە ڕێگریيان لێناکرێت.[٣٨٣] لەگەڵ ئەوەشدا پەکەکە ئازادی تەواوی بۆ ئەنجامدانی چالاکیە سیاسیو کولتووریەکانی لە سووریا نەدراوەتیو لە چەندین بۆنەدا ئەندامانو هەڵسوڕاوانی پەکەکە لە بەرامبەر ئەو چالاکیانەدا دەستگیردەکرێن. پێش ساڵی ١٩٩٦، ئەو کاتەی عەبدوڵڵا ئۆجەلان ڕایگەیاند کە زۆربەی کوردانی سووریا پەنابەرنو لە تورکیاوە هاتوون، بۆیە بە گەڕانەوەیان بۆ تورکیا، شادمان دەبن،[٣٨٤] بەوەش پەکەکە هەزاران کوردی سووریای هێنایە ڕیزی پلەدارانیەوە. بەپێی ڕاپۆرتەکان نزیکەی ٧٠٠٠- ١٠,٠٠٠ کوردی سووریا بە پلەی جیاواز پەیوەندییان بە پەکەکەوە کردووە کە لە شەڕەکانی دژی تورکیادا کوژراون یان لە سووریا بێسەروشوێن بوون.[٣٨٥] سەرچاوە کوردییەکانی سووریاش ئاماژە بۆ ئەوە

---

[٣٨٢] چاوپێکەوتنێك لەگەڵ خێزانێکی کورد لە کوبانی، سووریا ٢٠٠٢ (ناوەکانیان لەلایەن نووسەرەوە پارێزراوە.)

[٣٨٣] چاوپێکەوتنەکان لەگەڵ نوێنەرانی (ئەلحیزبە)، حیزبیە دیمۆکراتە کوردی لە سووریا، حیزبیە یەکێتییە دیمۆکراتە کوردی لە سووریا، حیزبیە یەکێتییە کوردی لە سووریا و حیزبیە هەڤگرتنە گەلی کورد لە سووریا، ئەڵمانیا، دیسەمبەری ٢٠٠٢

[٣٨٤] ماکداواڵ ١٩٩٨: ٦٦

[٣٨٥] ماکداواڵ ١٩٩٨: ٦٥ چاوپێکەوتنەکان لەگەڵ نوێنەرانی (ئەلحیزبە)، حیزبیە دیمۆکراتە کوردی لە سووریا، ئەڵمانیا، دیسەمبەری ٢٠٠٢، چاوپێکەوتنەکان لەگەڵ ڕێخراوی کوردەکانی ڕۆژئاوا، لەندەن، تشرینی یەکەم ٢٠٠٣

دەکەن، کە پەیوەندیکردن بە باڵی سەربازی پەکەکەوە بووەتە بەدیلی خزمەتی سەربازی رەسمی لە سووریادا. ئەمەش لەبەرئەوەی ئەو کوردانەی پەیوەندی بە پەکەکەوە دەکەن، یان لە پێناویدا خۆیان بە کوشت دەدەن هیچ کاتێك بە فەرمانێکی رەسمی لە پەکەکەوە ناچار نەکراون کاری سەربازی ئەنجام بدەن، هەروەك باسی ئەوەش دەکرێت کە حکومەتی سووریا ئاگادارکرابێتەوە لەبارەی ناوی ئەو کوردانەی لەگەڵ ئەو حیزبەدا کاردەکەن.[٣٨٦]

وتەکانی ئۆجەلان لە ساڵی١٩٩٦دا ئەو وێنەیەی هەڵگێرایەوە کە دەوڵەتی سووریا هەوڵی داوە بۆ دانیشتوانە کوردەکەی بکێشێت. سەرچاوە کوردییەکانیش لە سووریا ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە پەکەکە لە پێناو مانەوەی لە سووریادا ئەم هەڵوێستەی پەیڕەو کردووە.[٣٨٧] لە ئاکامدا ئەمە خزمەتی بەرژەوەندییە ناوخۆییەکانی سووریای بەرامبەر دانیشتوانی کوردی خۆی کردووە. لە کاتێکدا پەکەکە لە رووی سیاسیەوە کوردانی سووریای تێوەگلاندووە، هەستی نەتەوەیی کوردی لە دەرەوەی بازنەی سیاسی ناوخۆی سووریاو دوور لە رژێمی سووریا ئاراستە کردووە. ئەمرۆ ژمارەیەکی زۆر لە کوردی سووریا لە پشتگیریکردنی ئەم رێکخراوە بەردەوامن، هەرچەندە هەموو حیزبە سیاسییە کوردییەکان لە سووریا پەیوەندی خۆیان بە پەکەکەو بەیانەکانی ئەم دواییانەی پچڕاندووە. لە ساڵی ١٩٩٨دا هەردوو حکومەتی سووریاو تورکیا بە بڕیارێکی کۆتایی، بۆ بەرهەڵستکاری تەواو لە دژی پەکەکە، گەیشتن. ئۆجەلانیش لە سووریا دەرکراو هەموو نووسینگەو کامپی مەشقکردنەکانیان داخران و سەرچاوەی داهاتیشیان دەستی بەسەردا گیرا.[٣٨٨] لەو کاتەوە وا باس دەکرێت کە حیزبەکە بەشێوەیەکی نهێنی لە رێگەی حیزبە سیاسییە کوردیەکانی سووریای نزیك لە پەکەکە کاردەکات.[٣٨٩]

---

[٣٨٦] لە چاوپێکەوتنە جۆربەجۆرەکاندا پاڵپشت کراوە لەگەڵ کوردەکان لە سووریا، ئەڵمانیا وبریتانیا و فەرەنسا، لە نێوان ئابی ٢٠٠٢ و مایسی ٢٠٠٤دا.

[٣٨٧] چاوپێکەوتن لەگەڵ کوردە جۆربەجۆرەکاندا لە سووریا، ئەڵمانیا وبریتانیا و فەرەنسا.

[٣٨٨] رایت ٢٠٠٠: ١٨٠-١٨٢

[٣٨٩] چاوپێکەوتن لەگەڵ نوێنەرانی حیزبە کوردییەکانی سووریا ، ئەڵمانیا، دیسەمبەری ٢٠٠٢

## پەیوەندییەکانی سووریا- تورکیا و کورد

پەکەکە بەوە دەناسرێت کە لە هەریەك لە عێراق و ئێران و سووریا و لوبنان و ئەرمینیا چالاکی هەیە، ئەمەش وایکردووە ستراتیجی تورکیا بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دانیشتوانە کوردەکەیداو ئەو بزوتنەوە سیاسییەی وابەستەی سیاسەتی دەرەوەی تورکیا بووە، لەگەڵ کێشەی ناوخۆی کوردی ئەو دەوڵەتانەی باسکرانو پەیوەندییە نێودەوڵەتیو هەرێمییەکان، پێکەوە گرێ بدات. هەرچەندە لە چەند لایەنێکەوە سیاسەتی دەرەوەی سووریاو تورکیا لە ململانێدانو ناکۆکی مێژوویی لە نێوانیاندا هەیە، بەڵام لەسەر پرسی نەتەوەی کورد بەرژەوەندییەکانیان هاوتایەو هاوکاریکردن لە نێوانیاندا شێوازێکی کردەییو توندی بڕیاردانی وەرگرتووە. ترسی ئەوەی تەنازولکردن بۆ کورد لە دەوڵەتێکدا کە دەبێتە هۆی زیادبوونی داوای کورد لە دەوڵەتێکی تردا، بۆ چەندین ساڵە تورکیا و ئێران و سووریا و بەم دواییانەش عێراق لە سەردەمی سەدام حسێندا هەماهەنگییان بۆ سیاسەتێکی هەرێمی لە دژی کورد هەبووە. سەرەڕای ئەو جیاوازییە ئاشکرایەی لە تاکتیکی هەر دەوڵەتێکدایە، (سووریا سیاسەتی سەرکوتکردنی سەربازی دژی دانیشتوانە کوردەکەی و خاپورکردنی بەکۆمەڵی شارو گوندە کوردیەکان پەیرەو نەکردووە)، چەند خاڵێکی هاوبەش لە سیاسەتی تورکیاو سووریا بەرامبەر بە کورددا هەیە. ستراتیجی ئەوان بۆ تێکەڵکردنی بەزۆرو گۆڕینی دیمۆگرافیای ناوچە کوردیەکان، هۆکاری بێتواناییە لە ئاست قبولکردنی شوناسی کوردیو میتۆدی هاوبەش بۆ بەئامانجکردنو سەرکوتکردنی ئەو شوناسە. لە کاتی جەنگی عێراق لە ساڵی ٢٠٠٣دا، جیابوونەوەیەك لە سیاسەتی دەرەوەی تورکیاو سووریادا رووی دا. سووریا، کە لە سەرەتای دامەزراندنیەوە بەرامبەر رژێمی بەعس لە عێراق توندوتیژ بووەو رکابەرییەکی مێژووی بۆ دەستبەسەراگرتنی بەشێکی زۆری (Levant) هەبووە، بەرامبەر هێرشی سەربازی لە دژی عێراق وەستایەوەو پشتیوانی خۆی بۆ رژێمەکە دەربڕی. تورکیاش هەڕەشەی لە پەیوەندی نزیکی لەگەڵ ئەمریکادا، بەهۆی رەتکردنەوەی ئەوەی کە ناوچەکانی بەکاربهێنرێت لە هێرشی زەمینی بۆ ناو خاکی باکووری عێراق، کرد. راستیەکە ئەوە بوو، کە کوردی باکووری عێراق

شانبەشانی سەربازەکانی ئەمریکا لەم ناوچەیەدا شەریان دەکردو روخانی رژێمی بەعسیش لە عێراق پرسی کوردی دەهێنایە ریزی پێشەوەی پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکانو داینامیکی هەرێمی، کە لەو کاتەدا بوو بوونە فاکتەری گرنگ لە بڕیارەکانی سووریاو تورکیاشدا. بەهۆی جەنگی عێراقەوە، سووریاو تورکیا پێیان نایە زەمەنێکی نوێی هاریکاریکردنو رێکەوتنەوە. لە هەردوو وڵاتەکەدا جەختکردنەوەی بێنەژمار لەبارەی یەکپارچەیی خاکی عێراقەوە دەکرێتو وەستانەوە لە دژی فیدراسیۆنی نەتەوەیی کە تیایدا کوردی عێراق خاوەنی کۆنترۆڵی هەرێمیو دەسەلاتی ناوەندیی بۆ ڤیتۆ پشتبەستە بە ترس لە دەسەلاتی سیاسی دەوڵەتی کوردی لە دەوڵەتێکی دراوسێداو ئەو کاریگەرییەی کە رەنگە دەسکەوتەکانی کورد لە عێراق لەسەر کوردەکانی سووریا و تورکیا بەجێی بهێڵێت. هەروەك لەوانەیە پێشکەوتنەکانی کوردستانو عێراقو بەشداریی نێودەوڵەتی لە مەسەلەی کورددا، زۆر لە هەردوو دەوڵەتی سووریا و تورکیاش بکات کە کار بۆ چارەسەرکردنی پرسی ناوخۆی کورد بکەن. لە ئێستادا زیادبوونی رەنگدانەوەی هەڕەشە ناوخۆییو دەرەکییەکان و ترسی راگەیاندنی سەربەخۆیی کورد لە باکووری عێراق، پەیوەندیی رژێمی سووریاو تورکیاو ئێرانیشی زیاتر کردووە.

## پەیوەندییەکانی سووریا و عێراق

پەیوەندییەکانی سووریا و عێراق چەندین رکابەریی مێژووی لە نێوان هەردوو وڵاتەکەدا لە خۆ دەگرێت، ئەوەش بەهۆی کۆنترۆڵی ئاوی فورات لە لایەن تورکیاو سووریا لە لایەكو مەسەلەی کوردیش لە لایەکی ترەوە. سووریاو عێراق لە رووی مێژووییەوە کێبڕکێ بۆ دەستبەسەراگرتن و دروستکردنی کاریگەری و دەسەلاتی سیاسی بەسەر (Levant)دا دەکەن.

لە ساڵی ۱۹٦۳داو لە ماوەی چەند مانگێکدا، هەردوو حیزبی بەعس لە سووریاو عێراق دەسەلاتییان گرتە دەست، لە کاتێکدا هەردوو حیزبی بەعس بۆ لێکدانەوەی ئایدۆلۆجیای راستەقینەی بەعسو سەرکردایەتیی ناوچەیی عەرەب لە مونافەسەدا بوون.

کاتێك سووریا لە جەنگی ئێرانو عێراق لەماوەی سالآنی ١٩٨٠-١٩٨٨ پشتی ئێرانی گرت، پەیوەندییەکانی هەردوو ولآت گرژی بەخۆیەوە بینی. دیسانەوە سووریا لە داگیرکردنی عێراق لە سالّی ١٩٩٠دا، لە دژی عێراق وەستاو پەیوەندیی بەهێزی لەگەڵ هاوپەیمانەکاندا هەبوو. هەردوو سیاسەتەکە بە شێوەیەکی بڕیاردەرانە نائاسایی بووەو حیسابێکی هەرێمی بۆ کراوە، بەلآم بە بیانووی ململانێ ناوچەییەکانی سووریا لەگەڵ ئیسرائیل شەرعیەتی پێدراوە.[٣٩٠]

دوای ئەوەی سەدام حسێن سالّی ١٩٧٩ دەسەلآتی لە حیزبی بەعسدا گرتە دەست، کاریگەریی لایەنە پڕۆ- سورییەکانی بە شێوەیەکی بەرفراوان سڕدرایەوە، بەوەش هاوپەیمانیی (دژە- کامپ دەیڤد )ی سووریاو عێراق هەرەسی هێناو سووریاش بە تەواوی دوورە پەرێز کەوت.[٣٩١] هەلی هاوپەیمانیی لەگەڵ ئێران هەر هەمان سالّ تەشەنەی سەند، بەوەی شۆڕشی ئیسرائیل، ئێرانی لە پشتیوانو هاوپەیمانی ئیسرائیلو ئەمریکاوە گۆڕی بۆ رکابەری سەرسەختی هەردووکیان. لە سالّی ١٩٨٠دا سووریا داگیرکردنی ئێرانی لەلایەن عێراقەوە مەحکوم کرد، چونکە بەلای ئەوەوە جەنگەکە دەولّەتانی عەرەبی لە ململانێکانیان لەگەڵ ئیسرائیلدا وەرگێڕاو بۆ ئەوەش پشتی ئێرانی گرت.[٣٩٢] لە بەرامبەریشدا کاتێك ئیسرائیل لە سالّی ١٩٨٢دا لوبنانی داگیرکرد، ئێران پشتیوانیی سووریای کرد.

بڕیاری سووریا بۆ پەیوەندیکردن بە هێزی هاوپەیمانانەوە لە کاتی جەنگی کەنداوی ١٩٩٠دا وەك ئاماژەیەك بۆ پەیوەندییە هەرێمییەکانی سووریاو ململانێکانی لەگەڵ ئیسرائیلدا دەبینرێت. سەدام حسێن، کە بە داگیرکردنی کوەیتەوە خەریك بوو، پشتگیری بەرهەلّستکاریەکەی جەنەڕالّ (Aouns)ی لە دژی پێگەی سووریا لە لوبنان کرد، کە بە لای سووریاوە لە ململانێکانیدا لەگەڵ ئیسرائیل، خالّێکی مەرکەزی بوو.[٣٩٣] بەهەمان شێوە، پەیوەندیکردن بە هاوپەیمانانەوە وایکرد سووریا ئەو دوورە پەرێزییە هەرێمیو نێودەولّەتییەی کە بەهۆی هاوپەیمانیی لەگەڵ ئێران لە کاتی جەنگی

---

[٣٩٠] هینەباسچ ٢٠٠٢: ١٤٩

[٣٩١] هینەباسچ ٢٠٠٢: ١٥٦

[٣٩٢] هەمان سەرچاوە

[٣٩٣] هینەباسچ ٢٠٠٢: ١٥٧

عێراقو ئێرانو هەرسی یەکێتیی سۆڤیەتەوە تووشی بوو بوو، بشکێنێت. بەهۆی بەشداریکردنی لە جەنگی کەنداو لە ساڵی ١٩٩٠دا، سووریا توانی پەیوەندییە هەرێمییەکانی لە ناوچەکەدا ڕێکبخاتەوەو کۆمەكو هاوکاری لە سعودیە وەربگرێت، هەروەك هەژموونی سووریا لە لوبنان لەلایەن ئەمریکاو ئیسرائیلەوە چاوی لێپۆشرا.[٣٩٤]

نزیکبوونەوە و دووبارە ڕێکخستنەوەی پەیوەندییەکانی سووریا لەگەڵ عێراق لە ساڵی ١٩٩٧و لە سەردەمی حافز ئەسەددا دەستی پێکردەوە. دوابەدوای هاتنە سەر حکومی بەشار ئەسەد لە دوای مردنی باوکی، نزیکبوونەوەی پەیوەندییەکان زیادی کرد. پەیوەندییە ئابوورییەکان لەگەڵ عێراق رووی لە زیادبوون کرد کە تێیدا بازرگانی نایاسایی شمەك و نەوت لە نێوان ئەو دوو وڵاتەدا دەکراو بووە هۆی ئەوەی سووریا بتوانێت رێ لە ئابوورییە ناجێگیرەکەی و ریفۆرمی سیاسی بگرێت. لەکاتی جەنگی عێراقی ساڵی ٢٠٠٣ دا، سووریا هەوڵی داوە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی خۆی بکات، ئەویش بە دروستکردنی پەیوەندیی باش لەگەڵ عێراقو هەندێك لایەنی نەیاری وڵاتەکەو بەکارهێنانی ئەم پەیوندییانە وەك یارمەتیدەرو خاڵی سازشکردن بۆ پەیوەندییەکانی سووریا لەگەڵ ئەمریکاو وڵاتە ئەوروپییەکان و هەندێك دەوڵەتی تری ناوچەکەدا. وەك پێشتر ئاماژەی پێکرا، کەمکردنەوەی یەدەگی ئاوو کۆنترۆڵی تورکیاو سووریا بەسەر بڕی ئاو بۆ عێراق سەرچاوەی گرژییەکانی نێوان ئەو دوو وڵاتە بووە. کاتێکیش سووریا بەنداوی (تابقە)ی تەواو کرد، ئیدی دەستی بە پڕکردنی دەریاچەی ئەسەدو کەمکردنەوەی ئاوی فورات کرد، بەمەش گرژییەکان لە ساڵی ١٩٧٣دا گەیشتنە لوتکە. عێراق لە ساڵی ١٩٩٥دا سووریای بە گلدانەوەی ئاو تۆمەتبار کردو داوای کرد کە جامیعەی عەرەبی تەدەخول بکەن. لە کۆتایی مانگی مایسی ئەو ساڵەدا ململانێ لەسەر بەنداوی (تابقە)و بڕی ئاو، سووریاو عێراقی خستە لێواری جەنگەوە. بەناوبژیوانی سعودیە، هەردوو وڵات گەیشتنە ڕێکەوتنێکی نارەسمیو بەپێی ڕێکەوتنەکە سووریا لە ٤٠٪ ی ئاوەکە بۆ خۆی گلدەداتەوەو ڕێگەدەدات لە ٦٠٪ ی بۆ عێراق بچێت. ئەمە ناکۆکییەکانی پێشوتری هەڵدایەوە کە لە لە ساڵی ١٩٩٠دا

[٣٩٤] هینەباسچ ٢٠٠٢: ١٥٧-١٥٨

تورکیا دەستی کردبوو بە پڕکردنی بەنداوی (ئەتاتورك). سووریا و عێراق تورکیایان بەوە تاوانبار کرد کە ئاگاداری نەکردوونەتەوە لەوەی بڕی ئاوەکە بە شێوەیەکی بەرچاو کەمی کردووەو عێراقیش لە لای خۆیەوە هەڕەشەی بۆمبارانکردنی بەنداوەکانی فوراتی کرد. بەو شێوەیەی خەڵك پێشبینی دەکات، کوردی عێراق لە لایەن دەوڵەتی سووریاوە وەك دوژمن تەماشا ناکرێت. بە پێچەوانەوە لە چەند کاتێکدا نەبێت، حکومەتی سووریا پەیوەندی لەگەڵ حیزبە سیاسیە کوردییەکانی کوردستانی عێراق پاراستووەو وەك ئامرازێکی ستراتیجی دژی حکومەتە رکابەرەکەی لە بەغدا ئەم گروپانەی بەکارهێناوە. دوابەدوای جەنگی کەنداو و دامەزراندنی هەرێمی ئۆتۆنۆمی باکوور لە کوردستانی عێراق، سووریا پەرەی بە پەیوەندییەکانی لەگەڵ حیزبە سیاسیە کوردییەکانی عێراق داوە. کورد هەلی دروستکردنی گوشاریان بۆ سەر رژێمی حیزبی بەعس لە عێراق نیشانداوە. هەرچەندە کوردی عێراق لە کاتی بەر لەدروستبوونی عێراق وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ خەریکی خەباتی چەکدارین بۆ بەدەستهێنانی مافەکانیان، بەڵام لە مێژوودا هەرەشەیان بۆ سەر دەوڵەتی سووریا دروست نەکردووە، هەروەك هانی راپەرینیشیان لە نێو کوردەکانی سووریادا نەداوە. هەریەك لە حیزبی دیموکراتی کوردستانو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، نووسینگەی رەسمییان لە سووریا هەیە کە وەك ئامرازێکی هاریکاریی دیپلۆماسی گرنگ بۆ پێشخستنی کوردستانی عێراق بەکاردەهێنرێت.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بۆخۆی لە ساڵی ١٩٧٤ لە سووریا دامەزراوەو تا ئێستاش پەیوەندیی زۆرباشی لەگەڵ دەسەڵاتی سووریادا هەیە. بەرپرسانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان پێیان وایە کە ناوچەکانی کوردستان لە سووریا بۆ خەباتی کوردی لەچاو جێگەکانی تردا جێگەی بایەخی کەمترن.[٣٩٥] خۆناساندنیان وەك حیزبێکی چەپ و پەیوەندییان بە فەلەستین و گروپە هاوشێوەکانی ترەوە، پەیوەندیانی لەگەڵ دیمەشق بەهێزتر کردووە، لە کاتێکدا حیزبی دیموکراتی کوردستان، بەهۆی پەیوەندییەکانی رابوردووی لەگەڵ ئەمریکادا، بە رەجعیو موحافیزکار دادەنرێت.[٣٩٦]

---

[٣٩٥] چاوپێکەوتنێك لەگەڵ د. لەتیف رەشید نوێنەری ی.ن.ك. لەندەن، ٢٠٠٢، راکدزوال ١٩٩٨: ٦٩-٧٠

[٣٩٦] چاوپێکەوتنێك لەگەڵ دلشاد میران نوێنەری پ.د.ك لە بریتانیا، لەندەن، ٢٠٠٤/١/٢٧

راپەڕینەکانی کورد لە عێراقو بوونی حیزبە کوردییەکانی عێراق لە سووریا بەبێ مەبەست سەرنجی کوردەکانی سووریای لە بەرامبەر سەرکوتکردنەکانی خۆیاندا کەمکردووەتەوە. هەرچەندە حیزبی دیموکراتی کوردستانو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان هەرگیز سیاسەتی خۆیانو هانی پەیداکردنی ئەندامیان لە نێو کوردەکانی سووریادا بڵاونەکردۆتەوە. بەهێزی سەرکردایەتیی کوردی عێراق وابەستە بە پشتگیریی مێژوویی کوردەکانی سووریا بۆ بزوتنەوەی سیاسی کوردی لە عێراق وا لێکدەدرێتەوە کە بوونی ئەوان لە سووریا بۆ زیاتر لاوازکردنی بزوتنەوەی کوردییە لە سووریا. کوردەکانی سووریا پشتگیریی هێزی مرۆیی زۆر پێشکەش بە خەباتی کورد لە باکووری عێراقو حیزبی دیموکراتی کوردستانو یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەکەن، هەر بەو شێوەیەی لەگەڵ یەکەکەدا کردیان، هەروەك رێگەو ئامراز بۆ ئاسانکاری گەیاندنو سەرچاوە بۆ دەرەوەی عێراق کاردەکەن. لەبەر ئەوەی بەدەگمەن کوردی عێراق وەك هەڕەشەیەکی بەردەوام بۆ سەر یەکێتیی عێراق بینراوە، بەدەگمەنیش سووریا لە دژی کوردی عێراق کاری کردووە، نموونەی ئەو حاڵەتەش لەساڵی ١٩٧٠دا بوو، کاتێك راپەڕینی کوردی لە کوردستانی عێراق هێزو پشتیوانیی بەدەستهێناو ترسی ئەوە زیادی کرد کە کورد دەستکەوتی گرنگی لە دژی رژێمەکە بەدەستهێناوە، سووریا سەربازەکانی نارد بۆ عێراق بۆ ئەوەی شەڕ لە دژی یاخیگەری کوردی بە سەرکردایەتی مستەفا بارزانی بکەن. بەهەمان شێوە لە ساڵی ٢٠٠٣ دا سووریا پشتگیری سەدام حسێنو حیزبی بەعسی کردو ئیدانەی بەشداریی کوردو هاوپەیمانیی لەگەڵ هێزەکانی هاوپەیمانیاندا کرد. ئەمڕۆ لە هەموو کات زیاتر کوردی عێراق لەلایەن سووریاوە وەك هەڕەشە بۆ جێگیریو یەکێتیو ئاسایشی ئەو وڵاتەو هاوسەنگی هێزی هەرێمی دەبینرێت. بەم شێوەیە پێگەی سووریا سەبارەت بە حیزبە سیاسییە کوردییەکانی عێراق تا رادەیەك دوو لایەنە بووە. لەلایەك ئایدیای (دوژمنی دوژمنەکەم دۆستی منە) حیزبە سیاسیە کوردییەکانی عێراق و حکومەتی سووریای گەیاندۆتە پەیوەندییەکی ستراتیجی، لە لایەکی ترەوە کوردی عێراقو باردۆخی کوردستانی عێراق سەلماندویانە کە بوونەتە ناوچەیەكو جێگەی گرنگیدانی دەسەڵاتی سووریان. ترسی ململانێی نەژادی و تایفی لە سووریاو پێشکەوتنی دەسەڵاتی کوردی بەهێزو دانپیانراو لە باکووری عێراق رەنگە کاریگەریی لەسەر دانیشتوانە کوردەکەی هەبێت. خەمی

حکومەتی سووریا لەبارەی پێگەو توانای گروپە کوردییەکانی، کە لەلایەن (پەناگەی ئارام )ەوە پارێزگاری دەکرێن، لە باکووری عێراق‌وبەهۆی هەڕەشەی داگیرکردنی عێراق بە سەرۆکایەتی ئەمریکا لە دژی سەدام حسێن‌و رژێمی بەعس زیادی کردووە. ترسی هەر زیادبوونێکی توانای کوردی عێراق رۆڵی گرنگ لە بیرکردنەوەی حکومەتدا دەگێڕێت‌و فاکتەرێکی گرنگی سیاسەتی ناوخۆ و دەرەوەیەتی. لەوەش زیاتر، سەرەڕای پەیوەندی خراپی نێوان عێراق و سووریا لە رابوردوودا، کاتێك سەروەریی یان یەکێتیی عێراق لەبەردەم هەڕەشەدا بووبێت سووریا پشتیوانی بەرچاوی پێشکەشی عێراق کردووە.

## کوردستانی سووریا و عێراق

دوابەدوای جەنگی کەنداوی ساڵی ۱۹۹۰ و کشانەوەی سوپای عێراق لە کوەیت، راپەڕینی جەماوەری لە سەرانسەری عێراقدا روویدا. راپەڕینەکانی ئازاری/۱۹۹۱ بە بانگەشەکانی ئەمریکا و پێشنیازەکانی، کە داوای دەکرد پێویستە خەڵکی عێراق بە دەستی خۆیان ئەرکەکانی خۆیان ئەنجام بدەن، هاندران. هەرچەندە شکستی ئەمریکا لە پێشکەشکردنی پشتگیریی دەرەکی بۆ راپەڕینەکانی شیعە لە باشوورو کورد لە باکوور بووە هۆی ئەوەی لەلایەن هێزەکانی سەدام حسێنەوە خاپوور بکرێن‌و قەیرانێکی پەناهەندەیی دیاردەئاسای لێبکەوێتەوە. دوای دەستپێکردنی لە ۲۸/ ئازار/۱۹۹۱دا، کوردەکانی عێراق لەلایەن رژێمی بەعسی عێراقەوە کەوتنەبەر شاڵاوێکی توندی سەرکوتکردن. ئەم هێرشە وێرانکەرە سەربازییە بۆ سەر ناوچەکانی کوردستان، کە وابەستە بوو بە یادەوەریەکانی ئەنفال‌و هێرشی کیمیاوی بۆ سەر هەڵەبجە لە ساتەکانی کۆتایی جەنگی ئێران- عێراقدا، بووە هۆی ئەوەی هەزاران هاوڵاتی کورد بەرەو تورکیاو ئێران هەڵبێن. لە ماوەی (٤٨) سەعاتی یەکەمی هەڵمەتەکەدا، نزیکەی (١,٨٥٠,٠٠٠) کەس ئاوارە بوون، کە هەموویان بە ناچاری

ماڵو حاڵیان بە جێهێشتبوو. بەشێکی زۆریان چوونە ناو خاکی تورکیا و ئێرانەوە،[397] هەزارانی تریشیان لە ناوچە سنوورییە شاخاویەکانی عێراق گیریان خواردبوو.

خەمی تورکیا لەسەر هاتنی بەلێشاوی ئاوارەی کوردی عێراق بۆ ناو خاکەکەی و ئەو کاریگەرییەی کە لەوانەبوو لەسەر جێگیریی ناوخۆی ناوچە کوردییەکان هەیبێت، وایکرد سنوورەکانی دابخاتو رازی نەبوو، کە مافی پەنابەریی بە هیچ کوردێکی عێراقی بدات. هەریەك لە تورکیاو ئێران نەیاندەتوانی یان نەیاندەویست لەگەڵ ئەو ژمارە پەناهەندەیەی لە ماوەیەکی کورتدا هاتبوونە ناو خاکەکەیانەوە، هەڵبکەن. کەموکورِی لە ئامادەکاری و داخستنی سنووری تورکیا لەگەڵ عێراقو رێگەنەدانی تورکیا بەوەی لە خاکی ئەوەوە یارمەتی مرۆیی نەتەوەیەکگرتووەکان بگاتە کوردەکانی عێراقو ئەو بارودۆخە سەخت و پڕ کەموکورتییەی ئاوارەکان هەموویان بوونە هۆی قەیرانێکی مرۆیی کە تیایدا بە هۆی سەرماو نەخۆشیو بێ نانییەوە چەندین کەس گیانیان لەدەستدا. کاتێکیش قەیرانەکە زیادی کرد، دەنگۆی مردنی هەزاران کەس رۆژانە لە هەندێك لە کامپەکاندا شتێکی باو بوو، هەروەها گرنگی و کتوپڕیی بارودۆخەکە دواجار وایکرد کە کۆمەڵی نێودەوڵەتی هەڵوێست وەربگرێت.[398]

هەڵوێستەکانی تورکیاو قەیرانە مرۆییەکە لە ئەنجامدا بوونە هاندەر بۆ دامەزراندنی (پەناگەی ئارام) لە باکووری عێراقو ناوچەی دژەفڕینی باکوور پێشنیازی دامەزراندنی چەند ناوچەیەکی پارێزاوی بۆ کوردەکان لە چوارچێوەی خاکی عێراقدا، کە لە سەرەتادا لەلایەن دەسەڵاتی تورکییەوە وەك هەوڵێك خرایە روو بۆ رەواندنەوەی ئەو گوشارەی لەسەر سنوورەکانی هەبوونو رێگرتن لە ئاگرخۆشکردنی بەرهەڵستی لە ناوچە کوردییە هەستیارەکانی تورکیادا پێشنیاز کرابوو. روون نییە کە ئایا ئیدارەی هاوپەیمانان لەبەر قەیرانی مرۆیی ئەو کارەیان کرد یان زیاتر جێبەجێکردنی ئەو حەزە

---

[397] زیاد لە ٤٥٠,٠٠٠ ئاوارەی کورد گەشتنە تورکیا و سەر سنوورەکانی تورکیا-عێراق، بەڵام ١,٤٠٠,٠٠٠ کورد لە ئێران بوونە پەناهەندە، بە پێی راپۆرتی نوێنەری نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ کاروباری پەناهەندەیی، کە ئەمە لەماوەی ٤٠ ساڵی رابردوودا وێنەی نەبووە. کوك ١٩٩٥: ٣٧-٣٨

[398] کورك ١٩٩٥: ٣٦

بوو کە دەیویست خەمەکانی تورکیا لە بارەی ئەو قەیرانە و کاریگەریی لەسەر جێگیریی ناوخۆ نەهێڵێت.

لە ١٩٩١/٤/٥دا، نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری (٦٨٨)ی دەرکرد کە تایبەت بوو بە مامەڵەکردن لەگەڵ سەرکوتکاری حکومەتی عێراق لەدژی هاوولاتییەکانیو جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی چەوساندنەوەی هاولاتییە عێراقییەکان هەڕەشەیەك بوو بۆ سەر ئاشتیو جێگیریی ناوچەکە.[399] بڕیارەکە ڕێگەی بە نەتەوەیەکگرتووەکان دا کە کار لەدژی سەرکوتکاری هاولاتیانی عێراق بکاتو بڕیارێك بۆ یارمەتی مرۆیی لە ناو خاکی عێراقدا دەربکات. ئەم بڕیارە بناغەی دامەزراندنی پێگەی ئارامی باکووری لە عێراق داناو نەتەوە یەکگرتووەکانیش کۆنترۆڵی ناوچە سنوورییەکانی خاکی عێراقو کشانەوەی هێزەکانی عێراقو دواتریش دامەزراندنی ناوچەی دژە فڕینی باکووری هێڵی (٣٦)و پیشکەوتنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردی کرد.[400]

دوابەدوای دامەزراندی پەناگەی ئارام و کشانەوەی حکومەتی ناوەندی عێراقو کۆنترۆڵی لە باکووری عێراق، هەردوو سەرکردەی کورد مەسعود بارزانیو جەلال تالەبانی بۆ گفتوگۆکردن لە بارەی وەرگرتنەوەی کەرکوكو مەندەلیو خانەقین بۆ سەر ناوچە ئۆتۆنۆمیەکە، بۆ بەغدا چوون. هەرچەندە دواتر شەڕ لە نێوان ئەمانو هێزەکانی حکومەتدا دەستیپێکردو پاشانیش حکومەت ئابلۆقەیەکی ناوخۆیی بەسەر کوردی باکووردا سەپاند.

لە مانگی مایسی/١٩٩٢دا هەڵبژاردن لە کوردستانی عێراقدا ئەنجامدرا. ئەنجامی دەنگەکان تا رادەیەك بە یەکسانی لە نێوان هەردوو حیزبە سیاسییە کوردییە سەرەکییەکەدا کە ئەوانیش حیزبی دیموکراتی کوردستانو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوون، دابەش بوو بوو. هەردوو سەرۆك پێکەوە لە حکومەتی هەرێمی کوردستانی تازە پێکهێندراودا حکومڕانیان کرد. هەرچەندە لە راستیدا بە پێی کۆنترۆڵیان بە شێوەیەکی ناوخۆیی ناوچەکانیان دابەشکرابوون کە ئەوەش بەپێی دیمۆگرافیاو بنکەو پشتگیری جەماوەرییان بوو. ساڵی ١٩٩٤ پەرتبوون لە ئاستی

---

[399] کووك ١٩٩٥: ٣٧

[400] فاروق سلاوگلیێت و سلاوگلیێت ٢٠٠١: ٢٩٥

کەسایەتی‌و سیاسی‌و ئابوورییەکانداو لە جەنگێکی نێوان ئەو دوو حیزبە کوردییەدا قوڵ بووەوە، گرژی و ئاڵۆزیش تا ساڵی ١٩٩٨ درێژەی کێشا. گرژییەکان بە جۆرێك زیادیان کرد کە لە ساڵی ١٩٩٦دا یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان هێزەکانی ئێرانی بۆ ناوچەکانی ژێردەستی خۆی بانگهێشت کردو حیزبی دیموکراتی کوردستانیش لە مانگی ئابدا داوای هاوکاریی لە بەغدا کرد.[٤٠١]

لە ساڵی ١٩٩٨دا رێککەوتنی نێوان ئەو دوو حیزبە کۆتایی بە جەنگی ناوخۆ لە کوردستانی عێراقدا هێنا.[٤٠٢] هەردوو لا لەسەر ئەوە رێکەوتن کە واز لە توندو تیژی بهێنن‌و بۆ هاوکاری دەرەکی لە دژی یەکتر نەگەڕێن. ئاشتی لە نێوانیاندا پارێزراو بوو لە ئاکامیشداو بە رووخانی رژێمی بەعسی عێراق لە نیسانی/٢٠٠٤دا، سیاسەتمەدارانی کورد بەشێکی دانەبڕاویان لە حکومەتی کاتی‌و گفتوگۆکان لەبارەی داهاتووی عێراقەوە پێکهێنا، ئەمەش پشێوییەکی زۆری لەو دەوڵەتانەی کە کورد کەمایەتییەکی گرنگە تیایاندا دروستکرد. رادەی هێزی کورد لە حکومەتی داهاتووی عێراق‌و کۆنترۆڵیان بەسەر ناوچە کوردییەکانی باکووردا لە ناوخۆی عێراق‌و بۆ هەریەك لە سووریاو تورکیاو ئێران، جێگەی نیگەرانییە.

حکومەتی سووریا لە ساڵی ١٩٩١دا دژی ئەوە نەبوو کە پێگەی ئارام لە باکووری عێراقدا دابمەزرێندرێت. هەروەك سووریا لە جەنگی یەکەمی کەنداو لە ساڵی ١٩٩١دا ئەندامی هێزەکانی هاوپەیمانان بوو، ئامانجیشی بە شێوەیەکی ئاشکرا ئەوە بوو کە هەڕەشە جدیەکانی وڵاتانی دراوسێ‌و رژێمی بەعسی رکابەری لە عێراق کەم بکاتەوە. پەیوەندییەکانی لەگەڵ حیزبە کوردییەکانی باکووری عێراق راشکاوانە بوو، هەروەها سنوورەکانی بۆ دیپلۆمات و نوێنەرە سیاسییەکانیان والاکردبوو. کیانی کوردی لە باکووری عێراق، وەك کیانێك کە دەسەڵاتی لە بەغدا لاواز کردوو هێشتا بۆ گەیشتن بە جیهانی دەرەوە، بە شێوەیەکی بەرچاو پشتی بە خواستی باشی دەوڵەتانی دراوسێ دەبەست، سەرەڕای شوناسی کوردییان وەك هەڕەشەی راستەقینە بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی سووریا نابینرێن.[٤٠٣] لە ئاستی نێودەوڵەتیدا دۆزەکەیان دانی

---

[٤٠١] فاروق سلارگلێت و سلارگلێت ٢٠٠١: ٢٩٩

[٤٠٢] هەمان سەرچاوە

[٤٠٣] چاوپێکەوتنێك لەگەڵ دلشاد میران نوێنەری پ.د.ك لە بریتانیا، لەندەن، ٢٠٠٤/١/٢٧

پێدانەنراوەو بێدەنگی دەوڵەتانی رۆژئاوا لە بارەی داهاتوونیانەوە وایکردووە حکوومەتەکانی سووریاو تورکیا نەترسن لەوەی بارودۆخی ئێستای عێراقو کوردستانی عێراق گۆڕانی بەسەردا بێت. بوونی پێگەی ئارامو ئابلۆقە نێودەوڵەتییەکانی سەر عێراق مانای ئەوە بوو کە هێزەکانی ئەمریکاو ئەوانی تر نەیاندەویست لەدوای کشانەوەی هێزەکانی سەدام حسێن لە کوەیت، مانەوەیان لە عێراق بپارێزن. بەو پێیەی لاوازیی رژێمی بەغدا یەکێك لە سنوورەکانی سووریای پاك کردەوە، کە بە هەڕەشەیەکی دەرەکی بەردەوام دادەنرا، هاوسەنگیی هێزی هەرێمی لە بەرژەوەندی سووریادا بوو.

جەنگی عێراقی ساڵی ٢٠٠٣ سووریای خستە بەردەم کۆمەڵێك کێشەی جیاوازی بەیەکداچوو، هەریەك لە رووخانی رژێم لە بەغداو بوونی ئەمریکا لە عێراقو پرسەکانی هاوپەیوەند بە داهاتووی هەیکەلی کۆمەڵایەتیو ئابووریو سیاسیی عێراق لە دژی ئامانجە ناوخۆیو هەرێمییەکانی سووریا بوون. دیزاینی ئەمریکا بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دووبارە دیاریکردنی باری ئێستاو دواتریش دروستکردنی هەڕەشەی نوێ بوو بۆ سەر سنووری رۆژهەڵاتی سووریا.

زیادبوونی گوشارەکانی ئەمریکا بۆ سەر سووریا، لە نێوانیاندا تۆمەتبارکردنی سووریا بە بوونی پەیوەندی لەگەڵ رژێمی پێشووی عێراقو تیرۆریزم، لێکدانەوەکانی سووریای لە بارەی ئەو هەڕەشانەی وجودی سەربازی ئەمریکا لە عێراقو رژێمی عێراق کە لە لایەن ئەمریکاوە پشتگیری دەکرێت چڕتر کردەوە.

لە پاڵ ئەو ترسە گشتییانەی کە تەدەخولی ئەمریکاو گۆڕینی رژێم لە عێراق بۆ سەر ئاسایشی رژێمی سووریا دروست بووبوون، کوردانی باکوور بوونە جێگەی ترسی گەورەی دەسەڵاتی سووریا، هیوای دروستبوونی دەوڵەتێکی کوردیی خاوەن سەروەری لە لای سووریاو تورکیاو ئێران هەرگیز قابیلی قبولکردن نییە، ئەمەش لەبەر بەشە کوردییەکەی خۆیانو ئەو نموونەیەی کە دابەشبوونی ناوچەکانی دەوڵەتێکی خاوەن سەروەری دروستی دەکات. بەداگیرکاری هاوپەیمانان لە عێراقو رووخانی رژێمی بەعس، حەقیقەتی سیاسی بارودۆخەکە گۆڕا. هەلی خۆبەڕێوەبردن لە هەرێمێکدا و لە چوارچێوەی عێراقێکی فیدراڵدا بۆ ماوەیەکی زۆرە لە بازنەی سیاسی کوردیدا گفتوگۆی لە بارەوە کراوە، بەڵام پێشتر وەك حەقیقەتێکی سیاسی نەبینراو بووە.

لەگەڵ تێکچوونی بارودۆخی ئاسایش لە عێراق و گفتوگۆ لەبارەی دابەشکردنی دەسەڵاتە سیاسی و ئیدارییەکان لەو وڵاتە، خەمی ڕاگەیاندنی کوردستانێکی سەربەخۆ لە باکووری عێراق زیادی کردووە. بە لای سووریاوە جەنگی عێراق و دواتریش ڕێکخستنەوەی حکومەتی عێراق ترسی زۆری لە کاریگەریی خراپیان لە ناوچەکانی خۆیدا دروستکردووە، لەوانە داوای جوداخوازەکان و زیادبوونی داواکارییەکان بۆ مافە نەتەوەییەکان و گواستنەوەی دەسەڵات بۆ کورد.

لە دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس لە عێراقدا، پەیوەندییەکانی سووریا لەگەڵ حیزبە سیاسییە کوردییەکانی کوردستانی عێراق ساردییان بەخۆوە بینیووە.[404] بۆ حیزبە کوردییەکانیش، بە ڕووخانی ڕژێمی بەعس لە عێراق و کرانەوەی کەناڵە دیپلۆماسییەکان لە ناو عێراقدا، بەوە سووریا بەشێکی زۆری گرنگیەکانی پێشووی لە دەستداوە، چونکە کاتێك سنوورەکانی عێراق داخرابوون و بەهۆی ڕژێمی توندوتیژو حکومەتی پێشووی عێراقەوە دوورە پەرێزخرابوون، سووریا بۆ ئەوان وەك ڕێڕەوی پەیوەندی لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا وابوو. لە کاتێکیشدا ڕۆڵیان لە کاروباری سیاسی کوردی – عێراقیدا کەم بووەوە، حیزبی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان هەردووکیان نووسینگەو نوێنەرایەتییان لە دیمەشق هێشتەوە. پاشان سنووری نێوان سووریا و کوردستانی عێراق لە دیوی کوردستان و سووریاشەوە داخرا.[405]

بەهۆی بەرزبوونەوەی بانگەشەو هاشەوهوشەی ناسیۆنالیستی عەرەبی و وەستانەوەی ڕژێمی سووریا لە بەرامبەر پێشنیازی دامەزراندنی فیدرالیزمێکی ڕەسمی لە عێراق و حکومەتێکی کوردی خۆبەڕێوەبەر، پەیوەندییەکانی نێوان کوردی عێراق و سووریا ڕووی لە خراپی کرد. لەبەر ئەوەی بەلای دیمەشقەوە دوو لایەن بۆ کاروباری ناوخۆی سووریا خەمی گەورەبوون، دەسەڵاتی سووریا پەیوەندییەکانی لەگەڵ حیزبە سیاسییە کوردییەکانی عێراق و ئەندامانی ئەنجومەنی حوکمی کاتی لە عێراقدا پاراست. لە کۆتایی نۆڤەمبەری/٢٠٠٣دا، هەواڵی ئەوە بڵاوبۆوە کە چالاکییەکانی کوردانی عێراق لە سووریا کۆت و بەندی خراوەتە سەر، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا یەکێتی

[404] چاوپێکەوتنێك لەگەڵ دلشاد میران نوێنەری پ.د.ك لە بریتانیا، لەندەن، ٢٠٠٤/١/٢٧
[405] چاوپێکەوتنێك لەگەڵ دلشاد میران نوێنەری پ.د.ك لە بریتانیا، لەندەن، ٢٠٠٤/١/٢٧

نیشتمانی کوردستان نکوڵی لەوە دەکرد کە نووسینگەکەیان لە دیمەشق داخرابێت یان کۆت وبەند لەسەر چالاکی لێپرسراوەکانیان لە سووریادا دانرابێت. ئەم دەنگۆیە بە دوای ئەوەدا هات کە وەزیری دەرەوەی سووریا جەلال تالەبانی بەوە تۆمەتبار کرد کە کوردی عێراق تەنیا لایەنێك بوون لە پاڵ ئەمریکاو ئیسرائیلدا سودیان لە جەنگی عێراق بینیوە.[٤٠٦]

بە دەستپێکردنی جەنگی عێراقو دوای ئەوەی کورد لە جەنگەکەدا هاوکاریی هێزەکانی هاوپەیمانانی کرد، ئیدی کورد وەك دوژمن تەماشا کراوەو وەك خیانەتکاریش بوونەتە ئامانج. ئاگری ناسیۆنالیزمی عەرەبی، بەو باوەڕەی کە ئەمە دەستێوەردانی ئیمپریالیستی رۆژئاوایە لە رۆژهەلاتی ناوەراستو عێراق، بلێسەی سەند. ژمارەی ئەو کوردانەی بە هۆکاری سیاسی یان کولتووری لە سووریا دەستگیردەکرێن، لە سەرەتای جەنگی عێراقەوە، زیادی کردووە. پەیوەندیی کورد بەو هاوپەیمانییەی ئەمریکا سەرۆکایەتی دەکردو بەشدارییان لە داگیرکاری عێراقدا، وەك بەڵگەیەك پێشنیازی ئەوەی دەکرد کە کوردی سووریاش بە هەمان شێوە دەکەونە ژێر کاریگەریی ئەوەوە.

گومانی تێدا نییە کە دامەزراندنو پێشکەوتنی هەرێمی ئۆتۆنۆمی کوردی لە باکووری عێراقدا بە درێژایی ساڵانی نەوەدەکان، هیوای بە کوردی ناوچەکەو دەرەوەش بەخشی. هەروەك بە شێوەیەکی گشتی بووە سەرەتای گۆڕانێکی گرنگ لە پرسی کورددا. ئەمە جگە لەوەی بۆ باشکردنی بارودۆخی کورد لە لای دەوڵەتەکانی تریش، هاوکار بووە. دەستکەوتەکانی کوردستانی عێراق بە درێژایی ساڵانی نەوەدەکان دڵنیاییو لەخۆڕابینینی بە رێکخراوە سیاسیو کولتوورییە کوردییەکانی ترو دانیشتوانی کورد بە شێوەیەکی گشتی بەخشیوە. بەو شێوەیە، حیزبە سیاسییە کوردییەکان لە سووریا بە شێوەیەکی بەرچاو چالاك بوونو خۆپیشاندانی کەم، بەڵام بەربلاوییان لەسەر نارەزاییەکانیانو خستنە رووی داواکانیان بۆ مسۆگەرکردنی مافەکانی مرۆڤو مافە کولتوورییەکان لە چوارچێوەی دەوڵەتی سووریادا، ئەنجام داوە. هەریەك لە حیزبی دیموکراتی کوردستانو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان سیاسەتی دەستوەرنەدان لە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتانی دراوسێدا پەیڕەو دەکەن. بەڵام هێشتا

---

[٤٠٦] اخبار الشرق، ٢٠٠٣/١١/١٠

بەهێزیو مانەوەی ئەم دوو حیزبە ماناى ئەوەیە کە رووداوەکانی عێراقو تورکیا بە شێوەیەکی سروشتی کاریگەریی لەسەر خەونی سیاسی کوردی سووریا هەیە. لە ئێستادا رووداوەکانی عێراقو نوێبوونەوەی گوشارە نێودەوڵەتییەکانی سەر سووریا دووبارە هیوای کوردی لە سووریا هانداوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا سەرکوتکردنی چالاکی حیزبە سیاسییەکانو هەوڵی نیشاندانی شوناسی کوردی نوێ بووەتەوە.



# بەرئەنجام

ئەم کتێبە ئەوە دەردەخات، کە کوردی سووریا کەرەستەی فۆرمێکی تایبەتی رەگەزپەرستی و سەرکوتکردنن، کە لەوە تێپەڕیوە بەرهەمی دیکتاتۆری بێت و بەسەر سەرجەمی دەوڵەتەکەدا جێبەجێ بکرێت. کورد لەسەر بنەمای شوناسی نەتەوەییان کە دەوڵەت ناتوانێت لەگەڵیدا هەڵبکات جیاوازییان لە دژ دەکرێت. رۆژانە لە سووریا پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤی کورد روودەدەن و ئەو پێشێلکاریانەن کە دژی یاسا نێودەوڵەتییەکانی مافی مرۆڤ و یاسای ناوخۆی سووریان.

لە سەرەتای دەسەڵات گرتنە دەستی بەشار ئەسەد لە ساڵی ٢٠٠٢دا، رووداوە هەرێمی و نێودەوڵەتییەکان پێگەیەکی باشیان بۆ سووریا لە بەرامبەر ئەمریکا و رووداوەکانی داهاتووی عێراق دەستەبەر کردووە. هەروەك کاریگەری گرنگیان لەبارەی سیاسەتی دەرەوەی سووریا و سیاسەتی ناوخۆی بەرامبەر بە کورد هەیە. ئامانجە باسکراوەکانی کۆمەڵی نێودەوڵەتی کە لە جەنگی دژە تیرۆر و جەنگی عێراقدا خراونەتەڕوو، پەیوەندییەکانی سووریای لەگەڵ دەوڵەتانی رۆژئاوا، بە تایبەتی لەگەڵ ئەمریکا و لە ئاکامیشدا لەگەڵ دراوسێکانیدا دیاری کردووە. بە گۆڕانی سیاسەتی ئەمریکا لە "سەرقاڵبوونی بنیاتنەر"یەوە لەگەڵ سووریا بۆ داواکردنی ئاشکرا بۆ بەرپرسیارێتی سووریا و پابەندبوون بە ئەجێندای نوێی ئەمریکا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و گەمارۆدانی (SALSA)، سووریا هێنراوەتە بەرەی پێشەوەی پەیوەندییەکانی رۆژئاوا لەگەڵ ناوچەکەدا.

رووداوەکانی عێراق و جەنگی دژە تیرۆری ئەمریکا لێکدانەوەکانی رژێمی سووریایان زیادکردووە، کە سووریا لەژێر هەڕەشەی وڵاتانی دراوسێ و هێزەکانی رۆژئاوادایە و ئەو هێزانە لەگەڵ بەرهەڵستکارە ئاژاوەگێڕە سیاسییەکانی ناو دەوڵەتدا لە کاردان. پەیوەندیی کورد لەگەڵ دەوڵەتانی دراوسێدا و هاوکاریی حیزبە سیاسییەکانی کوردستانی عێراق بۆ هێزی هاوپەیمانان لە کاتی جەنگی عێراقدا ئەو

بیرۆکەیەی تۆختر کردەوە، کە کورد هەڕەشەیەکی گەورەن بۆ سەر دەوڵەت و ڕژێم. لێکدانەوەی زیادبوونی هەڕەشەکان وایکردووە، کە توندڕەوانی ناو ڕژێمەکە بەهێز بن و پرۆسەی دیموکراسی پەك بخەن. بۆ کوردی سووریا، کاریگەریی ئەوە وایکردووە بکەونە ژێر چاودێری زیاتر و ببنە کەرەستەی ڕێوشوێنی دڕندانە بە بیانووی پاراستنی یەکێتیی دەوڵەت و نەتەوەی عەرەبەوە. زیادبوونی ژمارەی گیراوە کوردەکان لەم چەند مانگەی دواییدا و توندکردنی کوت و بەندەکانی سەر پەیڕەوکردنی کولتووری کوردی گەواهیی ئەوە زیاتر دەدەن، کە توندڕەوان دەسەڵاتی خۆیان بەسەر وڵاتەکەدا توندتر دەکەنەوە و ریفۆرم لە سووریا بە هیچ شێوەیەك دیموکراتیزە نییە.

لە ئاستی ناوچەییدا، هەریەك لە سووریا و عێراق و تورکیا و ئێران، کوردیان وەك ئامراز لە دژی دراوسێکانیان بەکارهێناوە و لە هەمان کاتدا پێکەوە کاردەکەن بۆ ڕێگرتن لە دەستکەوتەکانی کورد لە هەر دەوڵەتێکدا بێت لەسەر ئەو بنەمایەی کە دەستکەوتەکان کاردەکاتە سەر داوا و خەونی کورد لە دەوڵەتێکی تردا.

پشتیوانی کوردی عێراق بۆ هێزی هاوپەیمانان لە داگیرکردنی عێراقدا و بەشداربوونی کوردی عێراق لە ناوەندی پرۆسەی سیاسی بۆ بڕیاردان لەسەر داهاتووی عێراق، سیاسەت و سۆزی دژە کوردی لە چوارچێوەی ڕژێم لە سووریا و لە نێو عەرەبی زۆرینەدا زیاد کردووە. بە هەمان شێوەش، دڵنیایی کورد لە تواناکانیان بۆ قسەکردن لەسەر ساڵانێك سەرکوتکردن زیادی کردووە و لە چەند دەرکەوتنێکی دەگمەنیشدا ئەمەیان نیشانداوە، وەك خۆپیشاندانەکەی ئازاری/ ٢٠٠٤ و مانگرتنی گیراوە کوردەکان لە دیسەمبەری/٢٠٠٤دا، هێشتا ڕووداوەکانی ئازاری ٢٠٠٤ و هەڵمەتەکانی دەستگیرکردنی کورد، کە بە دوای ئەوەدا هاتوون، بە ئاشکرا ئەو ڕێوشوێنانە نیشان دەدەن، کە ڕژێم بۆ سەرکوتکردنی دەربڕینی ناڕەزایی، ئامادەیە بیانگرێتە بەر.

لە ساڵانی دەسەڵات گرتنە دەستییەوە، بەشار ئەسەد هەمان هەستی نیشانداوە بۆ پیادەکردنی سیاسەتی ناوخۆ و دەرەوەی پلان داڕێژراو، بەڵام بە ئاگاو کردەیی لە بەردەم زیادبوونی گوشارە دەرەکی و هەرێمی و ناوخۆییەکان، مامەڵەی ئەسەد لەگەڵ کورددا دوو دیوی هەبووە، لە لایەك وتار و لێدوانە دۆستانەکانیەتی لەبارەی کورد و بەڵێندان بۆ قسەکردن لەسەر کێشەکانیان، لە لایەکی تریشەوە

سیاسەتی بەردەوامی ڕژێمە بۆ بە تاوان نیشاندانی مافە کولتووری و سیاسییەکانیان و دەستگیرکردن و ئەشکەنجەدانی ئەوانەی هەوڵ دەدەن شوناسی خۆیان لە دەوڵەت داوا بکەنەوە. زیادبوونی بێمتمانەیی کورد کە لەم ساڵانەدا نیشاندراوە و زیادبوونی دەستگیرکردنی کورد و کۆت و بەند خستنەسەر چالاکییە کولتووری و سیاسییەکانیان لە سووریا، ئەوە نیشان دەدات، کە مەیلی خەڵك بە گشتی بۆ هەڵکردن لەگەڵ کورددا هێشتا جێگەی بایەخ نییە.

## Bibliography


Ahmad, Muhammad Mulla 1988: *Safhat min tarikh haraka al-taharur al-wataniy al-kurdiyya fi Suriya: 1957–1965* [Arab.: Pages from the history of the Kurdish national liberation movement in Syria]. No place: no publisher.

Ahmad, Muhammad Mulla 2001: *al-Qadayya al-kurdiyya fi Suriya* [Arab.: The Kurdish issue in Syria]. Berlin: Havîbun.

*Akhbar al-Sharq*, 11 March 2003: *al-Asad yantaqad al-mu'arada al-suriyya wa yatahamha bil-intihaziyya wa isaa'a fahama al-dimuqratiyya* [Arab.: al-Asad criticises the Syrian opposition and accuses them of exploitation and of misunderstanding democracy]. <http://www.thisissyria.net/2003/03/11/syria&lebanon.html> (visited 30 March 2003).

*Akhbar al-Sharq*, 10 November 2003: *Tawatur mutasa'id bayna dimashq wa 'awal ra'iys kurdi li majlis al-hukm al-itiqal al-'Iraq.* [Arab.: Tension escalates between Damascus and the first Kurdish head of the interim governing council of Iraq]. <http://www.thisissyria.net/2003/11/10/syria&lebanon.html>.

Amnesty International (AI) 2001: *Annual report: Syria.* <http://web.amnesty.org/web/ar2001.nsf/webmepcountries/SYRIA?OpenDocument> (visited 8 June 2002).

Amnesty International (AI), 4 September 2003: *Urgent action. Syria: fear of torture or ill-treatment/possible prisoner of conscience/legal concern* (MDE 24/032/2003). <http://web.amnesty.org/library/index/engmde/240322003>.

Amnesty International (AI), 11 November 2003: *Urgent action. Syria: incommunicado detention/fear of torture and ill-treatment* (MDE 24/042/2003). <http://web.amnesty.org/library/index/engmde/240422003>.

Amnesty International (AI), 17 June 2004: *Public statement. Syria: Amnesty International repeats its call for the release of five prisoners of conscience held for their peaceful use of the internet* (MDE 24/045/2004). <http://web.amnesty.org/library/index/engmde/240452004>.

Amnesty International (AI), 29 June 2004: *Public statement. Syria: unfair trial of Kurdish prisoners of conscience and torture of children is totally unacceptable* (MDE 24/048/2004). <http://web.amnesty.org/library/index/engmde/240482004>.

Amnesty International (AI), 19 January 2005: *Urgent action. Syria: torture and ill-treatment/possible unfair trial* (MDE 24/003/2005). <http://web.amnesty.org/library/index/engmde/240032005>.

Amnesty International (AI), 18 February 2005: *Urgent action. Syria: further information on torture and ill-treatment/possible unfair trial* (MDE 24/008/2005). <http://web.amnesty.org/library/index/engmde/240032005>.

Anderson, Benedict 1991: *Imagined communities. Reflections on the origin and spread of nationalism*. London: Verso.

Anjarini, Moh'd 2001: »Oppressive laws in Syria (1 of 5). Law of Emergency issued upon the Legislative Act No. 15 on 22.12.1962 by the Council of Ministers in Syria.« *Justice online journal* 1 (October). London: Syrian Human Rights Committee (SHRC).<http://www.shcr.org/data/aspx/d4/354.aspx>.

*Arabic News*, 30 January 2001: »More political parties to be formed in Syria.« <http://www.arabicnews.com/ansub/Daily/Day/010130/2001013014.html> (visited 6 November 2002).

*Arabic News*, 4 September 2002: »Al-nour: A law on political parties to be issued in Syria.« <http://www.arabicnews.com/ansub/Daily/Day/020904/2002090416.html> (visited 6 November 2002).

Article 19 1998: *Walls of silence. Media and censorship in Syria*. London: Article 19.

Aykan, Mahmut Bali 1999: »The Turkish-Syrian crisis of October 1998. A Turkish view.« *Middle East Policy* 6(4), pp. 174–189.

Bedr al-Din, Salah 1999: *West Kurdistan. Syria: The silenced Kurds*. Bonn: Kawa.

Bedr al-Din, Salah 2003: *The Kurdish national movement in Syria*. Erbil: Kawa

Berko, Sîrwanê Hecî, 2 January 2004: »Çawa qaçaxçiyê kurd Macidê Birkî Başûrê-Rojavayî Kurdistanê ji kurdan ›paqij‹ kir û xwe kir dijminê ewropiyan« [Kurd.: How the Kurdish trafficker Macîde Birkî »purged« southwestern Kurdistan of Kurds and made himself a foe of the Europeans]. Amude.com <http://www.amude.net/kurdi/nuce-macide-birki.html>.

Bureau Kurde de Liaison et d'Information (ed.), December 2004: »Un etudiant Kurde condamné à trois ans de prison.« *Bulletin d'information* 30. Brussels, p. 15.

Chaliand, Gerard (ed.) 1993: *A people without a country. The Kurds and Kurdistan*. London: Zed.

Cook, Helena 1995: *The Safe Haven in Northern Iraq. International responsibility for Iraqi Kurdistan*. Essex: University of Essex, Human Rights Centre; London: KHRP.

Dam, Nikolaos van 1996: *The struggle for power in Syria. Politics and society under Asad and the Ba'th Party*. London: I.B. Tauris.

Daoudy, Marwa n.d.: *Water, institutions and development in Syria. A downstream perspective from the Euphrates and Tigris*. The World Commission on Dams <http://www.dams.org/kbase/submissions/showsub.php?rec=env108>.

*Der Spiegel* 1/2004 (29 December 2003): »Menschenschmuggler. Der König der Schleuser.« Hamburg, pp. 36–42.

*Doza Me*, 19 March 2004: »Syrian Kurds fear more clashes at spring festival.« Reproduced from Reuters, Aleppo, Syria. <http://www.dozame.org/article.php?story=20040319004539575> (visited 23 March 2004, website no longer active).

Farouk-Sluglett, Marion & Peter Sluglett 2001: *Iraq since 1958. From revolution to dictatorship*. London: I.B. Tauris.

Fomkin, David 1989: *A peace to end all peace*. London: Penguin.

Gambill, Gary C. 2001: »Syria's foreign relations: Iraq.« *Middle East Intelligence Bulletin (MEIB)* 3 (3). <http://www.meib.org/issues/0103.htm>.

Gambill, Gary C. 2004: »American sanctions on Syria: A diplomatic masterstroke?« *Middle East Intelligence Bulletin (MEIB)* 6 (5). <http://www.meib.org/issues/0405.htm>.

Gellner, Ernest 1983: *Nations and nationalism. New perspectives on the past*. Oxford: Blackwell.

George, Alan 2003: *Syria. Neither bread nor freedom*. London: Zed.

Hersh, Seymour 2004: »As June 30 approaches, Israel looks to the Kurds.« *The New Yorker* (28 June). Available online at <http://www.newyorker.com>.

Heydemann, Steven 1999. *Authoritarianism in Syria. Institutions and social conflict, 1946–1970*. Ithaca, N.Y.: Cornell University Press.

Hilal, Muhammad Talab 1963: *Darasa 'an muhafazat al-jazira min al-nawahi al-qawmiyya wa al-ijtima'iyya wa al-Sayasiyya* [Arab.: Study of the national, social, and political aspects of the province of the Jazira]. No place (Syria): no publisher.

Hinnebusch, Raymond 1990: *Authoritarian power and state formation in Ba'thist Syria: Army, party, and peasant*. Oxford: Westview Press.

Hinnebusch, Raymond 2002: »The foreign policy of Syria«. In: Raymond Hinnebusch & Anoushiravan Ehteshami (eds.): *The foreign policies of Middle Eastern states*. London: Lynne Rienner Publishers, pp. 141–166.

Human Rights Association in Syria (HRAS), November 2003: *The effect of denial of nationality on Syrian Kurds*. Damascus: HRAS. Available online at <http://hras-sy.org/english/reports.htm>.

Human Rights Association in Syria (HRAS), 16 March 2004: *Press release. The situation of Kurds in Qamishli: Summary regarding the events in Damascus over the last few days*. Damascus: HRAS. Available online at <http://hras-sy.org/english/statements.htm>.

Human Rights Association in Syria (HRAS), April 2004: *The Qamishli incidents and their consequences in Syrian cities*. Damascus: HRAS. Available online at <http://hras-sy.org/english/reports.htm>.

Human Rights Watch (HRW) 1991: *Syria unmasked. The supression of human rights by the Asad regime.* New Haven and London: Yale University Press.

Human Rights Watch (HRW), October 1996: *Syria. The silenced Kurds.* New York: HRW. Available online at <http://hrw.org/reports/1996/syria.htm>.

Human Rights Watch (HRW), 7 September 2001: *Dangerous backlash in Syria.* <http://www.hrw.org/press/2001/09/syria090701.htm> (visited 30 March 2003).

Human Rights Watch (HRW) 2002: »Syria.« In: *Human Rights Watch world report 2002*, pp. 466–473. <http://www.hrw.org/wr2k2/mena8.html> (visited 8 June 2002 and 30 March 2003).

Human Rights Watch (HRW), 31 January 2002: *Memorandum to the Syrian government. Decree No. 50/2001. Human rights concerns.* New York: HRW. Available online at <http://www.hrw.org/backgrounder/mena/syria/>.

Human Rights Watch (HRW) 2003: »Syria.« In: *Human Rights Watch world report 2003*, pp. 482–488. <http://www.hrw.org/wr2k3/mideast7.html> (visited 15 January 2003).

International Crisis Group (ICG), 11 February 2004: *Syria under Bashar (II). Domestic policy challenges* (= *ICG Middle East Report* No. 24). Amman and Brussels: ICG. Available online at <http://www.crisisgroup.org/library/documents/middle_east___north_africa/arab_israeli_conflict/syria/24_syria_2_domestic_policy_challenge.pdf>.

Kader, Alan 2001: *The Kurdish cause in western Kurdistan.* London: Western Kurdistan Association & Kurdistan National Congress.

Kaplan, Robert D. 1993: »Syria: identity crisis,« *The Atlantic Online* (February). <http://www.theatlantic.com/issues/93feb/kaplan.htm>.

Kharrat, Raed al- 2001: »Riyad Sayf: Syrian Member of Parliament.« *Middle East Intelligence Bulletin (MEIB)* 3 (3). <http://www.meib.org/issues/0103.htm>.

Kurdish Human Rights Project (KHRP) 2002: *Downstream impacts of Turkish dam construction in Syria and Iraq.* London: KHRP. Available online at <http://www.khrp.org/publish/list02.htm>.

*KHRP Newsline* 23, Autumn 2003: »Syrian authorities return Kurds to Turkey,« p. 2. Available online at <http://www.khrp.org/newsline/newsline23/newsline23.pdf>.

Kurdish News Network TV (KNN TV), 10 June 2004: »Ightiyal ʿaskari kurdi fi al-jaysh al-suri« [Arab.: Assasination of Kurdish soldier in the Syrian army]. <http://www.knntv.net/arabic/arabic_news/qasim_hamid.htm>.

Kurdish News Network TV (KNN TV), 3 August 2004: »Another Kurdish killed under torture.« <http://www.knntv.net/english/news/english030804.htm>.

Kurdish News Network TV (KNN TV), 6 August 2004: »Kurdish lost his life as a result of torture.« <http://www.knntv.net/english/news/shihido60804.htm>.

Kurdish News Network TV (KNN TV), 13 December 2004: »al-Mu'ataqalun al-kurd fi sijn 'adra yanhun adrabhum 'an a-ta'am« [Arab.: The Kurdish detainees in 'Adra prison end their hunger strike]. <http://www.knntv.net/arabic/arabic_news/adra-13-12-04.htm>.

Kurdish News Network TV (KNN TV), 16 December 2004: »al-Lajna al-qanuniya li hizb al-yekiti al-kurdi fi suriya yarud 'ala hizb al wahida al-dimuqrati al-kurdi fi suriya yekiti: al-sujuna' al-kurd inhu adrabahum taht al-t'athib laysa 'an al-tariq al-mufawada« [Arab.: The Legal Committee of the Kurdish Yekîtî Party in Syria responds to the United Democratic Kurdish Party in Syria Yekîtî: The Kurdish prisoners ended their strike under torture not by negotiation]. <http://www.knntv.net/arabic/arabic_news/yekiti-16-12-04.htm>.

Laizer, Sheri 1996: *Martyrs, traitors and patriots. Kurdistan after the Gulf War.* London: Zed.

Lawson, Fred H. 1994: »Syria«. In: Frank Tachau (ed.): *Political parties of the Middle East.* London: Mansell, pp. 500–529.

Mabardi, Roueida, 18 March 2004: »Kurdish unrest in Syria echoes Iraq conflict. Arab diplomats say unrest in Kurdish areas in Syria are chilling sign ethnic tensions may be bubbling over from Iraqi border.« Middle East Online <http://www.middle-east-online.com/english/syria/?id=9312=9312&format=0>.

Mason, Robert Scott 1988: »Government and politics«. In: Thomas Cellolo (ed.): *Syria. A country study.* Washington D.C.: The Federal Research Division, pp. 183–230.

McDowall, David 1996: *A Modern history of the Kurds.* London: I.B. Tauris.

McDowall, David 1998: *The Kurds of Syria.* London: KHRP.

McDowall, David 2000: *A Modern history of the Kurds.* London: I.B. Tauris.

*Middle East Intelligence Bulletin (MEIB)* 2 (2), February 2000: »Syria moves to control Druze religious establishment.« <http://www.meib.org/issues/0002.htm>.

*Middle East Intelligence Bulletin (MEIB)* 2 (11), December 2000: »Sectarian violence erupts in Suweida.« <http://www.meib.org/issues/0012.htm>.

*Middle East Intelligence Bulletin (MEIB)* 5 (1), January 2003: »Intelligence briefs: Syria. Arrest of Hamidi sparks outrage abroad.« <http://www.meib.org/issues/0301.htm>.

Middle East Media Research Institute, 16 December 2002, »Special dispatch. Syria persecutes members of outlawed Kurdish opposition.« <http://www.memri.de/uebersetzungen_analysen/laender/>.

Minerovski 1986: *al-Akrad: mulahazat wa-intiba'at* [Arab.: The Kurds: comments and opinions]. Baghdad: Matba'at al-Nujum.

Nikitine, Basile 1956: *Les Kurdes. Étude sociologique et historique.* Paris. Klincksieck.

Olson, Robert 1995: »The Kurdish question and Turkey's foreign policy, 1991–1995. From the Gulf War to the incursion into Iraq.« *Journal of South Asian and Middle Eastern Studies* 19(1), pp. 1–30.

Olson, Robert 1997: »Turkey-Syria relations since the Gulf War: Kurds and water.« *Middle East Policy* 5(2), pp. 168–193.

Perthes, Volker 1995: *The political economy of Syria under Asad.* London: I.B. Tauris.

Pipes, Daniel 1990: *Greater Syria: the history of ambition.* Oxford: Oxford University Press.

Qamislo.com, 8 January 2004: »al-'Amn al-siyasi yamna' al-fanan Rashid Sofi min al-ghuna' layla ra's al-'am al-jadid: mamnu'a al-ghuna' bil-lugha al-kurdi« [Arab.: Political security forbids the artist, Rashid Sofi, from singing on New Year's Eve: Singing in the Kurdish language forbidden] <http://www.qamislo.com/2004/pencerok/> (site no longer active).

Richards, Alan & John Waterbury 1998: *A political economy of the Middle East.* Oxford: Westview.

Robins, Philip 2003 *Suits and uniforms. Turkish foreign policy since the Cold War.* London: Hurst & Co.

Savelsberg, Eva & Siamend Hajo 2004: *Die Situation staatenloser Kurden in Syrien.* <http://www.fluechtlingsrat-nrw.de/1868/>.

Seale, Patrick 1988: *Asad of Syria. The struggle for the Middle East.* London: I.B. Tauris.

Serhildanaqamislo.com, 15 March 2004: »Wazir al-i'alam al-suri: la mushkila kurdiya fi suriya wa li akrad, inama akrad arab« [Arab.: Syrian minister of information: There is no Kurdish problem in Syria and there are no Kurds, the Kurds are Arabs]. <http://www.serhildanaqamislo.com>.

Serhildanaqamislo.com, 2 June 2004: »Fi khatwa jadid li qama' al-nashat al-kurdi, al-sultat al-suri tatlub min al-ahzab al-kurdiya taruk al-'amal al-siyasi wa al-tahawul ila jamiy'at thaqafiya« [Arab.: In a new step in the oppression of Kurdish activists, the Syrian authorities demand that the Kurdish parties abandon their political work and transform into cultural associations]. <http://www.serhildanaqamislo.com/pencere1/Enuce_.php?g_nr=10166>.

Serhildanaqamislo.com, 3 June 2004: »al-Ba'th al-suri yamna' nashat jamia' al-ahzab al-kurdiya« [Arab.: The Syrian Ba'th bans the activities of all Kurdish parties]. Reproduced from Reuters, Beirut. <http://www.serhildanaqamislo.com/pencere1/Enuce_.php?g_nr=10169>.

Serhildanaqamislo.com, 3 June 2004: »al-Sulta al-suriya tastamr fi istida' mas'uli al-ahzab al-kurdiya li iblaghha qarar mana' nashat ahzabha« [Arab.: The Syrian authorities continue to call on representatives of Kurdish parties to inform of the decision to ban the activites of the parties]. <http://www.serhildanaqamislo.com/pencere1/Enuce_.php?g_nr=10168>.

Serhildanaqamislo.com, 16 June 2004: »al-ahzab al-kurdiya fi suriya tathada qrar al-hathr« [Arab.: The Kurdish parties in Syria challenge the restriction decision]. <http://www.serhildanaqamislo.com/pencere1/Enuce_.php?g_nr=10233>.

Syrian Human Rights Committee (SHRC), 18 February 1999: *The massacre of Hama (1982) ... Law application requires accountability.* London: SHRC. Available online at <http://www.shrc.org/english/99reports/18021999.htm>.

Syrian Human Rights Committee (SHRC), 20 February 2001: *Repressive laws in Syria (4): Revolution Protection Law.* <http://www.shrc.org/english/reports/2001/repressive_laws/20.htm> (visited 8 June 2002).

Syrian Human Rights Committee (SHRC), 21 August 2003: *Urgent call. The Syrian Kurdish citizen Khalil Mustafa died under torture.* SHRC: London.

Syrian Ministry of Information: *Inaugural speech of Bashar al-Asad.* <http://www.moi-syria.com/bassad.asp2FileName=20021121210936>.

Syrian Ministry of Information 2002: *Information on the Syrian economy and population* <http://www.moi-syria.com/economy.html> (last updated 22 November 2002), and <http://www.moi-syria.com/information.html>.

*Syria Report* 11, October 2003: »The Ba'th Party keeps the upper hand in the new government,« pp. 2–3.

United Nations, Committee on the Elimination of Racial Discrimination (CERD), 26 October 1998: *Fifteenth periodic report of states parties due in 1998: Syrian Arab Republic* (CERD/C/338/Add.1/Rev.1). <http://www.unhchr.ch/>.

United Nations, International Covenant on Civil and Political Rights (ICCPR), 25 August 2000: *Consideration of reports submitted by states parties under article 40 of the covenant. Second periodic report of states parties due in 1984. Syrian Arab Republic* (CCPR/C/SYR/2000/2). <http://www.hri.ca/fortherecord2001/documentation/tbodies/ccpr-c-syr-2000-2.htm>.

US Department of State, October 2004: *Background note: Syria.* <http://www.state.gov/r/pa/ei/bgn/3580.htm>.

Vanly, Ismet Chériff 1992: »The Kurds in Syria and Lebanon.« In: Philip G. Kreyenbroek & Stefan Sperl (eds.): *The Kurds. A contemporary overview.* London: Routledge, pp. 143–170.

White, Paul 2000: *Primitive rebels or revolutionary modernisers? The Kurdish national movement in Turkey.* London: Zed.

World Bank, Rural Development, Water, and Environment Group, August 2001: *Syrian Arab Republic. Irrigation sector report. Report No. 22602-SYR.* <http.//www-wds.worldbank.org/servlet/>.

World Bank 2003a: *Syrian Arab Republic data profile.* <http://www.worldbank.org/>.

World Bank 2003b: *The Syrian Arab Republic at a glance.* <http://www.worldbank.org/data/>.

Yassin, Selim 2004: »Syria's Hammud: 25 killed in Kurdish unrest. Syrian Kurdish leaders call for calm, dialogue with Assad to resolve their problems after deadly clashes.« *Middle East Online,* 19 March <http://www.middle-east-online.com/english/?id=9317>.

Zisser, Eyal 2001: *Asad's legacy. Syria in transition.* London: Hurst & Co.

## پەیماننامە و یاساکان

١. دەستووری کۆماری عەرەبی سووری، ١٣/ئازاری/ ١٩٧٣ لەم ماڵپەڕانەی لای خوارەوەدا هەیە:
http://www.moi-syria.comor<http://www.oefre.unibe.ch/law/ icl/syooooo.

٢. دەستووری حیزبی بەعسی سۆشیالیستی عەرەبی.

٣. پەیمانی لۆزان، لە ماڵپەڕەکاندا هەیە <http://www.lib.byu.edu،
.</lausanne.html١٨i٩rdh/wwi/i

٤. پەیمانی سیڤەر، ١٩٢٠ لە ماڵپەڕەکاندا هەیە:
.<rdh/wwi/versa/seindex.html /http://www.lib.byu.edu>

٥. جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ ، بە بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ژمارە ٢١٧ A لە ١٠/کانونی یەکەم/ ١٩٤٨ پەسەند و بڵاوکرایەوە و لەم ماڵپەڕەدا هەیە:
.<http://www.unhchr.ch/udhr/lang/eng.htm>

٦. پەیمانی نێودەوڵەتی لەبارەی مافەکانی سیڤیل و سیاسییەوە (ICCPR) لە ١٦/کانونی یەکەم/١٩٦٦ پەسەند کراوە. لە ٢١/نیسان/ ١٩٦٩دا لە لایەن کۆماری عەرەبی سوورییەوە واژۆکراوە و لەسەر ئەم ماڵپەڕە هەیە:
.</b/a_ccpr.htm٣<http://www.unhchr.ch/htm/menu

٧. پەیمانی نێودەوڵەتی لەبارەی مافەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتووری (ICESCR) لە ١٦/کانونی/ ١٩٦٦، ٣ /کانونی دووەم/ ١٩٧٦ پەسەند کراوە. ٢١/نیسان/ ١٩٦٩دا لە لایەن کۆماری عەرەبی سوورییەوە واژۆکراوە و لەسەر ئەم ماڵپەڕە هەیە:
<http://www.unhchr.ch/htm/menu٣/b/a_cescr.htm>.

٨. ڕێکەوتننامەی نێودەوڵەتی لەبارەی لەناوبردنی هەموو جۆرە جیاوازییەکی ڕەگەزپەرستی، ٣١/کانونی یەکەم/ ١٩٦٥، لەسەر لەم ماڵپەڕەدا هەیە:
.<http://www.ohchr.org/ english/law/pdf/cerd.pdf>

٩. ڕێکەوتننامەی مافی منداڵ، ٣٠/تشرینی دووەم/١٩٨٩، لەم ماڵپەڕەدا هەیە: <http://www.unhchr.ch/htm/menu٣/b/k٢crc.htm>.

## پاشکۆی یەکەم
## پابەندبوونی سووریا بە یاسا جیهانییەکانی مافەکانی مرۆڤەوە

سووریا لایەنێکە لە پێکارەکانی نێودەوڵەتی، کە بڕیاری دابینکردن و پاراستنی کەرامەتی مرۆڤ و مافی بنەڕەتی مرۆڤ دەدات. ئەوانە وەك بەشێك بریتییە لەمانەی لای خوارەوە:

- جارنامەی جیهانی مافی مرۆڤ (UDHR) بەپێی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ٢١٧ A (٣) لە ١٠/ کانونی یەکەم/١٩٤٨ داڕێژراوە و بڵاوکراوەتەوە.
- پەیمانی نێودەوڵەتی لەبارەی مافەکانی سیڤیل و سیاسییەوە (ICCPR) لە ١٦/کانونی یەکەم/ ١٩٦٦، بۆ ٢٣/ ئازار/ ١٩٧٦، پەسەند کراوە.
- پەیمانی نێودەوڵەتی لەبارەی مافەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتووری (ICESCR) لە ١٦/کانونی/ ١٩٦٦، ٣ /کانونی دووەم/ ١٩٧٦ پەسەند کراوە.
- ڕێکەوتننامەی نێودەوڵەتی لەبارەی لەناوبردنی هەموو جۆرە جیاوازییەکی ڕەگەزپەرستی، ٣١/کانونی یەکەم/ ١٩٦٥، بۆ ٢١/مایس/ ١٩٦٩، پەسەند کرا.
- ڕێکەوتننامەی نێودەوڵەتی لەبارەی کوژانەوە و سزادانی تاوانی جیاوازی ڕەگەزپەرستی، لە ٣٠/تشرینی دووەم/١٩٧٣.
- ڕێکەوتننامەی نێودەوڵەتی دژی جیاوازی ڕەگەزایەتی لە یارییە وەرزشییەکاندا، لە کانونی یەکەمی/ ١٩٨٥.
- ڕێکەوتننامەی قەدەغەکردن و سزادانی تاوانی قەڵاچۆی بەکۆمەڵ، ٩/کانونی یەکەم/١٩٤٩.
- ڕێکەوتننامەی مافی منداڵ، ٣٠/تشرینی دووەم/١٩٨٩، لە ئەیلولی/١٩٩٠دا واژۆ کراو لە ١٤/نیسان/١٩٩٣دا پەسەند کرا.

- پرۆتۆکۆڵی ئارەزوومەندانە بۆ پەیماننامەی مافەکانی منداڵ لەبارەی تێکەڵاوبوونی منداڵان لە کێشەی چەکداریدا. لە ١٧/تشرینی دووەم/٢٠٠٣ پەسەند کراوە.
- پرۆتۆکۆڵی ئارەزوومەندانە بۆ ڕێکەوتن لەبارەی مافەکانی منداڵ، لەبارەی فرۆشتنی منداڵان و لەشفرۆشی و ئەدەب و وێنەی بێ ئابڕوانە(پۆرنۆگرافی)، ١٥/حوزەیرانی/٢٠٠٣ پەسەند کراوە.
- ڕێکەوتننامەی کۆیلایەتی ٢٥/ئەیلول/١٩٢٦. پرۆتۆکۆلی ١٩٥٣ دادەنری بە ڕێکەوتنی ١٩٢٦.
- ڕێکەوتننامەی کۆیلایەتی ١٩٢٦، وەك دانرا. لە ٤/ئاب/١٩٥٤ واژۆکرا.
- ڕێکەوتننامەی زیادە لەبارەی لابردنی کۆیلایەتی، بازرگانی کۆیلەکان و ڕێکخراو و دەزگاکانی هاوشێوە بۆ کۆیلایەتی لە ٧/ئەیلول/١٩٥٦، لە ١٧/نیسان/١٩٥٨ پەسەندکرا.
- چوار ڕێکەوتننامەی جنێف لە ١٩٤٩ و جێبەجێکردنی یەکەم پرۆتۆکۆڵ ١٩٧٧.

## دەزگا و ڕێکەوتننامە پەیوەندارەکانی تر

دەستووری عەرەبیی مافی مرۆڤ، ١٩٤٩، کۆمەڵەی وڵاتە عەرەبییەکان، کە سووریا ئەندامێتی.

ڕێکخراوی کۆنفرانسی ئیسلامی، کە قاهیرە لەبارەی مافی مرۆڤەوە لە ئیسلامدا لە ١٩٩٠ دایمەزراند و بلاویکردەوە . لەگەڵ ئەوەی کە بە ڕەسمی پەیوەندی بەو حکومەتانەوە نییە کە وابەستەی سیاسەتە بۆ دڵنییایی و ڕێزگرتنی مافی مرۆڤ و سەربەستی رادەربڕین.

دامەزراندنی جارنامەی بەرشەلۆنە لە ٢٦-٢٧/ تشرینی دووەم/١٩٩٥ بە ١٥ وڵات لە یەکێتی ئەورووپا و ١٢ وڵاتی باشووری دەریای سپی ناوەڕاست، لەگەڵ

سووریاش ، بە هاوبەشی ئەورووپا - دەریای سپی ناوەڕاست دامەزرا. یەکەم: پێکەوەکاری بۆ چاکترکردنی پەیوەندی کولتووری و سیاسی و ئابووری نێوان ئەندامانی، هەروەها بانگی وابەستەیی ڕێزی مافەکانی مرۆڤ وسەربەستییە بنەڕەتییەکان دەکات .

جارنامەی سەنعا لەبارەی گەشەپێدانی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی عەرەبی سەربەخۆوە و فرەیی، لە ١١/کانونی دووەم/١٩٩٦، لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ زانست و پەروەردە و ڕۆشنبیری و لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ زانست و پەروەردە و ڕۆشنبیری کۆنفرانسێکی گشتی لە تشرینی دووەمی ١٩٩٧ ڕاگەنرا. سووریاش لە کۆنفرانسەکاندا دانی نا بە پرینسیپ و ئامۆژگارییە بڵاوکراوەکاندا.

## پاشکۆی دووەم
## حیزبە سیاسییە کوردییەکان لە سووریا

ئێستا لە سووریا ١٣ حیزبی سیاسی کوردی هەیە، هەموویان بە شێوەیەی نهێنی کاردەکەن. ناوی لایەنەکان بە کوردی و عەرەبی ولە نێو کەوانەشدا بە ئینگلیزی نووسراوە و سەرۆکەکانیشیان وەك ئەمانەی لای خوارەوە:

١. پارتییە یەکێتییە دیموکراتە کوردی لە سووریا – حزب الاتحاد الدیمقراطی الکوردی فی سوریا. سەرۆك: ئیسماعیل ئەمۆ.
٢. پارتییە دیمۆکراتە کوردی لە سووریا(الحزبی) الحزب الدیمقراطی الکوردی فی سوریا (البارتیە)، سەرۆك: نصرالدین ابراهیم.
٣. پارتییە دیمۆکراتە پێشڤەروە کوردی لە سووریا، الحزب التقدمی الدیمقراطی کوردی فی سوریا، سەرۆك: عەبدولحامد حاجی دەرویش.
٤. پارتییە چەپە کوردی لە سووریا (حزب الیسار الکوردی فی سوریا)، سەرۆك: محەمەد موسی محەمەد.
٥. پارتییە دیمۆکراتە کوردی لە سووریا، الحزب الدیمقراطی الکوردی فی سوریا، سەرۆك: محەمەد نەزیر مستەفا.

